**به ناوی گەورە ناوی دڵۆڤان**

کتێبخانەی کوردی ئەوین ئامادەی گرتنی هەر چەشنە پێشنیار و گلەیی و یارمەتی لە لایەن لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بە تایبەت شاعیران و نووسەرانی خۆشەویست بۆ گەشە پێدانی فەرهەنگ و کوولتوری نەتەوایەتی و بردنەسەرەوەی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی هەیە و سپاسی هەموو ئەو کەسانەی دەکەین کە بە ناردنی پێشنیار و گلەیی لە خزمەت کردن و گەشەپێدانی زووان و فەهەنگی نەتەوایەتی یارمەتیمان ئەدەن و سەری ڕێز و حورمەتیان بۆ دادەنەوێنین ئەمڕۆکە بەختەوەرانە بە هۆی پێشکەوتنی عیلم و زانست ئەو هەلە ڕەخساوە کە بتوانین بە باشترین شێوە ئەرکی بڵاو کردنەوە بە ڕێوە بەرین
بۆیە داواکارین لەو کەسانەی لایەنگری ڕۆشنبیری گەلەکەمانن،هەر بەرهەمێکیان لە بەر دەستایە بۆمانی بەڕێ کەن تا بەڵکو بە یارمەتی خوای گەورە و لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بڵاوی بکەینەوە و کتێبخانەی کوردی ئەوینی پێ دەوڵەمەندتر کەین
بۆ پێوەندی و سەردان لە بیرۆکەی(وێبلاگ)کتێبخانەی کوردی ئەوین و هەر وەها ناردنی هەر چەشنە بیر و ڕاێک یا ناردنی پێشنیار و گلەیی دەتوانن بە ناونیشانی ژێرەوە سەردانمان لێ بکەن

**www.evinebook.blogfa.com**

هەر وەها دەتوانن کتێب یا هەر بابەتێکی بە کەڵکێ ترتان هەیە بە ئیمەیلی ژێرەوە بۆمانی بەڕێ کەن هەتاکوو لە سەر تۆڕی ئینتڕنت بڵاوی کەینەوە و هەمووان کەڵکی لێ وەر گرن

**evinebook@gmail.com**

بە سپاسەوە بەڕێوەبەرانی کتێبخانەی کوردی ئەوین

# چەردەیەکی کۆمەڵایەتییانە
# لە
# مێژووی نوێی عیراق

## بەرگی یەکەم

لەسەرەتای سەردەمی عوسمانی، تاناوەراستی سەدەی نۆزدەیەم

**دکتۆر عەلی وەردی**

ماموستای کۆمەڵزانی/ زانکۆی بەغدا

**وەرگێڕانی: دلێر میرزا**

**حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**وەزارەتی رۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان**

www.roshnbiri.org

khanaywargeran@yahoo.com



- ناوی کتێب: چەردەیەکی کۆمەڵایەتییانە لەمێژووی نوێی عیراق
- ناوی نووسەر: عەلی وەردی
- وەرگێرانی لە عەرەبییەوە: دلێر میرزا
- بابەت: سیاسی
- نەخشەسازی کۆمپیوتەر: نازەنین ساڵح
- نەخشەسازی بەرگ: سۆران عەبدوڵا
- زنجیرە: 74
- تیراژ: 1500
- ژمارەی(619)ی وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی پێدراوە.
- چاپ: چاپخانەی تیشك

## پێشەکیی کتێبەکە

کاتێ کۆمەڵگەی عیراقم تاوتوێ دەکرد-کەماوەیەکی زۆرە خولیای ئەم بابەتەم- بۆم دەرکەوت، ئەگەر لەو ڕووداوانە تێنەگەم کە لەسەردەمەکانی ڕابردوودا بەسەر عیراقدا هاتوون، ناتوانم لەبارودۆخی ئێستای ئەم کۆمەڵگەیە تێبگەم. دیارە هەر یەکێك لەو ڕووداوانە، کەم تازۆر کاریگەریی لەسەر ڕەفتارو بیرکردنەوەی خەڵکی لەئێستادا هەیە.

دەکرێ لەم ڕووەوە، کۆمەڵگە وەکو کەسایەتیی مرۆڤێکی باڵق لێکبدەینەوە، کەئێستا دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو شتانەی لەڕابردوودا بەسەریدا هاتوون، و ڕەنگە ئەم کاریگەرییە نائاگا و لەهەستەوە نەبێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت بوونی هەیە، و ڕەنگە بەشێوەی گرێی دەروونی سەرهەڵبدات کە مرۆڤ هان دەدات هەندێ کاری پڕوپووچ ئەنجام بدات، کەبەناچارییەوە ، لەژێر کاریگەریی هاندەرێکی خۆنەویستدا، ئەنجامیان دەدات کەدەکەوێتە ژێر ڕکێفیەوە. خەریکە بەو بڕوایە دەگەم کەکۆمەڵگە لەم ڕووەوە، جیاوازیی لەگەڵ تاکدا نییە، گەلێ جار ڕووداوەکانی ڕابردوو لەکۆمەڵگەدا، گرێیەکی وەکو گرێی دەروونی دەخوڵقێنن، کەدەبینین خەڵکی خۆنەویستانە دەکەونە ژێر کاریگەریی هەندێ داب و نەریت و بیروبۆچوونی کۆنەوە، و ڕەنگە تووشی گێژەڵیان بکات، لەکاتێکدا خۆیان وادەزانن کارێکی باش ئەنجام دەدەن. لەم کتێبەدا چەندین نموونەی ڕاستی، لەم جۆرە دەبینین.



لەم کتێبەدا تەنیا ڕووداوە مێژووییەکان، لەسەرەتای سەردەمی عوسمانییەوە تاوتوێ دەکەم، و حەزم دەکرد پێشتریش تاوتوێ بکەم، چونکە لەڕاستیدا، سەردەمە مێژووییەکان تێهەڵکێش و پێکەوە گرێدراون، و بەئاسانی ناتوانین لەسەردەمێکیان تێبگەین، ئەگەر سەردەمی پێشتری تاوتوێ نەکەین، بەڵام بۆم دەرکەوت کەئەوە لەڕووی زانستییەوە، کارێکی نیمچە مەحاڵە، چونکە وامان لێدەکات هەنگاو بەهەنگاو، دوای ڕووداوەکانی ڕابردوو بکەوین، تاوەکو دەمانباتەوە سەر باوکە ئادەم...

ڕەنگە تاوتوێ کردنی سەردەمی عوسمانی، لەهەموو تاوتوێ کردنێکی دیکە، زیاتر پەیوەندیی بەواقیعی کۆمەڵگەی ئەمڕۆمانەوە هەبێت. ئێمە هێشتا لەکلتوورە کۆمەڵایەتییەکەیدا دەژین، و هێشتا زۆربەمان، هەر بەرەوشی ئەو سەردەمە بیردەکەینەوە، و هەر لەمنداڵییەوە دەمبینی چەندین کەس خولیای بوون و باڵیدا هەڵیان دەداو ئارەزووی ئەوەیان دەکرد ئەو سەردەمەیان بۆ بگەڕێتەوە.

## کۆمەڵزانیو مێژوو:

لەکتێبی پێشوومدا*، هەوڵم دا بارودۆخی گشتیی عیراق لەرووی کۆمەڵایەتییەوە تاوتویێ بکەم، و ئێستا هەوڵ دەدەم ئەو رووداوە مێژووییانە تاوتویێ بکەم کە لەو سەردەمەدا روویان داوە. و پێویست ناکات بڵێم ئەم دوو نیارە پەیوەندییەکی هێندە بتەویان پێکەوە هەیە، ناکرێ لەیەکدییان جیا بکەینەوە، بۆیە خوێنەر، هەروەکو چۆن لەکتێبی پێشوودا، گەلێ سەرگوزەشتەی مێژوویی بینی، لەم کتێبەدا شیکاریی کۆمەڵایەتی زۆر دەبینێت.

بەهەر حاڵ، ئەم کتێبە لەکتێبی مێژوو دەچێت، بەڵام جیاوازیی لەگەڵ کتێبە مێژووییە باوەکاندا ئەوەیە، وەکو مێژوونووسان، لەبەر خودی رووداوەکانی رابردوو بایەخیان پێنادات، بەڵکو بەپلەی یەکەم بایەخ بەو دەلالەتە فیکریو کۆمەڵایەتییانە دەدات کە لەتوێی رووداوەکاندان، لەکاتێکدا بەرودوی مێژوویی لەپلەی دووەمدا هاتووە.

من مێژوونووس نیم، بەڵکو لەنووسینەکانمدا، پشت بەمێژوونووسان دەبەستم، و لەوەدا گەلێ ماندوو بووم، چونکە مێژووی عیراق لەسەردەمی عوسمانیدا، هێشتا لەهەندێ لایەنیدا، تەمومژاوییەو پێویستە لەسەر توێژەر، بەدوای سەرچاوەی زۆردا بگەڕێت، تاوەکو رووداوێك پەیدا بکات، بەڵگەی کۆمەڵایەتیو فیکریی خۆی هەبێت.

---

* کتێبەکە لەژێر ناوی(دراسة في طبيعة المجتمع العراقي)–بغداد/1965)دا، توێژینەوەیەك لەسەر کۆمەڵگەی عیراق بوو.



لەم بوارەدا، کێشەیەکی دیکەیش رووبەروومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەمێژووی عیراق، لەگەڵ مێژووی وڵاتانی دراوسێدا تێهەڵکێشە، و ئەمەیش پێویستی بەوە هەیە، جگە لە مێژووی تایبەتی عیراق، ئەو مێژووانەیش تاوتویێ بکرێن. هەندێ جار خوێنەر تێبینی ئەوە دەکات، لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ئێرانو تورکیا، دواتر لەنەجدو میسرو وڵاتی شامدا، درێژدادڕی دەکەم، و بۆتێگەیشتن لەرووداوەکانی عیراق، من ئەمە بەپێویست دەزانم. و رەنگە ئەوەیش راست بێت، کەزۆربەی رووداوەکانی عیراق، تەنیا دەنگدانەوەی رووداوەکانی وڵاتانی دراوسێ بووبێت.

## کێشەی بابەتی:

دەکرێ سەبارەت بەخۆم، ئەم کتێبە بە(کتێبی تەمەن) ناوبنێم، لەهەر کتێبێکی پێشتر، هەوڵو کاتێکی زۆرترم بۆتەرخان کردو کردم بەچەند بەرگێکەوە. تائێستا چواریانم تەواو کردووە، هیوادارم بتوانم درێژە بەباسو خواس لەسەر مێژووی نوێی عیراق بدەم، تادەگەمە ئەم سەردەمەی خۆمانی تیادا دەژین، و هیوادارم خودا لەوەدا، یارمەتیم بدات!

پێویستە لەم پێشەکییە گشتییەدا، ئاماژە بەگرفتێك بکەم، کەهەردەم لەکتێبە پێشووەکانمدا، بەدەستییەوە دەمناڵاند، ئەویش گرفتی بابەتمەندیو بێلایەنییە لەتوێژینەوەدا. و لەهەندێ لەبەشەکانی ئەم کتێبەدا، دەگەینە سەر چەند نیارێك کە بەلای زۆربەی عیراقییەکانەوە گەلێ هەستیارە، و ئەوانە راهاتوون لەسەر ئەوەی، چۆن تەماشای قووچەك(کەچەند روویەکی هەیە) دەکەن، ئاوایش تەماشای رووداوەکانی مێژوو بکەن، هەر تاقمەو چەق لەسەر روویەکی دەبەستێتو رووەکانی دیکەی پشت گوێ دەخات.

کاتێ تەماشای شەڕە ژن، لەیەکێك لەکۆڵانە کۆنەکانی بەغدادا دەکەین، دەتوانین لەسروشتی ئەو تێڕوانینە(لاوەکییە) تێبگەین، کە زۆربەمان لەسەری راهاتووین، شەڕەکە یەکەم جار بەشەڕی نێوان دوو منداڵ دەست پێدەکات، یەکدی ئازار دەدەن، ئەوسا دایکەکانیان بەهاتوهاوار دێنە دەرەوە،و لەمەزەندە کردنی ئەو ئازارەی بەر کوڕەکانیان کەوتووە، زێدەرەوی دەکەن لەکاتێکدا، دایك ئەوە فەرامۆش دەکات، منداڵەکەی چەندە ئازاری بەوی دیکە گەیاندووە، دایکەکەی دیکەیش هەمان کار دەکات، بەم جۆرە وردە وردە شەڕەکە گەورە دەبێتەوە، تەشەنە دەکات بۆباوکەکان‌و کەسوکارەکانیان. رۆژ دوای رۆژ، رەنگە ئەو شەڕە گەورەتر ببێت، دەبێت بەکلتوورێکی خێزانیی پڕ لەکینە‌و تۆڵەسەندنەوە. و ئەگەر کەسێ لەیەکێك لەو دوو خێزانە گوێ بگرێت، کاتێ باس لەشەڕەکە دەکات، ئەوا جیاوازییەکی زۆر دەبینێت لەگەڵ گێڕانەوەی خێزانەکەی دیکەدا، هەر خێزانەو، بەجۆرێ رووداوەکان وێنا دەکات کە لەگەڵ خۆیدا بگونجێت،و لایەنەکانی دیکە فەرامۆش دەکات.

رەنگە زێدەرەوییم نەکردبێت ئەگەر بڵێم، زۆربەی کێشە مەزهەبی‌و سیاسی‌و تیرەگەرییەکان کەمێژووەکەمان شانازییان پێوە دەکات، لەبنچینە کۆمەڵایەتییەکەیاندا، جیاوازییان لەگەڵ ئەو شەڕە ژنەدا نەبێت، کەباسمان کرد. و هەر ئەمەیش وایکردووە کەئەرکی توێژەری بێ لایەن– یان ئەوەی دەیەوێت بێ لایەن بێت– گەلێ قورس بێت، چونکە لەلایەن هەموانەوە، بەچاوێکی قێزەونەوە تەماشا دەکرێت. ئەو دەیەوێت راستیی بابەتیی هەر تاقمێك پەیدا بکات، لەکاتێکدا هەر تاقمەو دەیەوێت، توێژەر لایەنی ئەو بگرێت.



## خەواندنی کۆمەڵایەتی:

خوێنەر ئەو گومانەی لادروست نابێت کەعیراقییەکان، لەم رووەوە جیاوازییان لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا هەبێت، لەراستیدا تێڕوانینی(لاوەکی) ماکێکی گشتیی مرۆڤە، بەڵام بەپێی جیاوازیی بارودۆخ–لەتاکەکان‌و لەکۆمەڵەکاندا– هەڵکشان‌و داکشانی هەیە.

مرۆڤ لەژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیدا، دەکەوێتە ژێر رکێفی خەواندنێکەوە، لەهەندێ رووەوە لێکچووی هیپنۆپتیزمە، کەدەتوانین بە(خەواندنی کۆمەڵایەتی) ناوی ببەین. کۆمەڵگە هەر لەمنداڵییەوە ، لەهەموو کاروبارە بیروباوەڕییەکان‌و بەهاکان‌و چەمکە کۆمەڵایەتییەکاندا، سرووشێکی چەند بارە بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنێت‌و بەمەیش بیرکردنەوەی مرۆڤ دەخاتە ناو چەند قاڵبێکی دیاریکراوەوە، کەناتوانێت لێیان دەرباز ببێت. و هەر ئەمەیە کە وا لەومرۆڤە دەکات، کە لەژینگەیەکی دیاریکراودا پەروەردە دەبێت، بیری بەبیروباوەڕی ئایینی‌و هەڵوێستی سیاسی‌و ئاراستە سۆزدارییەکان زاخاو بدرێت، کە لەو ژینگەیەدایە، ئەو وادەزانێت بەویست‌و خواستی خۆی ئەو بڕواو بیروبۆچوونانەی هەڵگرتووە،و ئەوە نازانێت کە لەراستیدا دەستکردی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیەتی،و ئەگەر لەژینگەیەکی دیکەدا نەشونمای بکردایە، ئەوا بیروبۆچوونەکانی جۆرێکی دیکە دەبوون.

توێژینەوە دەروونییە نوێکان، کە لەبواری هیپنۆتیزمدا ئەنجام دراون، ئەوەیان سەلماندووە کەرەنگە مرۆڤ هێندە بکەوێتە ژێر کاریگەریی خەواندنەوە، بەرادەیەك کە شتێك نەبوو ببینێت و دەنگێك نەبوو ببیستێت، ئەو لەکاتی خەواندندا، رەنگە سپی بەرەش، و رەش بەسپی بخوێنێتەوە، و ئەگەر شووشەیەك لەلووتی نزیك بکەیتەوە، بۆنێکی پیسی لێوە بێت، و پێی رابگەیەنرێت کە ئەو بۆنە بۆنێکی خۆشە، ئەوا ئاسوودەیی لەسیمایدا دەردەکەوێت، وەکو بڵێی بەراستی بۆنێکی خۆش دەکات.[2]

هیپنۆتیزم جگە لەوەی سرووشێکی چەند بارەیەو خۆی بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنێت، شتێکی دیکە نییە، کە جار لەدوای جار پێی دەگوترێت، کەشتێکی دیاریکراو دەبینێت، و وردە وردە ئەو وێنەیە لەمێشکیدا تۆمار دەبێت، تاوای لێدێت، وەکو بڵێی بەچاو دەیبینێت، یان دەستی بەری دەکەوێت. ئەوەیش راستە کەبڵێم خەواندنی کۆمەڵایەتی ئەو کارە لەزۆر کەسدا ئەنجام دەدات، بەجۆرێ کەوایان لێدەکات سپی بەرەش، و رەش بەسپی بخوێننەوە، و بڕوای تەواویان بەلاوە دروست دەبێت، کەگومان لەراستیی ئەو شتەدا نییە کەدەیبینن.

[2] لەمەڕ بابەتی هیپنۆتیزمو خەواندنی کۆمەڵایەتی، بڕوانە کتێبی(الأحلام بين العلم والعقيدة)ی نووسەر–بەغدا 1959.



## جوغزی نوێ:

ئەو کەسەی بەدرێژایی ژیانی خۆی لەژینگەیەکی داخراودا بژی– وەکو تیرەو گوندە دابڕاوەکان– ئەوا بەگەورەیی، بەبەردەوامی لەژێر رکێفی خەواندنی کۆمەڵایەتیدا دەبێت، و نیارەکان بەو جۆرە دەبینێت کە لەکۆمەڵگە بەرتەنگەکەیەوە وەریدەگرێت، و تائەو کاتەی دەمرێت، هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە. بەڵام ئەوەی لەژینگەیەکی کراوەدا بژی، کاتێ کە گەورە دەبێت، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی سرووشی کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆرەوە، و بەمەیش لەو جوغزە فیکرییەی خۆی کەتیایدا، لەژینگە سەرەتاییەکەیدا نەش و نمای کردبوو دەردەچێت، و پێ دەنێتە ناو جیهانێکی نوێوە، کەجۆرەها بیرو بۆچوون و ململانێی بیرو تاقمی جۆراوجۆری تێدایە. زۆربەی تاکەکان لەم جۆرە حاڵەتانەدا، کە لەجوغزی بیرە کۆنەکانیان دەردەچن، رەنگە بچنە ناو جوغزێکی نوێوە، کەتیشکەکەی بەلای خۆیدا رایاندەکێشێت.

بەشێوەیەکی گشتی، مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی حەز بەئارامی و ئاسوودەیی لەناو جوغزێکدا دەکات، وەکو هێلکە شەیتانۆکە بیپارێزێت، بۆیە کاتێ لەجوغزە کۆنەکەیدا دەردەچێت، حەز دەکات بچێتە ناو جوغزێکی نوێوە. کت و مت ئەم حاڵەتە لەکۆمەڵگەکەمان، لەم سەردەمە لەسەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە رووی دا، هەروەکو لەبەشی داهاتووی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین.

ئەم قۆناغەی ئێستا بە(ئازایەتیی دەستە جەمعی) ناو دەبرێت، و ئەم ئازایەتییە وەکو هەر شتێکی دیکە لەبووندا، باشەو خراپەی خۆی هەیە،

لەلایەکەوە جەماوەر دەوروژێنێتو رۆحی فیداکاریو قوربانیدانیان تیادا دەچێنێت، بەڵام لەلایەکی دیکەوە، تێڕوانینی بابەتییان لێدەگرێتو ئەرکی توێژەری بێ لایەن لەنێوانیاندا دژوار دەکات.

راستیان گوتووە کە:(ئازایەتیی جەماوەر سووتەمەنیی مێژووە)، ئەوە ئازایەتییە کە گەلان دەبزوێنێت، و دەکرێ بڵێین گەلی ساردو سڕ کەبۆ کێشە گشتییەکانی خۆی نابزوێت، رەنگە ببێتە پاروو بۆ هەر داگیرکەرێکی تەماحکار یان چەوسێنەرێکی ستەمکار. بەڵام ئەوەی دەخوازم لەم بوارەدا، سەرنجی بۆرابکێشم ئەوەیە، کە ئازایەتیی بەتەنیا، بەشی سەرکەوتنی گەلان لەبواری ژیانی نوێدا ناکات، بەڵکو پێویستە لەلایەنەکەی دیکەوە، وردبینیو بابەتمەندیی هاورەوتی ببێت.

دەکرێ کۆمەڵگەی سەرکەوتوو، لەم سەردەمەدا، بەو سوپایە بشوبهێنین کەدەچێتە شەڕێکی قورسەوە، کەپێویستە هۆشیاریی سەرکردایەتی، لەگەڵ ئازایەتیی سەربازەکاندا هاوشان بێت، سوپا ناتوانێت لەشەڕەکەدا سەرکەوتن دەستەبەر بکات، ئەگەر هاتو سەربازەکان لەشەڕ کردندا ئازایەتی نەنوێنن، و هەروەها ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، ئەگەر هاتو ئازایەتی زاڵ بوو بەسەر هۆشیاریی سەرکردایەتیدا. سەرکردەی ئازا رەنگە سەربازەکانی بەرەو شکان ببات، لەکاتێکدا وابزانێت بەرەو سەرکەوتنیان دەبات.

ئێمە-لەم قۆناغە قەیراناوییە لەمێژوومانداـ پێویستییەکی یەکجار زۆرمان بەهاوشانی هەیە، لەنێوان ئازایەتیو پاڵنەری بابەتی لەخۆماندا، ئەوە باش نییە کەبەبەردەوامی ئازایەتی زاڵ بێت بەسەر بیرماندا، هەروەها ئەوەیش باش نییە ئازایەتیمان تیادا نەبێت!



## پێشەکیی بەشی یەکەم

ئەم بەشە لەکتێبەکە، ماوەیەکی تارادەیەك درێژ، لەسەرەتای سەردەمی عوسمانییەوە، تا نزیکەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم لەخۆ دەگرێت، واتە گەورەترین بەش لەو سەردەمە دەگرێتەوە، کەعوسمانییەکان تیایدا حوکمی عیراقیان دەکرد، و گرنگترین تایبەتمەندیی کۆمەڵگەی عیراق لەو سەردەمەدا، دوو نیار بوو: یەکەمیان ململانێی تورکیا وئێران لەسەر عیراق، و ئەو کێشە مەزهەبییە توندەی نێوان شیعەو سوننە، و دووەم زاڵ بوونی تەوژمی سارانشینی بەسەر عیراقدا، تاخەڵکی وای لێهات هەروەکو بڵێی گەڕاونەتەوە بۆ نەریتەکانی سەردەمی جاهیلی. بەرای من، ئەم  دوو نیارە ئەو چەقە پێکدەهێنن کەژیانی کۆمەڵایەتی، لەعیراقدا بەدەوریدا دەخولایەوە، و تائێستایش هەندێ لەکاریگەریی ماوە. لەم پێشەکییەدا، هەوڵ دەدەم ئەم بابەتە تاوتوێ بکەمو بەپێی توانا، هەندێ لایەنی دەروونیو کۆمەڵایەتی لێوە هەڵبقۆزم، تالەکاتی خوێندنەوەی بەشەکانی دواتردا، خوێنەر چاو روونیی لەسەر هەبێت.

## ئێرانییەکان و مەزهەبی شیعە :

وام پێ باشە، بەر لەوەی دەست بەبابەتەکە بکەم، ئاماژە بەهەڵەیەکی باو بکەم، کەهێشتا گەلێ کەس بەراستی دەزانن، ئەویش ئەوەیە کە ئێران زێدی بنەڕەتیی سەرهەڵدانی مەزهەبی شیعەیە، هەر لەسەرەتاوە، و گوایە ئەم مەزهەبە، لەئێرانەوە بۆعیراق هاتووە.

توێژینەوە مێژووییە نوێکان، ڕێك ئاماژە بۆپێچەوانەکەی دەکەن، چونکە سەلمێنراوە کەعیراق سەرچاوەی شیعەیە، و شیعە لەوێوە، بۆئێران و بۆوڵاتانی ئیسلامیی دیکە گوازراوەتەوە، و ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، کەخەریکە ئێستا توێژەران لەسەری کۆکبن، کەزۆربەی ئێرانییەکان سوننی بوون، و تاسەرەتای سەدەی دەیەمی کۆچی –واتە سەدەی شانزەیەمی زایینی– نەچووبوونە سەر مەزهەبی شیعە، مەگەر لەو سەدەیەوە نەبێت، بەهۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لەوێدا.

نکۆڵی لەوە ناکرێت کەئێران بەر لەپەیدابوونی دەوڵەتی سەفەوی، ژمارەیەکی زۆر لەشیعەی تیادا بوو، بەڵام ئەوان لەچەند شارێکی دیاریکراوی وەکو قوم و نەیشاپووردا بوون، بەڵام شارەکانی دیکەی ئێران، نەخوازەڵا شارە گەورەکانی وەکو ئەسفەهان و شیرازو خۆراسان و تەبرێز، دانیشتوانی –هەموویان یان زۆربەیان– سوننی بوون.



لەم بارەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەئێرانییەکان کەسوننی بوون بەوە ناویان دەرکردبوو، کەزۆربەی زانا سوننییەکان لەوان بوون، تائەوەی ئەو ناوبانگە گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەبۆپشتگیریی لەو ڕاستییە بەم دواییە، ئەم حەدیسە دەدەنە پاڵ پێغەمبەر کە:( لو تعلّق العلم بأكناف السماء لناله قوم من أهل فارس). و ئیبن خەلدوون بەشێك لەموقەدیمەکەی، لەبەر ڕۆشنایی تیۆرییە گشتییەکەی، سەبارەت بەخێڵەکایەتی و شارستانی بۆئەو مەبەستە تەرخان کرد.[3]

تیۆرەکەی ئیبن خەلدوون، لەم بارەوە، چ ڕاست بێت یان نەء، بەرواڵەت کۆمەڵگەی ئێران خولیای گەڕان بەدوای زانستدا بوون، و بەشێوەیەك لەشێوەکان سەرقاڵی بوون، و کاریگەریی ئەوەمان بینی، کاتێ ئێرانییەکان بوون بەشیعە، تاوای لێهات، زۆربەی زانایانی شیعە لەوان بوون. ئەوەی زانراوە لەدەوڵەتی سەفەوی، ئەوەیە کەهەوڵی بەشیعە کردنی ئێرانییەکانیان دەدا، سەرەتا پەنایان بەزانا عەرەبەکان برد، و ژمارەیەکیان لەجەبەل عامیل و بەحرێنەوە هێنا،[4] و ماوەیەکی زۆری بەسەردا ڕەت نەبووبوو، کەزانایان لەنێوان خودی ئێرانییەکاندا پەیدا بوون، و لەنێوانیاندا زانای ناوداری واهەڵکەوت، کە لەبەرهەمە هزرییەکانیاندا،

---

[3] ئیبن خەلدوون(مقدمة ابن خلدون) – لێکۆڵینەوەی عەلی عەبدولواحید وافی – قاهیرە 1962– ب4، ل1247–1250.

4-Edward Browne(A. Literary History of Persia)-Cambridge 1953-vol 1V p.360.

هیچیان لەزانا پێشینەکان کەمتر نەبوو، بەڵام جیاوازییان لەگەڵ کۆنەکاندا ئەوە بوو، کەئەمان شیعەو کۆنەکان سوننی بوون.

ئەسفەهان لەسەردەمی سەفەوییەکاندا، پایتەختی دەوڵەت و نێوەندی زانستی شیعە بوو. ودوا بەدوای هەرەسهێنانی دەوڵەتی سەفەوی و بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لەئێراندا، نێوەندی زانست گوازرایەوە بۆ کەربەلا، و تاکۆتایی سەدەی هەژدەیەم لەوێدا مایەوە، و لەو کاتەوە، نێوەندەکە تادەهات بەرەو نەجەف دەچوو، و تائەم سەردەمەیش هەر لەوێدا ماوەتەوە، و وادیارە بۆهەمیشە لەوێدا نیشتەجێ بووەو هەر لەوێدا دەمێنێتەوە.

ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت پێی بگەین ئەوەیە کەئێران دوای ئەوەی بوو بەشیعە، ئیتر کاریگەریی زۆری لەسەر کۆمەڵگەی عیراق پەیدا کرد، وردە وردە نزیکبوونەوەی نێوان ئێرانییەکان و شیعەی عیراق گەشەی کرد، و کاروانی ئێرانییەکان ، لەپێناوی سەردانی مەزارە پیرۆزەکان، یان بەدوای زانست، یان بەخاك سپاردنی مردووەکان و شتی دیکە، بەرودو بەرەو عیراق دەهاتن.

لەئاکامی ئەمەدا، لەعیراق دۆخێکی کۆمەڵایەتیی بێ وێنە دروست بوو، ئەویش ئەوە بوو کەئەو شیعانەی زۆرینەی دانیشتوانی عیراق پێکدەهێنن عەرەبن، لەکاتێکدا زاناکانیان ئێرانین.

تەلەبە ئێرانییەکان دێن بۆعیراق، بەمەبەستی وەرگرتنی وانەی ئایینی، لەقوتابخانەکانی نەجەف و کەربەلادا، هەیانە دەگەڕێتەوە



بۆنیشتمانەکەی، دوای تەواو کردنی خوێندن، و هەیانە لەعیراقدا دەمێنێتەوە. ئاساییە ئەوانەی کەدەمێننەوە، پەیوەندیی بەردەوامیان بەنیشتمانی یەکەمیانەوە دەمێنێت، ئەگەر لەئێراندا، هەر ململانێیەکی ئایینی یان سیاسی رووبدات، لەرێگەیانەوە بەخێرایی کاریگەرییەکەی دەگاتە عیراق، ، چونکە ئەو مشتومڕەی کەروو دەدات لەنێوان پیاوانی ئایینی لەئێراندا، هەردەبێ بەشێوەیەك لەشێوەکان پێیان بگات، ئەوانیش بەنۆرەی خۆیان مشتومڕ لەنێوان خۆیاندا دەکەن، و گەلێ جار ئەو مشتومڕە، بۆناو خەڵکی تەشەنە دەکات، و رەنگە ببیتە هۆی گەورەبوونی دوژمنایەتی و جنێو بەیەکدان. هەر ئەمە رووی دا، لەکێشەی(تەنباك) لەساڵی 1890دا، و کێشەی مەشروتیەت کە لەساڵی 1906دا رووی دا، و چەندین کێشەی دیکە، کە لەم بەشە یان لەبەشەکانی دیکەدا، باسیان دەکەین.

ئەم دۆخە هێندە گرنگ نەدەبوو، ئەگەر وا رێکبکەوتایە کە عیراق بەبەشێك لەدەوڵەتی ئێران ببێت، بەڵام چارەنووسی عیراق وابوو کە ببێتە بەشێك لەدەوڵەتی عوسمانی، هەر بۆیە کۆمەڵگەی عیراق بەش بەش بوو، و نەدەزانرا بەرەو کوێ دەڕوات، حکومەتەکەی بەتورکیاوە بەسترابوو، فرمانەکانی لەوەوە وەردەگرت، لەکاتێکدا زۆربەی گەلەکەی بەئێرانەوە بەسترابوونەوە.

## گەورەبوونی ململانێی مەزهەبی:

دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی حەوتەمی کۆچییەوە، لەتورکیادا پەیدا بوو، بەڵام بۆ یەکەم جار بەرەو رۆژئاوا بەرەو ئەوروپا تەشەنەی کرد، و رووی لەرۆژهەڵات، واتە لەعیراق و وڵاتانی دیکەی عەرەب نەکرد، مەگەر دوای پەیدا بوونی دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا. هەر لەو کاتەوە، عیراق بوو بەنیاری ناکۆکییەکی توند لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانیدا، و بۆماوەی زیاتر لەسێ سەدە درێژەی کێشا. لەم سۆنگەیەوە، ئەو پەندە بەناوبانگە عیراقییە دروست بوو کەدەڵێت:(لەنێوان عەجەم و رۆمدا، تووشی گون رەشی خۆمان بووین).[5] ئەم بەڵایە کە عیراق تووشی بوو، لەوەوە سەرچاوەی گرت کەدەوڵەتی ئێران شیعەی کرد بەدروشمی خۆی، لەکاتێکدا دەوڵەتی عوسمانی دروشمی سوننی بەرزکردەوە، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی ململانێی مەزهەبی لەعیراقدا، لەرادە بەدەر گەورە ببێت.

پێویستە ئەوە فەرامۆش نەکەین کەململانێی مەزهەبی هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە، لەعیراقدا هەبووە، و بەغدا گەلێ شەڕی بەخۆوە بینی لەسەردەمی عەباسییەکاندا، لەنێوان شوێنی نیشتەجێ بوونی سوننییەکان و شیعەکاندا، کەکوشتەی زۆری لێدەکەوتەوە و ماڵ و

[5] ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کەعیراقییەکان – و عەرەب بەگشتی – بەتورکەکانیان دەگوت رۆم، دیارە هۆکەیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەتورکەکان لەلایەنی رۆمەوە، روویان لەوڵاتە عەرەبییەکان کردبوو.



بازاڕەکانی تیادا دەسووتا، و شکۆمەندیی مەزارە پیرۆزەکانی تیادا پێشێل دەکرا. بەڵام ئەم ململانێیە گەیشتە ئەو پەڕی، کە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانیدا، کێشە لەسەر عیراق دروست بوو، تا وای لێهات خەڵکی عیراق، جگە لەهەواڵەکانی ئەو دوو دەوڵەتە، ئاگاداری کاروباری ژیانی گشتیی خۆیان نەبوون، و هەر لایەنەو لەخودا دەپاڕایەوە، کەیەکێکیان سەربخات و ئەوی دیکەیان ریسوا بکات.

لەو سەردەمەدا، خەڵکی عیراق شتێکی ئەوتۆیان، لەسەر بیرۆکە سیاسییە نوێکانی وەکو نیشتمان پەروەری، یان نەتەوەیی، یان سەربەخۆیی نەدەزانی، بەڵکو تەنیا شتێك کەسەرقاڵی کردبوون، هەستی ئایینی بوو کەگوزارشتی لەدەمارگیریی مەزهەبی دەکرد. بەو مانایەی کەئەوان ئێرانییەکان یان تورکەکانیان بەبێگانە نەدەزانی کەمەبەستیان داگیرکردنی وڵاتە و ماشینەوەی خێرو بێریەتی، بەڵکو هەر تاقمەو بەجۆری دەیڕوانییە ئەو دەوڵەتەی هاو مەزهەبی بوو، وەکو بڵێی پارێزەری ئایینەکەی و رزگارکەری خەڵکەکەی بێت.

ئەم تێڕوانینە، لەنێوان خەڵکە رەشۆکەکەدا، تائەم دواییەیش هەر باوبوو. یەکێك لەرواڵەتەکانی ئەو دیاردەیە، پیرۆز راگرتنی ئەو تۆپە بوو، بەناوی(تۆپەکەی ئەبو خوزامە). ئەم تۆپە لەلایەن سوڵتان مورادی چوارەمەوە بۆناوچەکە نێردرا، بەمەبەستی داگیرکردنی بەغداو دواتر لەوێدا مایەوە، و دواتر خەڵکە رەشۆکەکە زیارەتیان دەکرد، لەکاتێکدا، جگە لەئامێرێك لەئامێرەکانی(داگیرکردن)ی عیراق و بەکۆڵۆنیاڵ کردنی، بەپێی بیرۆکەکانی سەردەمی نوێ، شتێکی دیکە نەبوو.

دیاره ململانێی مەزهەبی، بەروالەت لەسەر بنەمای دوژمنکاریی ، لەنێوان ئەو کەسەی هەواداری یارانی پێغەمبەرەو ئەو کەسەی لایەنگری کەسوکاری پێغەمبەرە بەرپا دەبێت. لەراستیدا هەردوو دەولەتی عوسمانیو ئێرانی لەرووی دوورییانەوە، لەیەکدی دەچوون لەمەڕ ئەو شتانەی یارانی پێغەمبەرو کەسو کارەکەی، پێکەوە خوازیاری بوون، چونکە هەردووکیان، لەدەوڵەتە سەرکوتکەرە کلاسیکییەکان بوون، کە نەکەمو نەزۆر فڕیان بەو دەوڵەتە ئیسلامییانەوە نەبوو، کە لەسەردەمی پێغەمبەرو جێنشینەکانیدا هەبوون.

خەڵکی عیراق لەسەردەمی عوسمانیدا، دەرکی ئەمەیان نەدەکرد، تەنیا ئەوەیان دەویست دەولەت لەسەر مەزهەبەکەیان بێت، و گۆڕی پێشەواکانیان هەڵبەستێت، و بایەخ بەسرووتو رێورەسمە ئایینییە تایبەتەکانیان بدات، ئیتر گرنگ نەبوو دەوڵەت چی دەکات، ئەوەیان بەلاوە گرنگ نەبوو، و لەو بڕوایەدا نەبوون کەپەیوەندیی بەئایینەوە هەیە.



## پرەنسیپی پاڕانەوە:

دەتوانین بڵێین کەبڕوای ئایینی ئەوسا، لەهەندێ لەبنەماکانیدا، چەقی لەسەر پرەنسیپی نزاو پاڕانەوە دەبەست، کاتێ خەڵکی لاف ئەوە لێدەدەن کەهەواداری یاران یان کەسوکاری پێغەمبەرن، مەبەستیان لەپەیڕەویی کردن لەوە، گرتنەبەری رەوشێکی تایبەت لەژیانی خۆیان نییە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە لەودونیادا، بۆیان بپاڕێنەوە.

خەڵکی لەو بڕوایەدا بوون کەئەم دونیا کاتییەو شیاوی ئەوە نییە کەمرۆڤ بایەخی پێبدات، بەڵکو پێویستە لەسەری، لەبری ئەوە، بایەخ بەنیارەکانی ئەو دونیا بدات، و گرنگترین ئامراز بۆدەستەبەر کردنی ئەو دونیا، بەپێی بۆچوونیان، لەلایەکەوە ئەنجامدانی سرووتە ئایینییەکان، و لەلایەکی دیکەوە، دەستەبەرکردنی پاڕانەوەی نزیکەکان لەخوداوەیە، بەڵام رەوشتو مامەڵەی باشو ئەم جۆرە شتانە، گرنگییەکی ئەوتۆیان نەبوو، چونکە بەپێی بۆچوونیان، خودا لەرێگەی ئەوانەی بۆیان دەپاڕێنەوە، کەخودا گەلێ خۆشیانی دەوێت، و هیچ داواکارییەکیان رەت ناکاتەوە، لەهەموو گوناهەکانیان خۆش دەبێت.

شاراوە نییە، کەپرەنسیپی پاڕانەوە لەسروشتی ئەو دەسەڵاتەوە سەرچاوە دەگرێت، کەخەڵکی هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە لەسەری راهاتوون، ئەوان لەسەر ئەوە راهاتوون کەکەسی نزیک لەدەسەڵاتدار توانایی ئەوەی هەیە هەر مرۆڤێك لەپەتی سێدارە رزگار بکات، یان وای لێبکات خەڵاتو پارەی زۆری دەست بکەوێت، و ئەم بۆچوونە لەسەر بیروباوەڕە ئایینییەکانیان رەنگی دایەوەو بەو بڕوایە گەیشتن کەپاڕانەوە

بەلای خوداوە، وەکو پاڕانەوە بەلای دەسەڵاتداران لەم دونیادا، گرنگیی خۆی هەیە.

ڕەنگە ئەمە بۆراڤەکردنی گەلیٚ لەدیاردە کۆمەڵایەتییە ناکۆکەکان یارمەتیمان بدات، کەسەردەمی عوسمانی خۆی تێهەڵکێشا بوو، لەرووی بایەخی خەڵکی-حکومەتو گەل-ەوە، بەئاوەدانکردنەوەی مزگەوتو مەزارە پیرۆزەکان،و بایەخی زۆر بەسرووتو ڕێورەسمە ئایینییەکان، لەکاتێکدا ستەمو دزیو دەستدرێژیی لەناو خەڵکیدا باوبوو-حکومەت ستەمی لەخەڵکی دەکردو خەڵکیش ستەمیان لەیەکدی دەکرد، بەڵام هەموان بڕوایان وابوو، کەدوارۆژ، لەرێگەی پاڕانەوەی گەورەکانیانەوە، دەچنە بەهەشتەوە.

گرنگترین نیار کەلەنێوان شیعەو سوننییەکاندا، مشتومڕی لەسەر دروست دەبێت، نیاری جێنشینییە، واتە دوای مردنی پێغەمبەر دەبیٚ چ کەسیٚ بەجێنشین ببێت-عەلی یان ئەبو بەکر. ئەگەر کەسێك ئێستا بەچاوێکی سەردەمانەی بیٚ لایەنانەوە تەماشای ئەم نیارە بکات، هەست بەوە دەکات کەنیارێکە لەنیارەکانی رابردووی کۆن،و هیچ گرنگی یان پەیوەندییەکی بەواقیعی ئەمڕۆمانەوە نییە. بەڵام عیراقییەکان لەسۆنگەیەکی دیکەوە پیایدا دەیانڕوانی، ئەوان کاتیٚ بڕوایان وابێت کەفلانە کەس لەفلان شایستەتری جێنشینییە، وادەزانن ئەوە لەو دونیا سوودیان پێدەگەیەنێت، چونکە فلان لای خودا بۆی دەپاڕێتەوە،و هەر دەبیٚ بەو پاڕانەوەیە، لەئازاری دۆزەخ رزگاری بکات!

شیعەکان بڕوایان بەکەسوکاری پێغەمبەر هەیە. بەپێی شیعەکان، تەنیا ئەوان لەخوداوە نزیکنو دەتوانن بەپاڕانەوە رزگاریان بکەن،و ئەوەی دەخوازێت لەپاڕانەوەی ئەوان بیٚ بەریی نەبێت، پێویستە هەواداریان



بێتو دوژمنایەتییان نەکات،و ڕێگەی ئەوەی پیٚ نەدراوە، هاوکات ئەوانو دوژمنەکانیانی خۆش بوێت. لەکاتێکدا سوننییەکان ڕێگەیەکی دیکەیان گرتەبەر، لەم دەستەواژەیەدا پوختە دەبێت:(هەموویانمان خۆش دەوێتو خێر لەهەموویان دەبینین)- واتە ئەوان ئەبو بەکرو عەلییان پێکەوە خۆش دەوێت، هەروەکو چۆن یارانیان خۆش دەوێت، ئاوهایش کەسوکاری پێغەمبەریان خۆش دەوێت- بەم جۆرەو بەپێی بڕوای خۆیان، پاڕانەوەی هەموویان دەستەبەر دەکەن.[6]

ئەوەی شایانی ئاماژە بۆکردنە لەم بارەوە، ئەوەیە کەپرەنسیپی پاڕانەوە، لەهەموو مەزهەبو ئایینەکان، بەجۆریٚ لەجۆرەکان هەیە، بەڵام ئێمە دەتوانین بڵێین کە کاریگەریی ئەم پرەنسیپە، لەقۆناغی یەکەم لەپەیدابوونی بانگهێشت کردنی ئایینییدا لاواز دەبێت، چونکە خەڵکی ئەوسا زیاتر لە بایەخدان بەپرەنسیپی پاڕانەوە، بایەخیان بەکاری چاکە دەدا، بەڵام دوای ڕەت بوونی ماوەیەك بەسەریاندا، وردە وردە گەڕانەوەیان بۆ بەها کۆمەڵایەتییە کۆنەکانیان-کەدەگەڕێنەوە سەر خۆبەستنەوە بەدونیاوەو ڕێنماییە ئایینییەکان فەرامۆش دەکەن- دەبینن لەتاوانەکاندا نغرۆ بوونە،و هیچ هیوایەکیان بەرزگار بوون نەماوە، مەگەر ئاراستەکەرێکیان لای خودا هەبێت بۆیان بپاڕێتەوە. ئەوان لەمەدا، وەکو

---

[6] تالیب موشتاق، لەم بارەوە داستانێکی خۆش دەگێڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەبەحوکمی ئەوەی لەکازمییە لەدایك بووە، کەشوێنێکی شیعە نشینە، بووە بەشیعە،و نەنکی ئامۆژگاریی دەکرد کەواز لەمەزهەبی شیعە بهێنێتو بچێتە سەر مەزهەبی سوونییەکان،و هەردەم پێی دەگوت(کوڕم ئێمە هەموویانمان خۆش دەوێتو هەموویان بۆمان دەپاڕێنەوە)، بەڵام ئەو گاڵتەی پێدەهات،و هیچ بایەخی بەوتەکانی نەدەدا...

بڕوانە: تالیب موشتاق (أوراق أيامي) - بەیرووت 1968- ب1 ل10.

ئەو تاوانبارە وان کەخەریکە دەدرێتە دادگا، و ئەویش هیچ هیوایەکی بەرزگار بوون نەماوە، تەنیا لەرێگەی راسپێرییەوە نەبێت، بۆیە دەبینین پەنا دەباتە بەر راسپێر، داوای لێدەکات دەست بەکار بێت، خۆی دەدات بەسەر دەستو پێیدا، و پێی وایە کەراسپێر دەبێ دڵی نەرم ببێت، یان پیاوەتیو شکۆمەندیی هانی دەدات، هەرچۆنێك بێت بۆی بپارێتەوە.

دەتوانین بڵێین کەپرەنسیپی پاڕانەوەو لالانەوە، نیازێکی دەروونی بەلای مرۆڤەوە پڕ دەکاتەوە، و ئەوان تەنیا لەپێناوی بەخشینی گوناهەکانیان پەنای پێ نابەن، بەڵکو بۆئەوەیش پەنای پێ دەبەن، کاتێ پێویستییان بەراسپێرێك، لەکاروبارەکانی ئەم دونیایاندا دەبێت، و ئەگەر کەسێکی خۆشەویستییان نەخۆش کەوت، یان هەژاریی رووی تێکردنو قەرزەکان لەسەریان کەڵەکە بوو، یان لەنێوانیاندا نەخۆشییەك بڵاوبووەوە، یان کارەساتێك رووی دا، بەهەڵەداوان خۆیان دەگەیەننە مەزاری یەکێك لەپێشەوایان یان شەخسە گەورەکان، بەسەریدا دەگرینو داوای یارمەتی لێدەکەن. ئەوان کەمتر راستەوخۆ داوا لەخودا دەکەن نیازەکەیان دەستەبەر بکات، چونکە پێیان وایە خودا وەکو دەسەڵاتدارێك، ناتوانن تەنیا لەرێگەی نزیکەکانەوە نەبێت، کەپێگەی بەرزو گەورەیان هەیە، پێی بگەن.

بەکورتی، ئێمە ناتوانین لەرازی زۆربەی دیاردەکانی ئاییینداری- لەکۆمەڵگەی عیراقو کۆمەڵگە لێکچووەکانی-تێبگەین، ئەگەر هاتو لەپرەنسیپی پاڕانەوەو لالانەوەو رادەی تەشەنە کردنی بۆناخی دڵەکان تێنەگەین، دیارە خەڵکی رەنگە، جاروبار نکوڵی لەکاریگەریی ئەم پرەنسیپە بکەن، بەڵام نائاگا دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، و بەبێ ئەوە هەست بەونبوون دەکەن.



## رەوشتی خەڵکی عیراق:

عیراقییەکان لەسەردەمی عوسمانیدا، لەرەوشتی سارانشینییەوە نزیکتر بوون وەك لەرەوشتی ئیسلامییەوە، و هۆکەیشی بۆ زاڵ بوونی (تەوژمی سارانشینی) بوو لەسەریان. و لێرەدا بواری روونکردنەوەی ئەم بابەتە نییە، تەنیا دەتوانین بڵێین کەجیاوازییەکی گەورە لەنێوان رەوشتی سارانشینیو رەوشتی ئیسلامیدا هەیە، کەخێڵەکایەتی بەهاکانی دەمارگیریو تۆڵەسەندنەوەو داگیرکاریو تالانو دەستێوەردانو کوشتنی ژن بەمەبەستی ئابڕوو پارێزیو لەم جۆرە کارانە بەهێند وەردەگرێت، لەکاتێکدا ئیسلام ئەو بەهایانە رەت دەکاتەوەو بەدابو نەریتی سەردەمی جاهیلیی نکوڵی لێکراو هەژمار دەکات. لەراستیدا ئەگەرچی ئیسلام رەتی دەکاتەوە، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا باوبوو، و زۆرینەی خەڵکی پیرۆزیان دەکرد، شتێکی بەرچاو بوو کەبیانبینین شانازیی بەو پیاوەوە بکەن، کە لەکاتی رۆیشتندا زەوی لەژێر پێیدا دەلەرزی، و دەیتوانی چاوی خەڵکی بشکێنێت، بەبێ ئەوەی کەسێك بتوانێت چاوی بشکێنێت، و شەوان دەیدا بەسەر ماڵاندا بەناوی لێهاتنەوە، و ئەوسا ئەوان بە(شێر) یان(پیاوی شەو) یان شانازیی تایفە) یان لەو جۆرە ستایشکارییانە ناویان دەبرد.

لەراستیدا(تەوژمی سارانشینی)، بەدرێژایی سەردەمە مێژووییەکان، هەردەم هاوڕەوتی کۆمەڵگەی عیراق بووە، جاروبار دەهات

بەسەریدا، و جاروباریش لەسەری لادەچوو. و هۆکەیشی زۆر جار بۆئەوە دەگەڕایەوە، کەئەو بیابانەی لەپاڵ عیراقدایە، گەورەترین سەرچاوەی سارانشینییە لەجیهاندا، و هیچ بەربەستێکی سروشتی لەئارادا نییە لەوەی جیابکاتەوە، و بۆیە هۆزە سارانشینەکان هەردەم ئامادەی ئەوە بوون روو لەعیراق بکەن و تیایدا نیشتەجێ ببن، و هەر کاتێ دەرفەتێکی گونجاویان بۆرەخسابێت لەکاتی شەڕو ئاژاوەدا، یان بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە گشتگیرەکانەوە، ئەو کارەیان دەکرد، یان لەوکاتانەدا کەحکومەت لاوازو لەپەراوێزدا بووبێت و شارستانی سڕابێتەوە– و ئەوسا هۆزە سارانشینەکان لەناو عیراقدا بڵاو دەبوونەوە، و کۆنترۆڵی ڕێگاو بانەکانیان دەکردو هەڕەشەیان لەشارو گوندەکان دەکرد، کەئەمەیش وا لەدانیشتوانەکانیان دەکات، بەمەبەستی بەرگریی لەخۆیان، چەك هەڵبگرن، و بەمەیش بەهاکانی تایفەگەری و تۆڵەسەندنەوەو داگیرکاری لەنێوانیاندا، بڵاودەبێتەوە.

لێرەدا هۆکارێکی دیکەیش هەیە، دەکرێ لەم بارەوە بیهێنینەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئاوی عیراق بەرێژەیەکی زۆر هەڵگری لیتاوە،[7] ئەمەیش لەکاتی ئاژاوەو کەمتەرخەمیدا، دەبێتە هۆی نیشتنی قوڕو لیتە لەناو رووبارەکان، و تێکچوونی جۆگەکانی ئاودێری، و هەڵسانی لافاو. و ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆربەی هۆزەکان پیشەی کشتوکاڵی بەجێ بهێڵن و روو لەپیشەی بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بکەن، لەگەڵ هەموو داب و نەریتی خێڵەکایەتیدا.

[7] بڕوانە: ئەحمەد سووسە(فیضانات بغداد في التأريخ)–بەغدا 1963– ب1 ل147–148.



سەرەرای ئەوەی بەبەردەوامی توانایی بەرهەمهێنانی زەوییە کشتوکاڵییەکان لەعیراقدا، بەهۆی کۆبوونەوەی خوێ یان گۆڕانی رەوتی رووبارەکان کەمدەبێتەوە، و ئەمەیش وا لەگوندنشینەکان دەکات–لەو کاتانەی نۆرێنی حکومەت لاواز دەبێت–لەپێناوی دەستگرتن بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکان، یان هەرنەبێ پاراستنیان، بکەونە مشتومڕ لەناو خۆیاندا، ئەمەیش بەو مانایەیە کەئەو هۆزانە دەگەڕێنەوە بۆ داب و نەریتی خێڵەکایەتی، چونکە دەبینێت، تەنیا بەزەبری شمشێرو هێزی تایفەگەری نەبێت، ناتوانێت درێژە بەزۆرانبازیی ژیان بدات.

## دوا تەوژمی خێڵەکایەتی:

پێموایە ئەو دوا تەوژمە خێڵەکایەتییەی، لەسەردەمی عوسمانیدا عیراقی گرتەوە، لەهەموو سەردەمەکانی پێش خۆی توندتر بوو، چونکە کۆمەڵگەی عیراق، بەدرێژایی مێژووی خۆی، سەردەمێکی وەکو ئەو سەردەمەی بەخۆوە نەبینی، کەتیایدا بەها خێڵەکییەکان بەو جۆرە باڵادەست بێت. و رەنگە بتوانم بیگێڕمەوە بۆئەم هۆکارانەی خوارەوە:

یەکەم–داگیرکاریی عوسمانی دوای ماوەیەك لەداگیرکارییە مەغۆلی و تەتەرییەکان هات، ئەو ماوەیەی کەحکومەتێکی شارستانی لەئارادا نەبوو، بایەخ بەبرەوپێدانی بازرگانی و هانی بەرهەمهێنان و بایەخ بەسیستمی ئاودێری بدات. مێژوونووسان ئەو سەردەمە بەتاریکترین و نزمترین ئاستی شارستانیی مێژووی عیراق دادەنێن. ئەو حکومەتانەی دوابەدوای رووخانی دەوڵەتی عەباسی، لەعیراقدا دەسەڵاتیان بەدەستەوە

گرت، و ڕەنگە پێشتریش، لەبری ئاوەدانکردنەوە، یان باڵادەستیی ئاسایش و سەقامگیری لەکۆمەڵگەدا، تەنیا لەبیری داگیرکاری و باج وەرگرتندا بوون، لەبەر ئەوە، خەڵکی شارەکان ناچار دەبوون، لەپێناوی پاراستنی ماڵ و گیانیان، پەنا بەتایفەگەری و بەها خێڵەکایەتییەکان ببەن، هەروەها تایفە بچووکەکان ناچار بوون یەکبگرن و بچنە ناویەکگرتنە خێڵەکییە گەورەکانەوە، تاوەکو بتوانن بمێننەوە. ئەم دۆخە لەسەردەمی عوسمانیدا توندتر بوو، زۆرجار والییەکان، هۆزەکانیان بەگژی یەکدیدا دەکرد، تاوەکو سەرقاڵیان بکەن یان لەسەر ڕەوشی(دووبەرەکی دروست بکە سوودمەند دەبیت) لاوازیان بکەن.

دووەم–کاتێ دەوڵەتی عوسمانی، لەسەدەی شانزەیەمدا رووی لەعیراق کرد بەمەبەستی داگیرکردنی، سەردەمی توانایی وگەشاوەیی خۆی تەی کردبوو، و نیشانەکانی لاوازی و هەرەسهێنانی لەسەر دەرکەوتبوو، و لەتوانایدا نەمابوو، ماوەیەکی درێژ لەژیاندا بمێنێتەوە، تەنیا شتێك کەببوە هۆی مانەوەی، سەرەرای لاوازیی زۆری، ئەوەبو کە لەمێژووی نوێدا بە(مەسەلەی ڕۆژهەڵات) ناسراوبوو، کەهەندێ لەزلهێزەکانی وەکو بەریتانیا و فەرەنسا، لەمەڕ دەوڵەتی عوسمانی، سیاسەتی: ئەو کەسەی نەژیان و نە مردنی بۆدەوێت)یان گرتبووە بەر. ئەوان لەوە دەترسان، بەر لەوەی لەناو خۆیاندا لەسەر دابەشکردنی کلتوورەکەی ڕێکبکەون بمرێت، بۆیە هەرکاتێ بیانبینیایە کەخەریکە دەمرێت، مەمرەو مەژی دەرمانیان پێدەدا، و بەم جۆرە دەوڵەتی عوسمانی ماوەیەکی درێژ، لەسەر لێواری مەرگدا مایەوە. بەو مانایە کەعیراق و ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتیدا بوون،



لەژێر گەندەڵیی حکومی و داوەشانی شارستانیدا دەیانناڵاند، ئەمەیش دەرفەتێکی بەهادار بوو، بۆخێڵە سارانشینەکان، کەخەریك بوو دەهاتنە ناو عیراقەوە و بەبەها کۆمەڵایەتییەکانیان، دەیانخستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

سێیەم–دەوڵەتی عوسمانی، سەرەرای لاوازییە گشتییەکەی خۆی، سەرقاڵی کێشمەکێشی بەردەوام بوو لەگەڵ ئێراندا– ئەو کێشمەکێشەی نزیکەی سێ سەدە درێژەی کێشا، و ئارامیی بەخۆوە نەبینی، مەگەر لەناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمەوە نەبێت، و دەبوا ئەم سەرقاڵ بوونە، دەرفەتێك بێت، بۆهۆزەکان تاهەرکاتێ بیانویستایە تەراتێنیان لەعیراقدا بکردایە. ئەوەی لەم بارەوە، شایانی ئاماژە پێکردنە، ئەوەیە کەحکومەتی عوسمانی گەلێ جار، لەشەڕەکانی لەگەڵ ئێراندا، پشتی بەهۆزو تیرە عیراقییەکان دەبەست، دیارە ئەو هۆزانەیش، بەهاندەری نیشتمانی یان ئایینی یان شتێکی لەو جۆرە، بەشداریی لەشەڕدا ناکەن، بەڵکو لەپێناوی تاڵانی لەلایەك، و لەپێناوی دەستەبەر کردنی ئەو دەسەرانەی دەسەڵاتی ئەوەیان دەدەنێ دەست بەسەر چەند ناوچەیەکدا بگرن، لەلایەکی دیکەوە، بەشداریی دەکەن، و ڕەنگە دوای کۆتایی شەڕەکە، سەربەخۆ ببێت و خۆی حوکمی خۆی بکات، و هەوڵی ئەوە بدات نۆرێنی خۆی بەسەر هۆزو عەشرەتەکانی دەرودراوسێدا بسەپێنێت، و بەم جۆرە چەند ناوچەیەکی فراوان لەعیراق، دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەرەك عەشیرەتەکانەوە، کەبەپێی بەها خێڵەکایەتییەکانیان فەرمانڕەوایی دەکەن.

چوارەم– نزیکەی هەر دەساڵ جارێ، نەخۆشییەکی گشتگیر لەسەردەمی عوسمانییەکان، لەناو عیراقدا بڵاودەبووەوە. لەراستیدا جاروبار نەخۆشییەکان هەموو جیهانیان دەگرتەوە، بەڵام لەو بڕوایەدام، بڕەبەشی عیراق لەبڕەبەشی وڵاتانی دیکە زیاتر بوو، و رەنگە ئەوەی کەعیراق دەکەوێتە سەر رێگەی حەجی گەلێ لەوڵاتە ئیسلامییەکانەوە، یەکێك لەو هۆکارانە بێت، جگە لەوەی مەزارە پیرۆزەکانی تێدایە، کە بەزۆریی سەردان دەکرێن و گۆڕستانێکی تێدایە، کە بەگەورەترین گۆڕستان لەجیهاندا هەژمار دەکرێت، کەئەویش گۆڕستانی(وادی السلام)واتە، شیوی ئاشتییە لەنەجەف. واتە هەر نەخۆشییەك لەوڵاتێکی دراوسێدا سەریهەڵبدایە، درەنگ یان زوو، دەبوا بۆعیراق بگوازرایەتەوە.[8]

پێویست بەوە ناکات بڵێین نەخۆشییەکان گەورەترین کاریگەرییان لەسەر سووکایەتی کردن بەشارستانی، و لەسەر بەهێزکردنی(تەوژمی خێڵەکایەتی) لەوڵاتدا هەیە، چونکە ئەوە زیاتر لەگوندنشینان، کاریگەریی لەسەر شارنشینەکان دەبوو، و تاشارەکان گەورەترو دانیشتوانیان زیاتر بوایە، کاریگەریی نەخۆشییەکان گەورەتر دەبوو. زۆرجار نەخۆشییەکان زۆربەی پیشەسازو پیشەوەرەکانی لەناو شارەکاندا لەناو دەبرد، و کەسیان نەدەمان، تاوەکو شارستانی و گەشەسەندنی بەردەوام بوایە.

[8] سەبارەت بەتەشەنە کردنی نەخۆشی لەعیراقدا، بڕوانە لاپەڕە 302–306 لە کتێبی(دراسة في طبیعة المجتمع العراقي–بغداد1965)ی نووسەر.



## شارەکان و عەشیرەتەکان:

دوو دیاردەی کۆمەڵایەتی لەئارادان، دەکرێ لەسەر گەورەیی تەوژمی سارانشینی لەسەردەمی عوسمانیدا بەبەڵگە بیانهێنینەوە: یەکێکیان کەمی دانیشتوانی عیراق، و دووەمیان زۆریی گوندنشینەکان، لەبەراورد لەگەڵ شارنشینەکاندایە.

کۆی دانیشتوانی عیراق، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، نزیکەی(1250000)کەس بوو، و ئەم ژمارەیە، لەبەراورد لەگەڵ دانیشتوانی عیراق لەسەردەمی عەباسیدا گەلێ کەمە، چونکە دەڵێن ئەو سەردەمە، تەنیا دانیشتوانی بەغدا، زیاتر لەدانیشتوانی سەرانسەری عیراق لەسەردەمی عوسمانیدا بوو.

رێژەی گوندنشینان لەسەردەمی عوسمانیدا، زیاتر لەسێ لەسەر چوارەمی دانیشتوانی عیراق بوو، و لەدوو توێژی سارانشین و جووتیار پێکهاتبوون،[9] بەڵام هەموویان تەنیا لەژێر کاریگەریی دەمارگیریی خێڵەکایەتیدا بوون. ئەوان بەچاوی دوژمنکارانەوە تەماشای هەموو حکومەتێکیان دەکرد، بەلایانەوە گرنگ نەبوو، ئەو حکومەتە تورکی یان ئێرانی بێت، رەنگە هەندێ جار، هەندێ لەو هۆزانە، یارمەتی سوپا

[9] بڕوانە:محەممەد سەلمان حەسەن(التطور الأقتصادي في العراق)–بەیرووت–ل51–58.

سەرکەوتووەکانیان دابێت، پاشماوەی سوپا تێکشکاوەکانیان تالآن کردبێت، بەبیٚ رەچاوکردنی بیروبۆچوونی ئەو سوپایانە.

بەلآم شارنشینەکان لەم رووەوە، هەندیٚ جیاوازییان لەگەڵ عەشایرەکاندا هەبوو، ئەوان سیٚ جۆر ئاستی دەمارگیریو ئینتیمای کۆمەڵییان هەبوو، لەکاتێکدا خێڵەکییەکان یەك ئاست لەدەمارگیرییان تێدابوو، ئەویش دەمارگیریی خێڵەکی بوو. کەسی شاری بەر لەهەموو شتێك، دەمارگیریی بۆگەڕەکەکەی خۆی هەبوو لەشارەکەیدا، لەبەرامبەر گەڕەکەکانی دیکە، چونکە گەڕەك بۆئەو، وەکو خێڵ وابوو سەبارەت بەسارانشینو گوندنشینانەوە،و دەمارگیرییەکەی ئەو بۆگەڕەکەکەی دەبێتە دەمارگیرییەکی فراوانتر، کەپێی دەڵێین دەمارگیریی شاری، ئەمەیش کاتیٚ روودەدات، کەمەترسییەکی گشتیی هەڕەشە لەشارەکە بکات، بۆیە هەموو گەڕەکەکان، بەمەبەستی بەرگریی لەشارەکە، یەکدەگرنو یەك ریز لەبەرامبەر دوژمنی هاوبەشدا دەوەستن.

بەلآم ئاستی سێیەمی دەمارگیریی بەلای شارنشینەکانەوە، ئاستی مەزهەبییە، ئەوەیش کاتیٚ سەرهەڵدەدات کەکێشەیەکی مەزهەبی بوروژێت، یان ولآتێکی دیکە کەسەر بەمەزهەبێکی دیکەیە بیەوێت ئەو ولآتە داگیر بکات. ئەوسا شارنشینان دوژمنکارییە ناوخۆییو شارییەکان فەرامۆش دەکەنو هەموو بایەخی خۆیان دەخەنە سەر کێشە نوێکە،و لێرەدا راستیی ئەو پەندەبەناوبانگەی سارانشینان دەردەکەوێت:(منو براکەم دژی ئامۆزاکەم،و منو ئامۆزاکەم دژی بێگانە).



لەمەوە روون دەبێتەوە کەمەزهەبگەری، تەنیا جۆرێکە لەتایفەگەری، واتە ، زیاتر لەوەی لەسەر بنەمای ئایینوپاراستنی رێنماییەکانی بێت، لەسەر بنەمای ئینتیمای کۆمەڵایەتییە.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کەعیراقییەکان لەکێشمەکێشی مەزهەبیدا، هەر تاقمێکیان دەگێڕایەوە بۆ ئەو پیاوەی کەبەهێمای دەمارگیریی مەزهەبیی خۆیانیان دادەنا، دەیانگوت ئەمانە(تاقمی عەلی)ن،ئەوانە(تاقمی عومەر)ن،و هەر تاقمێك لەوانە خۆی بەعەشیرەتی ئەو پیاوە دەزانی،و پشتگیرییان لێدەکرد، هەروەکو چۆن خێڵەکان لەکاتی شەڕکردندا پشتگیرییان لەسەرەك خێڵ دەکرد.

ئەمە لەهەندیٚ رووەوە وەکو ئەو کێشەیە وایە، کە لەنێوان دوو شاری هاومەزهەبدا روو دەدات، وەکو ئەوەی هەندیٚ جار لەنێوان نەجەفو کازمییەدا روو دەدات، دانیشتوانی کازمییە خۆیان بەنەوەی موسی(ئیمام موسای کازم) دەزانن کە لەشارەکەیاندا بەخاك سپێردراوە،و خەڵکی نەجەفیش خۆیان بەنەوەی عەلی دەزانن. لێرەدا مەسەلەکە لەچوارچێوەی ئایینیی خۆی دەردەچێتو دەبێت بەجوامێرییەکی خێڵەکی،و کاتیٚ نەوەکانی عەلی لەگەڵ نەوەکانی موسا، بەردەبنە گیانی یەکدی، ئەوە فەرامۆش دەکەن کەعەلیو موسا وەکو یەكو خاوەنی یەك بیروباوەڕن.

## دیاردەی شەڕئەنگێزی:

دیاردەی شەڕئەنگێزی یەکێکە لەدیاردە کۆمەڵایەتییە هەرە گرنگەکان، کەرادەی زاڵبوونی تەوژمی خێڵەکایەتی لەعیراقی سەردەمی عوسمانیدا دەسەلمێنێت، و پێویستە لەسەرمان، لەم بۆنەیەدا، بەدرێژیی ئەم دیاردەیە تاوتوێ بکەین، چونکە وێنایەکی روونمان لەسەر کۆمەڵگەی عیراقی ئەو سەردەمە، لەرووی پێکهاتەو بەهاکانەوە پێدەبەخشێت.لەرووی یاساییەوە(شەڕئەنگێز) تاوانبارە، بەڵام لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، بەو پاڵەوانانە هەژمار دەکرێت کەگەڕەك شانازیی پێوە دەکاتو بەپەنجە ئاماژەی بۆدەکرێت. زۆرجار دزیکردنو بڕینی ماڵانو دانانی سەرانە لەسەر دەوڵەمەندەکانی دەکرد بەپیشەی خۆی، بەڵام لەهەمان کاتدا، بەها باوەکانی گەڕەکی نەدەبەزاند. ئەو لەگەڕەکەکەیدا، جوامێرێکی جەنگاوەر بوو، دراوسێکەی دەپاراستو داکۆکی لە(نانو نمەك)مافەکانی دەکردو پابەندی دابو نەریتی خێڵەکیو خۆتێهەڵقورتاندنو بەهاناوە هاتنو ئەم جۆرە شتانە دەبوو. بەڵام رەفتارە تاوانبارییەکانی، لەلایەکەوە ئاراستەی حکومەت، و لەلایەکی دیکەوە، ئاراستەی ئەو کەسانە دەکرد کەنەدەچوونە ژێرباری خێڵەکایەتییەکەی ئەوەوە.

زۆرجار شەوان، شەڕی خوێناوی لەنێوان کەسی شەڕئەنگێزو جەندرمەدا رووی دەدا، و تاشەڕو شۆڕەکانی کەسی شەڕئەنگێز زۆرتر بوایەو قوربانییەکانی زیاتر، پێگەی لەناو خەڵکیدا بەرزتر دەبووەوە. و



ئەگەر دەستگیر بکرایەو زیندانی بکرایە، ئەوە وەکو ئەوە وابو نیشانە وەربگرێت، گوایا زیندان شوێنی پیاوە. خۆئەگەر بکوژرایە، ئەوا خەڵکی گەڕەك بەشدارییان لەبەخاك سپاردنیدا دەکرد، و بۆمردنی وەها کەڵە پیاوێك بەداخ دەبوون.

لەکۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا، یەکێك لەشەڕئەنگێزە بەناوبانگەکانی بەغدا، بەناوی(عباس السبع) شێر عەباس لەگەڵ هاوڕێیەکیدا کوژرا، جەندرمەکان لاشەی هەردووکیانیان بەکلکی ئەسپەوە بەستو بەرێگاکاندا رایانکێشان. و شایەتحاڵێك گێڕاویەتییەوە، گوایا خەڵکی بینیوە بۆی گریاون، و تاقمێکی بینیوە بەدوای تەرمەکەیەوە هاواریان کردووەو گوتوویانە(شێر عەباس ئەی ئەوەی چۆکی بەبازرگانان دا)و ژنان لەخۆیان داوەو لەدەوری تەرمی دەگریانو دەیانگوت:(خەڵکینە بۆی دەرچن، قڵیشایەوە)[10]

ئەمە دەلالەت لەوە دەکات کەچەندە خەڵکی رێزیان بۆ کەسی شەڕەنگێز هەیە، ئەوان ستایشی دەکەن بەوەی(چۆك بەبازرگانان دەدات) واتە باج لەدەوڵەمەندەکان وەردەگرێت، و ناچاریان دەکات ملکەچی بن. دیارە کەحکومەت کاتێ رێگەی بەوە دا لاشەکە بەدوای ئەسپدا رابکێشن، ویستی بەوە بیکات بەپەند بۆشەڕئەنگێزەکانی دیکە، بەڵام بەم کارە، کەسی شەڕئەنگێزیان لەناو خەڵکیدا بەرزکردەوەو کەبۆی بگرینو بۆمردنی بەداخ بن.

---

[10] عەبدولکەریم عەللاف(بغداد القديمة)-بەغدا1960-لاپەڕە 135.

ژمارەی شەڕئەنگێزەکان لەسەردەمی عوسمانیدا، لەبەراورد لەگەڵ کۆی دانیشتوانی گەڕەك یان شارەکاندا گەلیٚ کەم بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کەم بوون، بەڵام بەجوانی نوێنەرایەتیی بەها کۆمەڵایەتییە باوەکانیان دەکرد. هۆی کەمیی ژمارەیان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کەسی شەڕەنگێز دەبوا هەڵگری کۆمەڵیٚ ئاکاری دانسقە بوایە، وەکوچاونەترسی،و توانایی جەستە،و شارەزایی لەبەکارهێنانی چەك،و دڵڕەقی،و جەربەزەیی،و بەدەگمەن ئەم ئاکارانە لەکەسێکدا دەبوون،و ئەگەر لەکەسێکیشدا هەبوونایە، دەبوا بارودۆخی لەباری بۆبڕەخسایە—وەکو ئەوەی لەشەڕێکی خوێناوی لەگەڵ دوژمنەکانی یان لەگەڵ هێزەکانی میریدا، سەرکەوتنی بەدەست هێنابوایە—ئەوسا ناوبانگی دەردەکردو پێگەی لەنێوان کوڕانی گەڕەکدا، بەرز دەبووەوە،و ئەگەر سەرکەوتنەکانی بەردەوام بوونایە، ئەوا ورەی بەرز دەبووەوە،و ناوی دەکەوتە ناو لیستی شەڕئەنگێزە بەرزەکانەوە.

ئەگەر لەیەکێك لەگەڕەکەکاندا—بەو شێوەیەی ئاماژەمان بۆکرد—شەڕەنگێزێك هەڵبکەوتایە، ئەوا گەڕەك شانازییان پێوە دەکرد، چونکە شەوان لەدزان دەیپاراستن،و ئەگەر شەڕ لەگەڵ گەڕەکێکی دیکەدا بەرپا ببوایە، ئەم دەبوو بەپاڵەوانیان. کەسی شەڕەنگێز نیشانە بەجل‌و بەرگەکانیەوە دەبوو، بۆئەوەی بناسرێت، وەکو ئەوەی پارچەیەك لەسەری یان بەشەرواڵەکەیەوە بئاڵێنێت،و رۆیشتن و تێڕوانینی تایبەت بەخۆی هەبوو، وەی لەحاڵی ئەوەی رێزی لێنەگرتایە، یان بەباشتر وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەتەوە.



زۆربەی کوڕانی گەڕەك کەسی شەڕەنگێزی بەناوبانگیان بەدەستە بژێری خۆیان دەکرد،و ئارەزووی ئەوەیان دەکرد، رۆژیٚ لەرۆژان وەکو ئەویان لێبێت، کاتیٚ گوێیان لەباوك‌و کەسوکاریان دەبوو، باسیان لەلێهاتوویی کەسی شەڕەنگێزو کارە جەربەزەییەکانی دەکرد، حەزی ئەوەیان بەلاوە دروست دەبوو لاسایی بکەنەوە، تاوەکو ئەو ناوبانگە پەیدا بکەن. گرفتی ئەو کوڕانە ئەوەیە، کاتیٚ گەورە دەبن، رەنگە هەست بەناکامی بکەن، چونکە زۆربەیان ناتوانن بەو ئامانجە بگەن،و رەنگە هەندێکیان وەکو خەڵەفی کوڕی ئەمین، تووشی گرێی دەروونی ببن.

## خەڵەفی کوڕی ئەمین:

لەراستیدا، کەسایەتیی خەڵەفی کوڕی ئەمین نموونەی ژمارەیەکی زۆری عیراقییەکانی سەردەمی عوسمانییە،و تائیستایش لەو نموونانە هەیە، ئەگەرچی بەرەو نەمان‌و کزبوون دەچێت.

خەڵەفی کوڕی ئەمین لەبەغدا، لەکۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا ژیاوەو تائێستایش خەڵکی بەغدا قسە خۆشەکانی دەگێڕنەوەو چێژی لێوەردەگرن، دیارە پیاوێکی هیچ‌و پووچ‌و ترسنۆك بوو،و هیچ تواناییەکی ئەوەی تیادا نەبوو ببێت بەشەڕئەنگێزێکی ناودار، بەڵام حەزی دەکرد ببێت بەشەڕئەنگێزێك پەنجەی بۆدرێژ بکەن، دوو دەمانچەی گەورەی هەبوو، هەردووکیانی لەخۆی دەبەست، بۆئەوەی خۆی پێیانەوە هەڵبکێشێت، تەنیا لەکاتێکدا بەکاریانی دەبرد، کەمەترسی دەڕوییەوە،

ئەگەر شەوانە لەجێگەکەی خۆیدا، گوێی لەهاوارێك ببوایە، کەنیشانەی ئەوە بوایە دزە، لەماڵەوە خۆی قایم دەکرد، تادزەکە رایدەکرد، یان دەستگیر دەکرا، ئەوسا لەماڵ دەچووە دەرەوە،و هەردوو دەمانچەکەی بەڕووتی بەدەستەوە دەگرت،و فیشەکی دەتەقاندو هاواری دەکرد: کوا؟ پیشانمی بدەن ؟

قسەکانی لەگەڵ خەڵکیدا، پڕبوون لەداستانی کوشتن‌و بڕینی ماڵان‌و تاڵان‌و داپڵۆسین،و زۆربەیانی دەدایە پاڵ خۆی،و ئەگەر رووداوی کوشتن یان دزییەکی گەورە رووی بدایە، خۆی دەگەیانە کەرتی پۆلیس، لەخەڵکی دەپرسی، ئایا ناوی لەناو تاوانباراندایە،و لەوەوە ئەو پەندە ناودارە بەغدادییە پەیدا بووکە دەڵێت( ناوی خاڵتانیان نەهێنا؟!).

زۆرجار خۆی لەناو تاوانباراندا دادگایی دەکرد، یان بەئەنقەست لەبەردەم دادگادا، دانی بەتاوانێکدا دەنا، کەئەنجامی نەدابوو، هەر لەبەر ئەوەی بیخەنە بەندیخانەوە، بەڵام دادوەرەکە، لەرقاندا، لەهەموو کێشەیەکدا بەرەڵڵای دەکرد، ئەویش پێی ناخۆش دەبووو سەرزەنشتی دادوەری دەکردو بەستەمکاری دادەنا، چونکە (تاوانبارانی) بەرەڵڵا دەکردو (بێ تاوانانی) زیندانی دەکرد.

دەتوانین بڵێین کەزۆربەی خەڵکی، وەکو خەڵەڤ کوڕی ئەمین حەزیان لەشانازیی کردنی دەستکرد بەشەڕئەنگێزییەوە دەکرد، بەڵام تەنیا هەر ناوی کوڕی ئەمین لەناواندا بوو، چونکە زێدەرەویی بەشانازیکردنەکەیەوە کردبوو، تاببوە گاڵتەجاڕی خەڵکی. لەراستیدا، زۆربەی خەڵکی لەناخی دڵیانەوە ئەو شانازییە دەستکردەیان تیادایە، بەڵام دەیشارنەوەو دەرینابڕن، نەبادا بەگاڵتەجاڕی خەڵکی بن،و ئەگەر پەردە لەسەر دڵیان هەڵبماڵرێت، دەبینین زۆربەیان لەپشتی خەڵەڤ کوڕی ئەمینەوەن.



## جیاوازیی لەنێوان لاتەکان‌و شەڕئەنگێزەکاندا :

دکتۆر مستەفا جواد نەریتی شەڕئەنگێزان بۆ رەوشتی لات‌و کوڕانی ئازای گەڕەك دەگێڕنەوە، کەپەیدا بوون‌و لەبەغدا لەسەردەمی عەباسیدا ناویان دەرکرد.[11] لەراستیدا لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان نەریتی هەردوولادا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، جیاوازیی نێوانیان دەبینین، ئەویش ئەوەیە کەشەڕئەنگێزی مۆرکی تاکەکیی پێوەیە، لەکاتێکدا لاتەکان‌و ئەوانەی وەکو ئەوانن، دەکەونە ژێر رێکخستنێکی بەکۆمەڵەوە، کەهەندێ جار لێکچووی رێکخستنی سەربازانە،و هەندێ جاریش لەرێکخستنە پیشەییەکان–واتە سەندیکاکان– دەچوون.

پێموایە، لاتەکان‌و کەسانی لەوجۆرە، لەژینگەیەکی شارستانیدا پەروەردە دەبوون،و نوێنەرایەتیی شۆڕشی هەژاران دژی دەوڵەمەندانیان دەکرد، واتە بەهۆی جیاوازیی چینایەتییەوە پەیدا دەبوون، کەکۆمەڵگەی بەغدادی ئەو سەردەمە لێی بەدەر نەبوو، کەمیرو دەوڵەمەندەکان لەوپەڕی خۆشگوزەرانی،و هەژاران‌و کاسبکاران لەوپەری نەداری‌و دەست کورتیدا بوون.

بەغدا لەسەردەمی عەباسیدا، پایتەختی ئیمپراتۆرییەکی پان‌و بەرین بوو، پارەی باج‌و سەرانەو دەستکەوتی لەهەموو لایەکەوە بۆدەهات،

[11] ئیبن میعمار(کتاب الفتوة)–بەغدا1960–لاپەڕە98-99.

بۆیـە لەلایەکـەوە چـینێکی دەوڵەمەنـدی تیـادا دورسـت بـوو، و لەلایـەکی دیکـەوە هـەزاران خـەڵکی هـەژار روویـان تێکرد، تـاوەکو لەسـەر پاشماوەی مێزی خۆشگوزەرانەکاندا بژین.[12] بۆیە لەبەغدادا، کۆشکی گەورە دروست بوون، کەهـەموو ئەوشـتانەی تیـادا دەبینـران کەشارسـتانیی ئـەو سـەردەمە پێی گەیشتبوو، ئامرازەکانی خۆشیو ژیـانی کامـەرانی، هـەروەها چـەندین کۆڕو کۆمەڵی تیادا دروست بوو، کەبەهەژاریو کوێرەوەری ژیانیان بەسەر دەبرد، کەدەبوون بەمۆڵگەی تاقمی چەتەو لاتو شەڕئەنگێزان.

مێژوونووسـان دەربـارەی لاتو جـەردەو دزەکـان بۆمـان دەگێڕنـەوە، کـە لەکاتێکـدا رێگـەیان بەکاروانـەکان هەڵدەچنیو تالانیـان دەکـردن، بـەوە پاساویان دەهێنایەوە، گوایا مافی خۆیـان لـەزەکات وەردەگـرن، کـەبازرگانان نایدەن، دەڵێن ئـەوان هـەژارنو شایسـتەی ئـەوەن زەکـات لەدەوڵەمەنـدەکان بسێنن، چ پێیـان خـۆش بێـت یـان نـەبێت، چـونکە زەکـات لەدەوڵەمەنـدانی موسڵمانان وەردەگیرێت، و بەسەر هەژارانیاندا دابەش دەکرێت.[13]

ئەم بارە کۆمەڵایەتییە جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەو بارەی لەسەردەمی عوسمانیـدا عیراقـی تیـادا بـوو، تـەنیا خـەمی والیـی عوسمـانی ئـەوەبوو زۆرتـرین بـاجی دەسـت بکـەوێت، تـاوەکو بڕەبەشـی شـێری لـێ بنێرێـت بـۆ ئەسـتەنبول، ئـەوی دیکەیشـی بۆخـۆی بماشـێتەوە، بـەڵام ئەگـەر والـی بیویستایە کاری ئاوەدانی بکات، گەلێ جار دەستی دەدایە دروستکردنی مزگەوتو پەیمانگە ئایینییەکان، چونکە ئەویش وەکو زۆربەی خەڵکەکە، بڕوای بەپرەنسیپی(پاڕانەوە) هەبوو، و چەندە لەم دونیا مزگەوتی دروست بکردایە، ئەوا ژمارەی کۆشکەکانی لەبەهەشتدا زیاتر دەبوو.

میسـتەر ریچـی کونسـوڵی بـەناوبانگی بـەریتانیا، کـە لەناوچـەی باکووری عیراق، لەساڵی 1820دا گەڕاوە، دەڵێت: یەکێك لەمەترسییەکانی گەشت لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکدا، ئەوەیە کەگوندنشینەکان هـەموو کالایـەکی باشی خۆیان دەشارنەوە، نەبادا بـەتالان ببرێـت، بەتایبـەتی ئەگـەر زانییـان، لەناو ئەو کۆمەڵەدا، فەرمانبەرانی میری هـەبن.[14] ئەوەی سـەرنجی میسـتەر ریچـی راکێشـا، لـەو رۆژانـەدا، سـەرنجی گـەلێ لەگەڕیـدە بیانییـەکانی لەعیراقدا راکێشابوو، بۆیەخەڵکی لەسەر ئەوە راهاتبوون کە لەبەرامبەر هەر دەروویـەکی خێـر کـە لێیـان بکرایەتـەوە، رەشـبین بـبن، و نیـاری سـامانیان بشارنەوە، تاوەکو کەس پێی نەزانێت، بۆ ئەوەی لەلایـەن دەسـەلاتدارانەوە دەستی بەسەردا نەگیرێت، یـان لەلایـەن دزو جـەردەوە نـەدزرێت. هـەر ئەمـە وایکـرد جیـاوازیی چینایەتی لـەنێوان خەڵکیـدا، روونو ئاشـکرا نـەبێت، واتە وەکو سەردەمی عەباسی نەبوو.

[12] کتێبی هەزارو یەك شەو، باشترین سەرچاوەیە بۆوێناکردنی ئەو بارە کۆمەڵایەتییە کەبەغدای تیادا بوو. خوێنەر دەتوانێت، لەپشتی دێڕەکانی ئەم کتێبەوە، هەست بەو زۆنە بڵاوەی نێوان خۆشگوزەرانانو زەحمەتکێشان بکات.

[13] جورجی زێدان(تأریخ التمدن الاسلامي)–قاهیرە1927–بەرگی چوارەم، لاپەڕە184.

[14] کلۆدیوس جیمس ریچ(رحلة ریج في العراق عام1820)–وەرگێڕانی بەهادین نووری – بەغدا1951–لاپەڕە 7.

## ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵ:

پێویستە لەم بۆنەیەدا، ئاماژە بەوە بکەین کەهۆشیاریی کۆمەڵ لەسەردەمی عوسمانیدا، زیاتر لەهۆشیاریی چینایەتی باوبوو،و مەبەستمان لەوە ئەوەیە کەخەڵکی زیاتر لەدەمارگیریی بۆ چینەکەیان، دەمارگیرییان بۆعەشیرەت یان شوێنی دانیشتنیان هەبوو، کوڕانی هەر گەڕەکێك لەشارەکاندا، پشتگیرییان لەیەکدی دەکردو لەنێوان خۆیاندا هاوکاربوون، ئەگەرچی لەرووی ئاستی ئابوورییەوە جیاوازییان هەبوایە، دەوڵەمەندەکانیان ئامادە بوون، دیوەخانەکانیان بۆ خەڵکی گەڕەك ئاوەڵا بکەن، بەبێ ئەوەی جیاوازیی لەنێوانیاندا بکەن،و لەبۆنە جۆراوجۆرەکاندا، داوەتی دەکردن‌و دیاریی بەسەریاندا دابەش دەکرد، ئەوانیش لەکاتی تەنگانەدا، یارمەتییان دەداو لەشەڕو دوژمنایەتییەکاندا، پشتییان دەگرت.

ئەمەیش ، لەکۆمەڵگە گوندنشین‌و سارانشینەکاندا، زیاتر لەشارەکان دیار بوو، دەبینین سەرەك خێڵ‌خۆی لەکوڕانی خێڵ بەگەورەتر نازانێت‌و لەجل‌و بەرگ‌و خۆراك‌و خانوبەرەدا، هێندە لەوان جیانەدەکرایەوە، هەردەم لەبیری ئەوەدابووە، لەخزمەتیاندا بێت‌و کێشەو گرفتەکانیان چارەسەر بکات،و پێداویستییەکانیان دەستەبەر بکات، بۆیە دەبینین ئەوانیش شانازییان پێوە دەکرد،و پشتیان دەگرت،و ئەگەر سووکایەتی بەسەرۆکەکەیان بکرایە توڕە دەبوون،و ئەگەر سەرۆکەکەیان



ئاڵای شەڕکردنی بەرز بکردایەتەوە، لەدەوری کۆدەبوونەوەو بەبێ سێ‌و دووو خۆدزینەوە، لەگەڵیدا بەشداریی شەڕیان دەکرد.

دەبێ لەم بارەوە، ئەوە فەرامۆش نەکەین کەهۆشیاریی کۆمەڵ یەکێکە لەدیاردەکانی زاڵبوونی تەوژمی خێڵەکایەتی بەسەر عیراقدا. لەسەردەمی عوسمانیدا، خەڵکی دەست بەرداری هۆشیاریی کۆمەڵ نابن بۆئەوەی هۆشیاریی چینایەتی لەبری دابنێن، مەگەر کاتێ باری شارستانییان بەرز بێتەوە، ئەوسا هەست بەوە دەکەن کەپارە دەماری ژیانە،و تەنیا ئەوە پێگەی مرۆۋ بەرز یان نزم دەکاتەوە. بەڵام لەخێڵەکایەتیدا–یان لەو کۆمەڵگەیەی کەتەوژمی خێڵەکایەتی بەسەردا زاڵە– خەڵکی ناتوانن پارەو سامان پێوانە بکەن، تەنیا بەو ئەندازەیە نەبێت کەپشتی دەمارگیریی کۆمەڵیان بگرێت‌و پێگەیان لەناویدا بەرز بکاتەوە، و جگە لەوە هیچ نرخێکی گەورەی نییە. واتە خوازیاری سامانن، نەك بۆئەوەی گوزەرانیان باش بکات، بەڵکو بۆئەوەی پیاوەتی پێوە بکەن. ئەم تێڕوانینە بۆپارەو سامان، بەروونی بەلای شەڕئەنگێزانەوە دیارە، پارە بەلای ئەوانەوە ئامرازە نەك ئامانج،و گەلێ جار بڕینی ماڵان‌و تاڵان کردنیان بەدیاردەی ئازایی‌و پیاوەتی لێکدەدایەوە، بۆیە ئەو پیاوانەیان بە(پیاوی شەو) ناودەبرد، گوایا بەشەو دەردەچوون بۆدزی، کارێکە پێویستی بەئازایی‌و متمانە بەخۆو چاوقایمیی هەیە. لێرەوە هەندێ لەپیاوماقوڵانی شارەکان، شەوانە بۆبڕینی ماڵان دەردەچوون، بۆئەوەی لەو ڕێگەیەوە، ئابڕووی خۆیان بپارێزن‌و پێگەی کۆمەڵایەتییان بەرز بکەنەوە.

تائێستایش لەعیراقدا گەلێ داستانی لەو جۆرە، دەماودەم دەگێڕنەوە، وەکو بەڵگە بۆ ڕەوشتی بەرزی ڕۆژانی ڕابردوویان، کەهەموویان باسیان لەکنەکردنی شەڕئەنگێزان دەکرد، وەکو ئەوەی مشوری نەریتەکانی پیاوەتییان خواردبێت، زیاتر لەوەی خولیای دزین و زەوتکردنی سامان بووبێتن. یەکێك لەو داستانانەی لەکوڕانی نەوەی ڕابردوو دەمبیست، ئەوەیە شەوێك تاقمێ لەشەڕئەنگێزانماڵێکیان بڕی و کەوتنە ئەوەی قاپ و قاچاغ و کەلوپەل کۆبکەنەوە، و بیکەن بەبارێك تاوەکو هەڵگرتنی ئاسان بێت، –بەپێی ڕێورەسمی دزان لەو ڕۆژگارانەدا– ژنی ماڵەکە هەستیان پێدەکات و بەترسەوە کوڕەکەی لەخەو هەڵدەسێنێت و پێی دەڵێت:(هەستە کوڕم، یارمەتی خاڵوانت بدە) دیارە ژنە بەتوانجەوە ئەو قسەیەی کردووە، بەڵام دزەکان قسەکەیان بەجیددی وەرگرتووە و کەلوپەلەکەیان بەجێ هێشتووە، چونکە ئیتر ئەو ژنەیان بەخوشکی خۆیان زانیوە، و لەنەریتی ئەواندا، مۆڵەت بەکەسێك نەدرابوو ماڵی خوشك و خوشکەزاکانی خۆی ببڕێت، بەڵکە دەبوا بیانپارێزێت، نەك دزییان لێبکات!

دەکرێ ئەم داستانە وەکو پێوەرێك بۆ ڕەوشتی خەڵکی لەو سەردەمەدا ڕەچاو بکەین. ئێمە لێرەدا ئەوەمان بەلاوە گرنگ نییە، کەبەراستی ئەم داستانە ڕوویداوە یان نەء، گرنگ ئەوەیە خەڵکی بەزۆریی گێڕاویانەتەوە، و ئەو پیاوەتی و جوامێرییانەی ناو داستانەکە سەرنجی ڕاکێشاون، و ئەمەیش بەڵگەیە بۆ بەها کۆمەڵایەتییەکانیان.



## داستانی حەسەن کبریت:

ڕەنگە لەهەندێ ڕووەوە، داستانەکەی حەسەن کبریت بەکەڵکی ئەوە بێت بکرێت بەنموونەیەك بۆبەها کۆمەڵایەتییەکانی باو لەو سەردەمەدا. ئەو پیاوە لەشەڕئەنگێزانی کازمییە بوو، لەکۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی و سەرەتای داگیرکاریی بەریتانیادا دەژیا، ئەو داستانانەی خەڵکی سەبارەت بەو دەیگێڕنەوە، پیاوێکی خوێنڕێژ بووە، لەوجۆرانەی کەپیاو دەکوژن و دوای جەنازەکەی دەکەون. بەپێی بەڵگەکان، ئەو تووشی نەخۆشیی سادیزم بووبوو، چونکە چێژی لەکوشتن و خوێنڕێژیوەردەگرت. دەگێڕنەوە کاتێ لەگەڵ موجاهیدەکان لەشەڕی شوعێبە، لەکاتی شەڕی یەکەمیی جیهانیدا بەشداری دەکات، تەنیا سەربازانی دوژمنی نەدەکوشت، بەڵکو سەریانی دەبڕی و کەللە سەرەکانیانی دەهێنا بۆ ئەو پیاوە ئایینییانەی لەگەڵ موجاهیدیندا بوون، و ئەوانیش بۆئەو کارانەی سەرزەنشتیان دەکرد، بۆئەوەی دەستی لێهەڵگرێت، بەڵام بێ سوود بوو.

لەکۆتایی تەمەنیدا، پیاوێك[15] دەربارەی ژمارەی قوربانییەکانی، و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خودا لەو دونیا لێی دەپرسێت، وەڵامەکەی ئەوە بووە کەژمارەیەکی زۆری لەخەڵکی کوشتووە، بەڵام

[15] پیاوێك ئەمەی بۆگێڕامەوە کەمتمانەی تەواوم پێی هەیە و حەسەن کبریتی لەسەردەمی پیریدا ناسیوە، کاتێ دەستی لەشەڕ ئەنگێزی هەڵگرتووە.

هیوایەکی بەوە هەیە، خودا لەبەر خاتری فاتیمەی زەهرای کچی پێغەمبەر، لەگوناهەکانی خۆش ببێت، دواتر داستانەکەی بۆدەگێڕێتەوە کەهیوادار بووە خودا لێی خۆش ببێت، گوایا شەوێك لەگەڵ هاوڕێکانی لەشەڕئەنگێزەکانی بەغدا، دەیانەوێت ماڵی پیاوێکی دەوڵەمەند ببڕن، دوای ئەوەی دزییەکەی ئەنجام دەدات دەگەڕێتەوە بۆکازمییە، لەرێگەی گۆڕستانی شێخ مەعرووفەوە، و ئەوسا ئەو گۆڕستانە لەئاوەدانییەوە دوور بووە، و لەنێوان گۆڕەکانەوە، گوێی لەدەنگی کچێك دەبێت لەفاتیمەی زەهرا دەپاڕێتەوە، و هەست بەوە دەکات کەپیاوێکی چڵێت دەیەوێت دەستدرێژی بکاتە سەری، و پارانەوەکانی بێ سوودە لەگەڵ پیاوەکەدا. ئەوسا حەسەن کبریت بڕیار دەدات ناوێکی دیکە بخاتە سەر لیستی قوربانیانی(لەپێناوی فاتیمەی زەهرا)دا، خۆی دەگەیەنێتە پیاوەکەو یەکسەر دەیکوژێت، و کچەکە لەدەستی رزگار دەکات...

گومان لەوەدا نییە، کاتێ حەسەن کبریت دەمرێت، متمانەی تەواوی بەوە هەبووە، کەئەو پاڕانەوەیە، لەودونیا بەدادی دەگات و دەچێتە بەهەشتەوە. هێشتا لەعیراقدا کەسانێکی زۆری وەکو ئەو هەن، کەدەگەڕێنەوە سەر رەوشتی سەردەمی جاهیلی و دزی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن و دەکوژن، دواتر کارێك ئەنجام دەدەن، و بەتەمای ئەوەن یەکێك لەنزیکان لەخوداوە بۆی بپاڕێتەوە، و ئەویش لەهەموو گوناهەکانی خۆش ببێت-(خوداوەند بەخشندەو میهرەبانە!).

لەسەر ئەوە سەرزەنشت ناکرێن، چونکە ئەوان ناچار دەبن، بەهۆی بارودۆخی شکێنەریانەوە. ئەوان لەلایەکەوە لەسەر رەوشتی جاهیلی



گەورەبوون و لەسەری راهاتوون، و ناتوانن خۆیانی لێ دوور بگرن، و لەلایەکی دیکەوە لەخوداو لەئازاری دۆزەخ دەترسن، و دەبێ رێگەیەك بدۆزنەوە بۆئەوەی لەو کێشە گەورەیە رزگاریان بکات. پرەنسیپی پاڕانەوە- هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد- نیازێکی دەروونییان تیادا پڕ دەکاتەوە، و ئەگەر ئەوە نەبوایە هەستیان بەون بوون دەکرد!

# بەشی یەکەم

## پێکهاتنی دەوڵەتی عوسمانیو داگیرکردنی عیراق

لەکۆتایی سەدەی سیانزەیەمی زاینیی بەرامبەر بەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا، دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا، و لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی، لەساڵی 1534ی زایین- واتە دوای تێپەڕبوونی دوو سەدە بەسەر دامەزراندنیدا-داگیریان کرد. لەو ماوە دوورو درێژەدا، دەوڵەتی ناوبراو بەچەندین رووداوو ئەزموونی ئایینیو نائایینیدا رەتبوو، وای لێکرد مۆرکێکی تایبەت بەخۆی هەبێت، تا لەدەوڵەتانی کۆنو نوێ جیابکرێتەوە. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم لەهەندێ رووەوە، ئەو ماوەیە تاوتوێ بکەم، کەپەیوەندییان بەم کتێبەوە هەیە، و سەرەتا دەست دەکەم بە تاوتوێ کردنی پێکهاتنی سوپای ئینکشاری، کەبەیەکێك لەتایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەژمار دەکرێت.



## پێکهێنانی سوپای ئینکشاری:

دەوڵەتی عوسمانی لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، بریتی بوو لەهۆزێکی تورکمان، کە لەکەناری رۆژهەڵاتی دەریای مەڕمەڕە، لەباشووری قوستەنتەنییەی پایتەختی دەوڵەتی بیزەنتینیدا دەژیان، و ئەم هۆزە هەلی لاوازبوونی دەوڵەتی بیزەنتینی قۆستەوە، و بەناوی ئیسلامو جیهاد لەرێگەی خودادا پەلاماری دەدا، ئەوە سەرەتای نەشونمای دەوڵەتی عوسمانی، و پەرەسەندنی بوو بەرەو وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات.

لەساڵی 1326ی زاییندا، سوڵتان ئۆرخان دەسەڵاتی دەوڵەتی بەدەستەوە گرت، کەسوپای ئینکشاری لەسەردەمی ئەودا دامەزرا، و ئەم سوپایە لەسەر بنەمای رفاندنی منداڵان لەوڵاتە مەسیحییەکانی دراوسێ بونیاتنرا، بەوەی ئەوانە وڵاتانی خوانەناس بوون، کەرێگەدرابوو بەوەی تاڵان بکرێن چ تاڵانەکە مرۆڤ بێت یان شتومەك، عوسمانییەکان جاروبار پەلاماری ناوچەکانی ئەوروپایان دەداو هەرجارە ژمارەیەکی زۆر لەمنداڵانیان لەگەڵ خۆیان دەهێناوناویان دەنان(دیوشرمە)-واتە رفێنراوەکان- لەدامەزراوە تایبەتەکاندا کەوەکو قوتابخانە ناوخۆییەکان وابوون، دادەنران بۆئەوەی پەروەردەیەکی ئیسلامی سەربازی بکرێن.

منداڵی رفێنراو کە بەو شێوەیە پەروەردە دەکرا، پەیوەندیی بەدایكو باوکییەوە دەپچڕا، جگەلەدڵسۆزیی بۆ ئایینو دەوڵەتو شەڕکردن لەپێناویاندا، شتێکی دیکەی نەدەزانی، هەر لەمنداڵییەوە بەبیرۆکەی

جیهاد جۆش دەكرا، و كاتیٚ بۆشەڕ ڕەوانە دەكرا، بڕوای بەوە هەبوو كەیان سەردەكەویٚت یان شەهید دەبیٚت–واتەهەر دەبیٚ یەكیٚك لەو دوو باشەیەی دەست بكەویٚت–سەركەوتن یان بەهەشت.[16]

هاوكات لەگەڵ دامەزراندنی سوپای ئینكشاریدا، ئەوەبوو سۆفییەكی بەرەچەڵەك عەلەوی لەخۆراسانەوە هات بۆتوركیا، ناوی حاجی محەممەد بەكتاش وەلی بوو، لەگوندیٚكدا نیشتەجیٚ بوو كەئەمڕۆ ناوی خۆی هەڵگرتووە، دەكەویٚتە 180 كیلۆمەتر لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنكارا. ئەم پیاوە لەناوچەكانی دەوروبەردا ناوبانگیٚكی بەرزی دەركرد، و خەڵكی بەمەبەستی زیارەت كردنی ڕوویان تیٚدەكرد. كاتیٚ سوڵتان ئۆرخان بەمەی زانی، ویستی خۆی و سوپا نویٚكەی لەبەرەكەتی بیٚ بەریی نەبیٚت، بۆیە بۆخۆی ڕووی تیٚكرد لەگەڵ تاقمیٚك لەسوپاكەی، حاجی بەكتاشیش ئەوەی پیٚویست بوو بیكات، ئەنجامی دا، و دەستی خستە سەر یەكیٚك لەسەربازەكان، پارچەیەكی لەپاڵتۆكەی بڕی و ئاڵاندی بەسەری سەربازەكەوە، دواتر ئاڵایەكی سووری پیٚدان، كەمانگ و شمشیٚریٚكی دووفلیقانەی تیادا بوو، لەخودا پاڕایەوە كە ڕوویان سپی بكات و شمشیٚرەكانیان تیژبن و لەهەر شەڕیٚكدا سەركەوتووبن.[17] حاجی بەكتاش ئەو سوپایەی ناونا سوپای( یەنی جەری) واتە سوپای نویٚ، و ئەو ناوەبوو كەدواتر بوو بە ئاڵای سوپا ودواتر لەزمانی عەرەبیدا گۆڕدراو بوو بە(ئینكشاری).[18]

---

[16] ساتیع حوسەری(البلاد العربية والدولة العثمانية)–بەیرووت1960–لاپەڕە16–17.

[17] ئەحمەد سرری دەدە بابا (الرسالة الأحمدية في تأريخ الطريقة البكتاشية)–قاهیرە1959–لاپەڕە 15.

[18] محەممەد فەرید(تأريخ الدولة العلية العثمانية)–قاهیرە1912–ل42.



ئیتر لەو كاتەوە، سوپای ئینكشاری پەیوەندییەكی توندوتۆڵی بەشیٚوازی بەكتاشییەوە پەیدا كرد، بەجۆریٚ كەسەربازەكانی حاجی بەكتاشیان كرد بەسومبلی خۆیان، و خەڵكی بەو سوپایەیان دەگوت(كوڕانی حاجی بەكتاش).[19] و لەهەر كەتیبەیەك لەسوپادا، شیٚخیٚكی بەكتاشی دادەنراو پیٚیان دەگوت(بابا) و لەگەڵ سەربازەكاندا دەمایەوە، بۆئەوەی ڕیٚنماییان بكات و فیٚری ڕیٚورەسم و سرووتەكانیان بكات، و دەبوا ئەو شیٚخە، شمشیٚر بەدەستەوە، لەكاتی شەڕدا پیٚش كەتیبەكە بكەوتایە.[20] لیٚرەوە سەربازەكان لەو بڕوایەدابوون كەهەر سەركەوتنیٚك كەبەدەستی دەهیٚنن، دەبیٚ لەبەرەكەتی حاجی بەكتاش بیٚت.

ئەوەی سەرنج ڕاكیٚشە لەسرووتە بەكتاشییەكاندا، كەسوپای ئینكشاری پیٚوەی پابەند بوون، ئەوەیە كەبایەخیٚكی زۆریان بەچیٚشت لیٚنان و ئامادە كردنی خۆراك دەدا، بۆنموونە ئەوان مەنجەڵی چیٚشت لیٚنانیان پیرۆز دەكرد، و تەنانەت لەكاتی شەڕیشدا لیٚی دوور نەدەكەوتنەوە، و تامردن بەرگرییان لیٚدەكرد، چونكە ئەوان لەدەستدانی مەنجەڵیان لەكاتی شەڕدا، بەگەورەترین سووكایەتی دەزانی كەپیٚیان بكریٚت، و ئەگەر بیانویستایە سەرپیٚچیی لەفرمانی سەرۆكەكانیان بكەن، لەبەردەم ماڵەكانیاندا، مەنجەڵەكانیان سەرەونخون دەكرد. ویەكیٚك لەدیمەنەكانی بایەخدانیان بەچیٚشت لیٚنان ئەوەیە كە بەسەرۆكە گەورەكەیان دەڵیٚن(جۆربچی باشی)–واتە چیٚشتكەری شۆربا) و بەو

---

19-John K.Birge(The Bektashi Order of Dervishes)-Bristol 1937-p.74.

[20] ئەحمەد سرری دەدە بابا( سەرچاوەی پیٚشوو)لاپەڕە15.

ئەفسەرانەی لەپلەی دووەمدا دەهاتن دەگوت(ئاشچی باشی)و (عەشی باشی)و (سەقا باشی)و (ئودە باشی). و دەڵێن هۆکارەکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەئینکشارییەکان خۆیان بە بخۆری سەر سفرەی سوڵتان و حەساوەی ژێر سایەی ئەوان و کوڕەکانی دەزانی. و ئێستا لەبەغدا خێزانێکی بەناوبانگ هەیە بەناوی(آل الجوربجي) –بنەماڵەی شۆرباچی– کە لەپاشماوەکانی ئەوانن.

## بیروباوەڕی بەکتاشییەکان:

دیارە ڕێبازی بەکتاشی ئاوێتەیەکە لەسۆفیگەری و شیعە، ئەوان بڕوایەکی توندو تۆڵیان بەدوانزە ئیمامەکە هەیە، و تێبینی ئەوە دەکرێت کەعەلی کوڕی ئەبو تالیب چەقی پیرۆزکردنە بەلایانەوە، ئەوان بەنموونەی هەرە بەرزی مرۆڤی دادەنێن، کەراستیی خوداوەندیی تیادا دەردەکەوێت، هەروەها بڕوایان بە لەبەرچاو ونبوونی ئیمامی دوانزەیەم هەیەو چاوەڕوانی دەرکەوتنی دەکەن، و(ناد عليا مظهر العجائب) یەکێکە لەدوعا بەناوبانگەکانیان، و ئەوان لەتەنگانەدا هاوار لەو دەکەن، بەو بڕوایەی کەعەلی چۆن لەشەڕی ئوحددا فریای پێغەمبەر کەوت، ئاوایش فریای ئەوان دەکەوێت، ئەوان پێیان وایە کاتێ پێغەمبەر لەو شەڕەدا بریندار بوو، عەلی بەفرمانی جبرەئیل دوعای بەسەردا خوێندو چاك بووەوە.[21]

بەکتاشییەکان پابەندن بە نیاری(ویلایەت و خۆپاککردنەوە) کە بەلای شیعەکانەوە هەیە، واتە ویلایەتی خێزانی پێغەمبەرو خۆپاککردنەوە

21-John Birge(op.cit.)P.132-141-



لەدوژمنان–بەڵام ئەو پرسیارەی لەم بارەوە، ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە: ئایا ئەوان دان بەسێ جێنشینەکەدا دەنێن کەبەر لەعەلی کاروباریان بەدەستەوە بوو، یان خۆیانی لێپاکدەکەنەوە؟ لەراستیدا، ئەم لایەنە لەبیروباوەڕی بەکتاشییەکاندا، تەمومژاوییە، و بەئاسانی یەکلایی نابێتەوە.

دکتۆر بێرگ کەپسپۆر بوو لەتوێژینەوەی ڕێبازی بەکتاشیدا، پێی وایە ئەوان سێ جێنشینەکە بەدوژمنی خێزانی پێغەمبەر دەزانن، بۆیە خۆیانیان لێ بێ بەری دەکەن،[22] بەڵام دواتر داستانێك لەسەر یەکێك لەبەکتاشییەکان دەگێڕێتەوە، کەبەپێچەوانەی رایەکەیەوەیەتی، و کورتەی داستانەکە ئەوەیە کەعەلی ویستویەتی لەپێغەمبەر بپرسێت، سەبارەت بەجێنشینانی دوای خۆی، بەڵام شەرمی کردووە ئەو پرسیارەی لێبکات، و داوا لەموعاویە دەکات ئەو پرسیارەی ئاراستە بکات، و کاتێ موعاویە ئەو پرسیارە لەپێغەمبەر دەکات، ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت کە جێنشینانی دوای خۆی ئەبوبەکرو عومەرو دواتر عوسمانە، و کاتێ پێغەمبەر دەگاتە سەر چوارەم جێنشین، ناوی ناهێنێت، بەڵکو گوتی ئەو کەسەیە کەپرسیارەکەی کرد، چونکە پێغەمبەر دەیزانی کەعەلی خاوەنی پرسیارەکەیە، بەڵام موعاویە دەیگوت کەخۆی جێنشینی چوارەمە، بەوەی کە ئەو پرسیارەکەی ئاڕاستەی پێغەمبەر کردووە.[23]

ئەم داستانە ئەوە دەگەیەنێت کەبیروباوەڕی بەکتاشییەکان لەجێنشینیدا نزیکە لەبیروبۆچوونی سوننییەکانەوە. و لەکتێبی(الرسالة الأحمدية) کەئەحمەد سرری دەدە بابا–گەورە شێخی بەکتاشییەکان لەم

22-Ibid, P.159 &270
Ibid,P.140.[23]

سەردەمەدا– داینـاوە، دەڵێت:موریدی بەکتاشی دەبێ سوننی بێت.[24] ئەمەیش بەو مانایەیە کەبەکتاشییەکان دان بەسێ جێنشینەکەدا دەنێن و پیرۆزیان دەکەن، و ئیتر نازانین شێخ ئەوەی بەبڕواوە یان لەترساندا گوتووە؟!

## بۆشایی دەسەڵات:

لەراستیدا، سوپای ئینکشاری رۆڵێکی گەلێ گەورەی هەبوو، لەفراوانکردنی دەوڵەتی عوسمانی و گەشەدان بەهێزەکەی. دەوڵەت لەسایەی ئەم سوپایە، لەکیشوەری ئەوروپادا، سەرکەوتنی بەردەوامی بەدەست دەهێنا. دەتوانین بڵێین تا کردە داگیرکارییەکانی فراوانتر دەبوو، زیاتر بواری بۆدەرەخسا، منداڵە مەسیحییەکان بفرێنێت، و بەمەیش ژمارەی سوپاکەی زۆرتر دەبوو، کەئەویش لەفراوان بوونی قەڵەمڕەوی دەوڵەتدا رۆڵی هەبوو.[25] سەرەرای ئەوەی کەئەو سەرکەوتنانەی دەوڵەتی عوسمانی لەولاتی بێ بڕواییدا–بەپێی دەربڕینی ئەو سەردەمە–لەهەموو ولاتانی موسڵماندا، سەرنجی موسڵمانانی بۆلای خۆی راکێشا، و خۆبەخشانە دەچوونە ریزییەوە. هەر سەرکەوتنێك پێگەی لەبەرچاو

[24] ئەحمەد سرری دەدە بابا(سەرچاوەی پێشوو)–لاپەرە15.

[25] ساتیع حوسەری( سەرچاوەی پێشوو)لاپەرە18.



موسڵمانان بەرزتر دەکردەوەو تەوژمی خۆبەخشەکان بەمەبەستی خزمەتکردن تیایدا بەهێزتر دەبوو.[26]

کردە داگیرکارییەکانی عوسمانی تەنیا بۆماوەیەکی کورت وەستا–کەمێژوونووسانی عوسمانی ناوی(بۆشایی دەسەلات)یان لێنا و، ماوەی نزیکەی دەساڵ درێژەی کێشا–کەئەمەیش بەهۆی هێرشی تەتەرەکان بەسەرکردایەتیی تەیمور لەنگەوە بۆسەر ولاتی عوسمانی بوو، لەساڵی1402 زایندا.

بایەزیدی یەکەم لەو سەردەمەدا سوڵتانی عوسمانی بوو، و لەراستیدا پاشایەکی بەدەسەلات بووو بەقارەمانی لەبەرامبەر تەیمور لەنگدا شەڕی کردو بەدیل گیرا، و دواتر بەدیلی کۆچی دوایی کرد. دوای ئەوە دەوڵەتی عوسمانی بەسەر چەند ئیمارەتێکی بچووکدا دابەش بوو.

دوای مردنی تەیمور لەنگ و هەرەسهێنانی دەوڵەتەکەی، یەکێك لەکوڕەکانی بایەزید توانی ئەو یەکڕیزییەی جاران بۆ دەوڵەتی عوسمانی بگێڕێتەوە–دوای چەندین شەڕی ناوخۆ دژی براکانی و کەسانیدیکە–ئەم پیاوە لەمێژووی عوسمانیدا بەناوی سوڵتان محەممەد چەلەبی غازی ناسراو بوو. ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کەلەسەردەمی ئەم سوڵتانەدا، بزاوتێکی کۆمەلایەتیی سەرسووڕهێنەر سەریهەڵدا، کەپێکەوە هەڵگری باوەڕی سۆفیگەری و بیروباوەڕی مەهدی و سۆشیالیستی بوو.

[26] سەرچاوەی پێشوو–لاپەرە16.

سەرکردەی ئەم بزاوتە پیاوێکی ناودار بوو لەپیاوانی ئایینی، بەناوی بەدرەدین مەحموود، و بانگەوازی بۆسۆشیالیستی لەسامانو یەکسانی لەنێوان موسڵمانانو مەسیحییەکاندا دەکرد، و جەماوەرێکی زۆر لەجووتیاران دوای کەوتن، کە بەدەست ستەمکاریی دەرەبەگەکانەوە دەیانناڵاند،[27] وهەوادارانی بەسەرکردایەتی دەروێشەکان لەسەرانسەری وڵاتدا بڵاوبوونەوەو تەراتێنیان دەکرد، وتوانیان ئەو سوپایە بشکێنن کەسوڵتان ناردییە سەریانو سەرکردەکەی بکوژن، ئەمەیش سوڵتانی ناچار کرد سوپایەکی گەورەتریان بۆبنێرێت، بەسەرکردایەتی سەرەك وەزیرانەکەی. لەشوێنێکی نزیك ئەزمیر کەوتنە شەڕەوەو توانی بیانشکێنێت[28]...بەمەیش یەکڕیزیی ئەو بزاوتە لەبەر یەك هەڵوەشایەوەو دوای ماوەیەك خەڵکی لەبیریان کرد.

## رزگارکردنی قوستەنتنییە :

27-Carl Brockelmann(History of the Islamic Peoples)-Translated by Perlamann-Cornwall1947-P.274.

[28] محەممەد فەرید(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە53.



لەسەدەکانی ناوەراستدا، شاری قوستەنتنییە یەکێك بوو لەشارە گەورەو جوانەکانی جیهان، و دەکرێ بڵێین پاریسی سەدەکانی ناوەراست بوو. نزیکەی هەزار ساڵ پایتەختی ئیمپراتۆریی بیزەنتینی بوو، و موسوڵمانەکان لەسەردەمی ئومەوییەکاندا، چەندین جار هەوڵی گرتنیان دا، و هەروەها عوسمانییەکانیش هەوڵیان دا، بەڵام بێ سوود بوو. چونکە بارێکی جوگرافیی ئەوتۆی هەیە، کە بەئاسانی ناگیرێت، و ئاو لەسێ لاوە دەوری داوە، و لای چوارەم کەبەشی رۆژئاوایەتی، بەستراوە بەوشکانیی ئەوروپاوەو بەدیوارێکی سەخت پەرژین کراوە.

سوڵتانە عوسمانییەکان بایەخێکی زۆریان بەگرتنی قوستەنتنییە دەدا، نەخوازەلا دوای ئەوەی لەوشکانی ئەوروپادا شوێنی زۆریان داگیر کرد، و ئەوسا قوستەنتنییە کەوتە نێوان هەردوو بەشی رۆژهەڵاتو بەشی رۆژئاوای دەوڵەتی عوسمانییەوە. و کاتێ پایتەختی دەوڵەت گوازرایەوە بۆ ئەدەرنە لەرۆژئاوای قوستەنتنییە، سوڵتانەکان زیاتر منەی داگیرکردنیان دەکرد، و لەهەموویان زیاتر سوڵتان محەممەدی دووەم بوو، کە لەساڵی 1451دا دەسەڵاتی بەدەستەوەگرت، و نازناوی (فاتح) بەو درا، چونکە توانی قوستەنتنییە داگیر بکات.

لەراستیدا، ئەوهەوڵو دووربینییەی سوڵتان محەممەد بۆ گرتنی قوستەنتنییە کارێکی گرنگ بوو، نزیکەی 250000سەربازی لەبەردەم دیواری رۆژئاوایدا کۆکردەوە، و 180 کەشتی لەئاوەکانی دەوروبەری ئامادە کرد. و پیاوێکی شارەزای لەبواری دروستکردنی تۆپ دامەزراند، و

ئەویش چەندین تۆپی گەورەی بۆ دروست کرد کەدەیانتوانی بەردی گەورە هەڵبدەن، بەکێشی 12 قنتار، بۆدووریی یەك میل. و ئەم تۆپانە شاری قوستەنتنییەیان وێران کردو ترسییان خستە دڵی دانیشتوانییەوە.

لەو کارە بەجێیانەی سوڵتان محەممەد لەو سەردەمەدا ئەنجامی دا، ئەوەیە کەتوانی لەرێگەی وشکانییەوە،

کەشتییەکانی لەئاوەکانی بۆسفۆرەوە بگوێزێتەوە بۆ ناو ئەو دوورگەیەی بە(شاخی زێڕین) ناسراوە، بۆئەوەی خۆی بپارێزێت لەو زنجیرە گەورانەی بیزنەتینییەکان لەگەرووی دوورگەکەدا دایاننابوو، بۆیە فرمانی دا زەمینە خۆش بکەن، لەو شوێنەی کەشتییەکانی لێوە دەگوێزرێنەوە، کەدرێژاییەکەی کەمتر لەپێنج میل نەدەبوو، دواتر پارچە تەختەی گەورە لەسەر زەوییەکە دانران و چەور کران، بۆئەوەی بەئاسانی کەشتییەکانی لەسەر بگوێزنەوە. تەنیا لەیەك شەودا، توانی نزیکەی حەفتا کەشتی بگوێزێتەوە، و کاتێ کەشتییەکان گەیەنرانە ناو ئاوی دوورگەکە، شارەکەیان تۆپباران کرد، و ئەمەیش ترسێکی گەورەی خستە دڵی دانیشتوانەوە، چونکە ئەوان لەو بڕوایەدا نەبوون کەلەو ناوچەیەوە تۆپباران بکرێن، و هەر ئەمەیش یەکێك لەو هۆکارە کاریگەرانە بوو کەورەی پێبەردان.

ژمارەیەکی زۆر لەدەروێش و سەیدو پیاوانی ئایینی لەناو سوپای عوسمانیدا بوون، بەمەبەستی ورە بەرزکردنەوەی سەربازەکانی. و سوڵتان جارچیی نارد بۆناو سەربازەکان و دەیانگوت: دوای سێ رۆژ لەداگیرکردنی شارەکە، بۆیان چۆڵ دەکەین بۆئەوەی خۆیان چۆنیان پێ باشە ئاوها بژین، و لەو ماوەیەدا پیاوو ژن و منداڵەکان و سامانەکانیان لەژێرچاودێریی



ئەواندا دەبن. و سوڵتان سوێندی خوارد کەئەم بەڵێنە بەسەر دەبات. و بەر لەوەی سوڵتان فرمانی هێرش کردنە سەر دیوارەکانی شار بدات، سەرکردەکانی کۆکردەوەو وتاری بۆخوێندنەوە، و باسی ئەو پاداشتەی کرد کەدەستییان دەکەوێت و ئەو ژنە جوانانەی کەلەژیانیاندا نەیانبینیبوون.[29]

لەبەرە بەیانی 29ی ئایاری 1453دا، لەگەڵ هەلهەلە لێدان و دەنگی ئەڵڵاهو ئەکبەرو، لەگەڵ دەنگی تەپڵ و جوق و مۆسیقادا، سوپاکە پەلاماری دیوارەکانی شارەکەی دا، و ئینکشارییەکان کەژمارەیان پانزە هەزار کەس دەبوو، قارەمانانە شەڕیان کرد، و دڵی سوپای عوسمانییان پێکدەهێنا، بەوەی گاردی سوڵتان بوون کە لەدەستەبژێری سەربازەکان پێکهاتبوون، لەرووی دەروازەی قەشە رۆمانۆسەوە، پەلاماری دیوارەکەیان دا، و فەرەنسییە هاوچەرخەکانیان لەوەسفییاندا دەیانگوت کەلەمردن نەدەترسان، و وەکو شێر هەڵمەتیان بەرەو گۆڕەپانی شەڕ دەبرد. و بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتن و بەدەنگی بەرز ئەڵڵاهو ئەکبەریان دەکرد، تابەسەر دیوارەکەدا سەرکەوتن، و دواتر چوونە ناو شارەکەوە.[30]

ترس شارەکەی گرتەوە، کاتێ سەربازانی عوسمانی چوونە ناویەوە، و کوشتن هەموو شوێنێکی گرتەوەو تاڵان و دەستدرێژیکردنە سەر ژنان دەستی پێکردو دەکرێ بڵێین ئەو قارەمانییەی سەربازان لەپەلاماردانەکەدا پیشانیان دا، گۆڕا بەرابواردنێکی دڕندانەو بەرەڵاییەکی رەها. ئەمەیش شتێکی نامۆ نەبوو، چونکە زۆربەی شەڕە کۆنەکان ئەو

[29] محەممەد مستەفا سەفوەت (السلطان محمد الفاتح)-قاهیرە1948-لاپەڕە101،98.

[30] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە107،69-108.

شتانەی تیادا روودەدا. سەرباز پەری نییە، بەڵکو ئەویش مرۆڤە،و دەیەوێت پاداشتی قوربانییەکانی لەم دونیاو ئەو دونیا پێکەوە وەربگرێت.

## لە پەراوێزی رزگارکردندا :

لەگەڵ سوپایەکی گەورەدا، سوڵتان لەدەروازەی قەشە رۆمانۆسەوە گەیشتە قوستەنتنییە،و نزیکی کەنیسەی سانت سۆفیا لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارەوە،و داچەمییەوەو کەمێ خۆڵی خستە سەر سەری، وەکو ستایشکردنێك لەخودا، دواتر چووە ناو کەنیسەکەوە،و پیاوانی ئەوێ بەترسەوە پێشوازییان لێکرد، ئەویش دڵنیای کردنەوەو ئەوەی دووپات کردەوە کەدەیانپارێزێت،و داوای لەومەسیحییانە کرد کەپەنایان بەکەنیسە هێنابوو، بەبێ ترس بگەڕێنەوە بۆماڵەکانیان،و فرمانی دەرکرد بۆسەربازەکانی کەدەست لەتاڵان و دەستدرێژی هەڵبگرن. کەنیسەی ئەیا سۆفیای کرد بەمزگەوت و ناوی قوستەنتنییەی گۆڕی بەئیسلامبول– واتەگەنجینەی ئیسلام–بەڵام ئەم ناوە زۆر بەکار نەهێنرا، بەڵکو ناوی ئەستانەو ئەستەنبوڵ شوێنیان گرتەوە.[31]

[31] ئەستانە ناوێکی فارسییە بەمانای شوێنی پیرۆز، بەڵام ئەستەنبوول وشەیەکی یۆنانییە، یۆنانییەکان بۆقوستەنتنییە بەکاریان دەهێنا، بەمانای(بەرەو شار)ە،و لەمەودوا لەم کتێبەدا ئەو ناوە بەکار دەبەین، چونکە ئەو ناوە لەعیراقدا بەکار دەبەن، هەروەکو لەنەخشەکانی جیهاندا هاتووە.



سوڵتان نامەی بۆ پاشا موسڵمانەکان ناردو مژدەی داگیرکردنی قوستەنتنییەی پێدان، لەوانە نامەیەکی نارد بۆ ئینال شا پاشای میسر، کەنامەیەکی درێژە، ئەمەی خوارەوە بەشێکییەتی کەئاماژەی کۆمەڵایەتی تیادایە:

(...یەکێك لەنەریتە باشەکانی پێشینانمان، ئەوەیە کەخەباتیان لەپێناوی خودادا کردووە،و ترس لەگیانیاندا نەبووە. ئێمەیش لەسەر ئەو رێبازەین...ئەمساڵ بڕیارمان دا...ئەرکی غەزا لەئیسلامدا ئەنجام بدەین...وسەربازو موجاهیدەکانمان لەوشکانی و دەریا کۆکردەوە بۆرزگار کردنی ئەم شارە کەپڕبوو لەگەندەڵی و بێ بڕوایی، کە لەناو چەقی هەرێمە ئیسلامییەکاندا مابووەوە، شانازیی بەبێ بڕوایی خۆی دەکرد...ئێرە قەڵایەکی گەورەیەو لەسەر زمانی خەڵکی بەقوستەنتنییە بەناوبانگە. و دوور نییە کەراستکەرەوەکانی حەدیس و هەواڵەکانی پێغەمبەر، بەو شێوەیە بەسەر زمانیاندا هاتبێت...ولەگەڵ سپێدەی سێ شەممەی رۆژی بیستەمی جەمادیی یەکەمدا، و بەدەسەڵاتی سدیق و دادپەروەری فارووق،و بەزەبری بنەماڵەی عوسمان، هەڵمەتمان بردە سەر سەربازانی شەیتان...کاتێ هەڵمەتمان بردە سەر ئەم چەپەڵ و گلاوانە، کەوانمان لەقەشەکان پاك کردەوە،و خاچ و ناقووسمان لێدەرکرد،و پەرستگەکانی بت پەرستانمان کرد بەمزگەوتی موسڵمانان...).[32]

ئیبن ئەیاسی مێژووناسی میسری لەکتێبی(بدائع الزهور)دا دەڵێت، کاتێ هەواڵی رزگار کردن بەمیسر گەیشت، کرا بەئاهەنگ و قاهیرە

[32] ساتیع حوسەری (سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە25–26.

رازێنرایەوەو پاشا پەیامنێری نارد بۆلای ئیبن عوسمان بۆپیرۆزبایی کردنی بەبۆنەی سەرکەوتنەکەوە.[33]

## پەیدابوونی دەوڵەتی سەفەوی:

لەکاتێکدا هێزی دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی داگیرکردنی قوستەنتنییەوە، گەورەتر دەبوو، ناوچەی ئازەربایجان لەئێران بزاوتێکی سۆفیگەرانەی تێکەوتبوو، لەچارەی نووسرابوو کەببێتە مەترسییەکی گەورە لەسەر دەوڵەتی عوسمانی–ئەویش بزاوتی سەفەوی بوو.

شایانی ئاماژە پێکردنە کەرێبازی سەفەوی، لەسەرەتادا جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ رێبازی بەکتاشیدا نەبوو، لەو رووەوە کەتێکەڵەیەك بوو لەسۆفیگەری‌و شیعەی دوانزە ئیمامی، و هەوادارانی بەقزڵباش ناسراو بوون– واتە سەر سوورەکان–چونکە تەپلەی سووریان لەسەر دەکرد،کە دوانزە نیشانەی تیادا بوو، وەکو ئاماژە کردنێك بۆ دوانزە ئیمامەکە.

لەسەرەتای سەدەی شانزەیەمی زاییندا–رێکەوتی سەدەی دەیەمی کۆچی– گەنجێکی تەمەن سیانزە ساڵ بەناوی ئیسماعیل رێبەریی بزاوتی سەفەوی بەدەستەوە گرت، ئەم گەنجە توانی لەماوەی چەند ساڵێکدا، دەوڵەتێکی بەهێز لەئێران دابمەزرێنێت‌و سنوورەکەی فراوان بکات، و عیراق‌و ئەودیوی رووبارو بەشێکی گەورە لە قەوقاسی گرتەوە.

[33] محەممەد مستەفا سەفوەت (سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە110.



لەبەشی داهاتوودا، دێینە سەر باسی شا ئیسماعیل‌و رێبازەکەی، لێرەدا ئەوەندە دەڵێین کەئەم پیاوە بەئەنقەست‌و بەزۆری زۆرداری، مەزهەبی شیعەی سەپاند بەسەر ئێرانییەکاندا، و جنێودان بەسێ جێنشینەکەی کرد بەدروشمی خۆی، و گەلێ لەوەدا توند بوو، و هێندە خوێنڕێژ بوو، سڵی لەوە نەدەکردەوە کەفرمانی سەربڕینی ئەو کەسە بدات کەسەرپێچی فرمانەکانی بکات یان پشتگیریی نەکات، و دەڵێن ژمارەی ئەوانەی بەدەستی ئەوکوژران، زیاتر لەهەزار هەزار کەس دەبوون.[34]

لەساڵی1508دا، شا ئیسماعیل توانی بەغدا داگیر بکات، و زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەوەی بەسەر خەڵکی بەغدادا هێنا، کەپێشتر بەسەر ئێرانییەکانیای هێنابوو، وجنێودان بەجێنشینەکان‌و کوشتنی سوننییەکان‌و هەڵدانەوەی گۆڕی ئەبو حەنیفەی راگەیاند. جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەوە بڵاوبکەمەوە کەشێخ محەممەد جواد گوتوویەتی، بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم بابەتە، کە ئەونوێنەرایەتی لەبۆچوونێکی دیکەی دەکات، ئەمە دەقی گوتەکەیەتی:

(شا ئیسماعیل فرمانی دا، لەسەرانسەری ئێران لەبانگدا (حي علی خير العمل) زیاد بکەن، و ناوی عەلی‌و بنەماڵەکەی لەسەر دراو لێدا، و بانگهێشتکەران بۆمەزهەبی شیعەی، لەوڵاتانی دەرودراوسێی ئێراندا بڵاو کردەوە، و کاتێ ، لەرۆژی 25ی جەمادی دووەمی ساڵی 914دا، گەیشتە بەغدا خەڵکی خۆشحاڵ بوون بەهاتنی، و پەنایان بەدادپەروەرییەکەی برد، و بەئۆقرەییەوە چاوەڕوانیان دەکرد، و مەڕو قوربانییان لەبەر پێیدا سەربڕی. لەرۆژی دواتردا، یەکسەر بەرەو کەربەلا بەڕێ کەوت، و

[34] ریچارد کۆك(بغداد مدينة السلام)–بەغدا1962–وەرگێڕانی فوئاد جەمیل‌و مستەفا –بەرگی1 لاپەڕە313(پەراوێز).

ڕێورەسمی زیارەتی بەجێ هێناو شەوەكەی لەخەڵوەتدا مایەوە،و تابەیانی خۆی دابوو بەسەر گۆڕەكەی حوسێنی شەهیددا،و فرمانی دا سەندوقێكی زاخاودراو بەزێڕ بۆگۆڕەكەی دروست بكەن،و 12 لالەی زێڕی لەمەزارەكەیدا هەڵواسی،و نایابترین فەرشی بۆدابین كرد، هەروەها فرمانی دا، لەبری سەندووقە كۆنەكانیان، سەندووقی نوێ بۆ نەجەف‌و كازمییەو سامەرا دروست بكەن.

(دواتر لەسەردانی نەجەفدا، زیارەتی مەزاری عەلی كردو لالەی زێڕو زیوو فەرشی نایابی پێشكەش كرد،و هەر لەم ساڵەدا، دەستی كرد بەدروستكردنی مەزاری كازمەین‌و مزگەوتێكی گەورە بەناوی مزگەوتی سەفەوییەكان. و فرمانی دا جۆگەیەك هەڵبەستن كەپێشتر عەتا مەلیك پێی هەستابوو،و دواتر بەگوزەری كات پڕبووبووەوە،و شا ئیسماعیل نوێی كردەوە،و داهاتەكەی بۆ هەردوو مەزاری عەلی‌و حسێن تەرخان كرد. ئەمە جگە لەوەی زانایان‌و عەلەوییەكانی خۆش دەویست‌و پارەو پوڵی فراوانی بۆهەڵڕشتن‌و پۆستی بەرزی پێ بەخشین‌و پەنای بەشارەزایان‌و كەسانی بەتوانا برد، بەمەبەستی بڵاوكردنەوەی مەزهەبەكە،و ناوی دوانزە ئیمامەكەی لەمینبەری مزگەوت‌و لەكۆڕو كۆبوونەوەكان‌و لەبۆنە جیاوازەكاندا ڕاگەیاند).[35]

لەمەدا خوێنەر ئەوراستییەی بۆدەردەكەوێت كە ئاماژەمان پێكرد، كەمرۆڤ كاتێ تەماشای ڕاستی دەكات، دەبینین تێڕوانینەكەی لەسەر یەك لایەن چڕ دەكاتەوە،و زێدەڕەوی تیادا دەكات،و چاوپۆشی لەلایەنەكانی دیكەی دەكات،و ئەو لەكاتێكدا ئەو كارە دەكات، وادەزانی خۆی لەسەر حەقە. و لەم كتێبەدا چەندین نموونەی لەو جۆرە دەبینین-ئەوە سروشتی مرۆڤە لەهەر شوێن‌و كاتێكدا!

---

[35] محەممەد جواد مەغنییە (دول الشيعة في التأريخ)-نەجەف1965-لاپەڕە122-124.



## سوڵتان سەلیم یاوز:

هێشتا چوار ساڵ بەسەر داگیركردنی بەغدا، لەلایەن شا ئیسماعیلەوە ڕەت نەبووبوو، كەپیاوێكی كەللەڕەق‌و بەزەبر دەسەڵاتی عوسمانی لەئەستەنبوول بەدەستەوە گرت، كەشتێكی لەشا ئیسماعیل كەمتر نەبوو لەدەمارگیریی مەزهەبی‌و خوێنمژیدا- ئەویش سوڵتان سەلیم بوو كەبە نازناوی(یاوز) بەمانای بەزەبر، ناوی دەركرد.

لۆنكریك دەڵێت: سوڵتان سەلیم چەند بەهرەیەكی دژ بەیەكی هەبوو كەمایەی سەرسووڕمان بوون، وەكو ئاستی زانیاری‌و دڕندەیی،و زیرەكیی پیاوی ئازاو دەبەنگیی پیاوی گێل،و ئەو ماوەی ئاشتییەی كەلەسەردەمیدا هەبوو، دەرفەتی بۆرەخساند كەجیهان تاوتوێ بكات‌و خودانەناسی لەناو ئیسلامدا سەقامگیر بكات كەهەردەم زەفەری بەئیسلام دەهێنا،و ئەو قەسابخانەیەی عەجەمەكان بۆسونییەكانیان دانا لەبەغدا، كاریگەرییەكی خەمناكی بەلاوە دروست كرد...[36]

هەرچۆن بێت، سوڵتان سەلیم خۆی كرد بەپارێزەرو سەركردەی سوننییەكان، ولەهەندێ پیاوانی ئایینییەوە فەتوای ئەوەی وەرگرت قەتڵوعامی شیعە بكات، بەوەی لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە،[37]دواتر پلانێكی داڕشت بۆ لەناوبردنی هەموو ئەو شیعانەی لەقەڵەمڕەوەكەی ئەودا بوون.

---

[36] ستیڤن هیمسلی لۆنكریك (أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)-بەغدا1962-وەرگێڕانی جەعفەر خەیات -لاپەڕە19.

[37] ساتیع حوسەری (سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە 40.

دواتـر سـوڵتان پۆلیسـی نهـێنی دانـاو پیاوەکـانی لەسەرانسـەری وڵاتی عوسمانیدا بڵاوکردەوە–ئاسیاو ئەوروپا– بەمەبەستی سەرژمێریی شیعەکان،و دواتـر دەرکـەوت کـەژمارەیان زیاتر لەحـەفتا هـەزار پیاوو ژنو منداڵـە. دوای ئـەوەی سـوڵتان لـەژمارەیانو لەشـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان دڵنیا بوو، سەربازانی خۆی بۆئەو شوێنانە نارد بەپێی رێـژەی ژمارەیـان، دواتـر فرمـانی بـەو سـەربازانە دا، هـەر یەکـەو لـەکاتێکی دیـاریکراودا، شیعەکانی نزیکی خۆی دەستگیر بکات. ئەوسا دەستیان کرد بەکوشتنی چل هـەزار کـەس لەشیعەکان، لەکاتێکدا ئـەوانی دیکـەیان، بۆهـەتا هەتایـە زیندانی کرد.[38]

مێژوونووسـان ئـەم قەسـابخانەیە بەلێکچـووی قەسـابخانەکەی کاسـۆلیکەکان لەفەرەنسـا دادەنـێن کـە بۆتۆڵەسـەنەوە لەپرۆتسـتانتەکان ئـەنجامیان دا، کەبەقەسابخانەی(سـان برسـلمیۆ) نـاوی دەرکـرد.[39] ئـەوەی سـەرنج راکێشـە، ئەوەیـە کەئـەم قەسـابخانەیە دوای قەسـابخانەکەی شـیعەکان، بەنزیکـەی شەسـت سـاڵ رووی دا، ئایـا هـیچ پەیوەندییـەکی هۆکـاریی هـەبوو، لـەنێوان ئـەم دوو قەسـابخانەیەدا؟ ئەمـە بابەتێکـە هەڵدەگرێت توێژینەوەی لەسەر بکرێت.

38-Edward S. Creasy(History of The Ottoman Turks)-Beirut1961-P.131-132.

39 محەممەد فەرید ( سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە 74.



## لەنێوان سوڵتانو شادا :

دکتۆر بێرگ داستانێکی سەیر لەشێخێکی بەکتاشی دەگێڕێتەوە، کورتەکەی ئەوەیە کەسوڵتان سەلیمی عوسمانیو شا ئیسماعیلی سەفەوی هەردووکیان هەواداری رێبازی بەکتاشی بوون، جارێکیان کەهـەردووکیان لاو بـوون پێکـەوەو بـەئامادە بـوونی(بـالم سـوڵتان)ی شـێخی بـەناوبانگی بەکتاشـی دانیشـتبوون، لـەنێوان خۆیانـدا لەسـەر ئـەوە رێککـەوتن کەدەسەڵات بەوان گەیشت هەوڵ بدەن موسڵمانان یەکبخەن لەیـەك بڕوادا– کەئـەویش رێبـازی بەکتاشـی بـوو– بـەڵام کـاتێ بەدەسـەڵات گەیشـتن، ئیسـماعیل نامـەی بـۆ سـەلیم نـاردو بەڵێنەکـەی وەبـیر هێنایـەوە، سـەلیم وەڵامی دایەوەو پاساوی بۆخۆی هێنایەوە، بەوەی کەوەزیرەکانی سونینو ئەویش ناچارە لـەژێر بەڵێنەکەی خۆی دەربچێت، ئەم پاساو هێنانەوەیـە ئیسـماعیلی تـوڕە کـرد،و بـەدرۆزن نـاوی بـرد کەپابەنـد نییـە بەبەڵێنەکـەی خۆی. لێرەوە دوژمنایەتیی نێوانیان خەستتر بوو.[40]

نـازانین ئـەم داسـتانە چـەندە راسـتە، بەڵام هەرچۆن بێت بۆچوونی بەکتاشییەکانمان دەداتێ لەدۆزینەوەی هۆی دوژمنایەتیی نێوان سوڵتانو شادا. هەندێ رووداوی لێکچووی مێـژوویی ئاماژە بـەوە دەکـەن کەسوڵتان کـاتێ دەسـتیدایە دوژمنایـەتیکردنی شـا، لەوەدەترسـا کەئینکشـارییەکان لایـەنگری بـن،و لـەوە دەترسـا لـەکاتی شـەڕدا لێـی هەڵبگەڕێنـەوە ،و بچـنە ریزەکانی شاوە، بەهۆی ئەو نزیکییەی لە رێبازەکانیاندا هەبوو.

40-John Birge(op. cit.)P.67.

لەساڵی 1514دا، شەڕێکی خوێناوی لەنێوان سەربازانی سوڵتان و شادا رووی دا، کە لەمێژوودا بەشەڕی(چاڵدێران)ناوبرا، چونکە لەو شوێنە لەنزیکی تەبرێزدا رووی دا. و تیایدا سوپای عوسمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، و سوڵتان فرمانی دا هەموو دیلەکان سەرببڕن، و لەکەللە سەری کوژراوەکان لەناوەراستی گۆڕەپانی شەڕەکەدا، قوچەکێك دروست بکەن–ئەوە نەریتی سەرکەوتوان بوو لەو سەردەمەدا.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە، سوڵتان ئەم سەرکەوتنەی بەتەواوی نەقۆستەوە، کەبینیمان شوێن پێی دوژمنە شکاوەکەی هەڵنەگرت و بۆئەستەنبول گەڕایەوە. و دەڵێن ئینکشارییەکان بوونە هۆی ئەوە، بەپاساوی سەرما و سۆڵەی زستان و کەمیی جل و بەرگ و زەخیرەی پێویست، درێژەیان بە پێشرەویی لەخاکی ئێراندا راگرت.

هەرچۆنێك بێت، کاتێ سوڵتان گەیشتە ئەستەنبول، فرمانی کوشتنی ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرە ئینکشارییەکانی دەرکرد، کەببوونە هۆی راگرتنی پێشرەویی بەرەو ئێران، هەروەها فرمانی کوشتنی جەعفەر چەلەبی–دادوەری سەربازیی بەکتاشییەکان–کەیەکێك بوو لەوانەی داوای ئەو راگرتنەی کردبوو دەرکرد. دواتر سوڵتان فەرماندەیەکی نوێی بۆیان دانا، کە لەخۆیان نەبوو، بۆئەوەی بتوانێت دڵنیا بێت لەکۆنترۆڵ کردنیان و چیتر لەئایندەدا، سەرپێچی لەفرمانەکانیدا نەکەن.[41]

[41] محەممەد فەرید ( سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە74–75.



## داگیردنی میسر:

دیارە جگە لەوەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، هۆکارێکی دیکە هەبوو، ئەویش ئەوەبوو سوڵتان سەلیم لەوە ترسا کەسوپاکەی بچێتە خاکی ئێران و قانسو ئەلغوری– پاشای میسرو شام– ئەو هەلە بقۆزێتەوە و لەپشتەوە پەلاماری بدات. ئەوەی شایانی ئاماژە پێکردنە لەم بارەوە ئەوەیە، شا پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ غوریدا هەبوو، و پەیمانێکی لەگەڵدا بەستبوو، کەئەمەیش وایکردبوو غوری پەیوەندیی دیپلۆماسیی لەگەڵ سوڵتان سەلیمدا بپڕێت،[42] بۆیە دەبینین دوا بەدوای کۆتایی هاتنی شەڕ لەگەڵ شادا، سوڵتان خۆی بۆ شەڕی غوری ئامادە دەکات.

لە24ی ئابی 1516دا، هەردوو سوپای عوسمانی و قانسو بۆیەکەم جار لەشوێنێك، نزیکی حەڵەب بەناوی(مەرەج دابق) دا، رووبەرووی یەکدی بوونەوە، و شەڕەکە تەنیا چەند سەعاتێکی خایاند–لەبەیانییەوە تاوەکو عەسر– و تیایدا سوپای عوسمانی سەرکەوت، و گرنگترین فاکتەری سەرکەوتنی، هێزی تۆپەکانی بوو، و هەر ئەو تۆپانەش بوونە هۆی ئەوەی لەشەڕی چاڵدێران و شەڕەکانی پێشووتریشدا، سەرکەوتنیان بۆسوپای عوسمانی دابین کرد.[43]

[42] زێن نوورەدین زێن(نشوء القومية العربية)بەیرووت1968– لاپەڕە19.

[43] تۆپ لەو سەردەمەدا چەکێکی نوێ بوو، و سوڵتانەکانی بنەماڵەی عوسمان هەستیان بەگرنگیی تۆپ کردبوو لەشەڕدا، بۆیە مشوری ئەوەیان دەخوارد شارەزا لەئەوروپاوە بهێنن بۆدروستکردن و چاکسازیی تیایاندا، دیارە لەوەدا بەسەر ئەوروپییەکانیشدا باڵادەست بوون،

سەرکەوتن لە شەڕی مەرەج دابق یەکلایی کەرەوە بوو، قانسوغۆری لەگۆڕەپانی شەڕەکەدا کوژرا، ئیتر سوڵتان سەلیم هیچ بەرنگارییەکی نەبینی لەبەردەم پێشرەویی سوپاکەیدا، بۆیە لەماوەی چەند حەفتەیەکدا، توانی وڵاتی شام داگیر بکات. دواتر بەرەو میسر پێشڕەویی کردو بیابانی سینای بڕی، و بەڕێکەوت لەو کاتەدا بارانێکی زۆر باری کەیارمەتیی سوپای دا بۆ بڕینی. و لە13ی نیسانی 1517دا قاهیرەی داگیر کرد، دوای شەڕێکی خوێناوی لەشەقامەکانی ناو شاردا. و مەمالیك لەو شەڕەدا بەتوندی بەرنگارییان کردو شەقام بەشەقامو ماڵ بەماڵ شەڕیان کرد، تائەوەی زۆریان لێ کوژراو پەنجا هەزار کەس لەدانیشتوانی شاری قاهیرە کوژران، و تۆمان بای سەرۆکی مەمالیك کەوتە بەر دەستی عوسمانییەکان، و سوڵتان فرمانی دا لەباب زوێلە لەسێدارەیان دا.[44]

---

چونکە شارەزا ئەوروپییەکان لەو بوارەدا، رێزلێنانو خەڵاتی باشتریان دەست دەکەوت، لەوەی لەوڵاتەکانی خۆیاندا پێیان دەدرا.

[44] محەممەد فەرید( سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە76.



## گواستنەوەی جێنشینی بۆ عوسمانییەکان:

ئەو کاتە، پیاوێك لەبنەماڵەی عەباسییەکان بەناوی (محمد المتوکل علی الله)لەقاهیرەدا بوو، و مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە ئەم پیاوە، لەمافی خۆی خۆش بوو لەسەر جێنشینییئیسلامیو پاشماوەی ئەو جێنشینییە کەئاڵاو شمشێرو بەرماڵێك بوو، لەگەڵکلیلی مەکەو مەدینە، دای بەسوڵتان سەلیم. و لەو کاتەوە هەر سوڵتانێکی عوسمانی بە ئەمیری موسڵمانانو جێنشینی پێغەمبەر ناودەبرا.

نیاری گواستنەوەی جێنشینی بۆ عوسمانییەکان بوو بەمشتومڕی نێوان زانایانی ئیسلام، و هەندێکیان دژی ئەم گواستنەوەیە وەستانەوە، بەپێی ئەو حەدیسەی پێغەمبەر کەدەڵێت:(الأئمة من قریش)، واتە جێنشینی تایبەت بەقورەیشە. و ئەوەی کەدەوڵەتی عوسمانی گەلێ پابەندی مەزهەبی حەنەفی بوو، ئەوەیە کە ئەبوحەنیفە ئەم حەدیسەی بەهێند وەرنەدەگرتو پێی وابوو کەدەکرێ جێنشینی بەدەست قورەیشییەوە نەبێت.

بەم دواییە، ساتیع حوسەری رایەکی دیکەی هەبوو، دەیویست نیاری گواستنەوەی جێنشینی بۆ عوسمانییەکان لەبنچینەوە رەت بکاتەوە، سەرەرای ئەوەی مێژوونووسان لەسەری تەبابوون. ئەو دەڵێت: توێژینەوە مێژووییەکان پشتگیریی لەو روودانە ناکەن، ئەگەرچی قسەی

لەسەر کراوە، و ئەو توێژینەوانە هیچ بوارێك بۆگومان ناهێڵنەوە، لەوەی کە ئەفسانەیەو دوای داگیر کردنی میسرو دوای مردنی سوڵتان سەلیم، بەماوەیەکی نەچەندان کەم دروست بووە. و حوسەری چەندین لێکچووی مێژوویی دەهێنێتەوە کەپشتگیریی لەراوبۆچوونەکەی دەکەن. دواتر بەدەق دەڵێت:( هەموو شتێك ئەوە دەسەلمێنن کەسوڵتانەکانی بنەماڵەی عوسمان، لەسەرەتاوە، هیچ بایەخێکیان بەجێنشینی نەداوە. و دواتر کەبایەخیان پێدا-ویستیان وردە وردە سوودی لێوەربگرن-و سیاسییەکان و مێژوونووسانیان ئەفسانەی (دەست لێهەڵگرتن و گواستنەوە)یان داهێنا.[45]

لەراستیدا، عوسمانییەکان-هەروەکو حوسەری دەڵێت-سوودێکی گەورەیان لەبیرۆکەی جێنشینی وەرگرت، چونکە بڕوای موسڵمانان بەو بیرۆکەیە، نۆرێنی دەوڵەتی عوسمانی بەهێز کردو ئاسانکارییەکی مەزنی بۆدەسەڵاتەکەی کرد. لەم بەرگەو لەبەرگەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا، رادەی کاریگەریی ئەم بیرۆکەیە لەسەر کۆمەڵگەی عیراقی، و نەخوازەڵا لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا دەبینین.

[45]ساتیع حوسەری (سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە42-45.



## سوڵتان سولەیمانی قانوونی:

لەساڵی 1520دا، سوڵتان سەلیم بەهۆی نەخۆشیی شێر پەنجەوە کۆچی دوایی کردو هێشتا تەمەنی لەپەنجاویەك ساڵ تێنەپەڕیبوو، و کوڕەکەی سولەیمان لەشوێنی دانیشت.ئەم پیاوە بەپێچەوانەی باوکییەوە، بەبەزەیی بوو، حەزی لە دادپەروەری دەکرد، و دەسەڵاتەکەی ماوەی 46 ساڵ درێژەی کێشا، و دەوڵەت لەسەردەمی ئەودا، گەیشتە ئەو پەڕی بەرزیو گەشەسەندنی خۆی. و ئەوروپییەکان نازناوی(مەزن) یان لێنا و هەروەها تورکەکانیش نازناوی(یاسایی)و(سەروەری سەردەمی خۆی)یان پێ بەخشی.

تێبینی ئەوە دەکرێت سوڵتان سولەیمان لەسەردەمێکدا ژیا، گەلێ ناوداران لەپاشایان لەرۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەژیان وەکوئەکبەر شا لەهیند، و ئیسماعیل شا لەئێران، و ئیڤانی سامدار لەروسیا، و هینری هەشتەم لە بەریتانیا، و پاپا لیوسی دەیەم لەرۆما، و ئیمپراتۆر شارلکان لەئیسپانیاو ئەڵمانیا. و مێژوونووسی کریتی لەو بارەوە دەڵێت: هیچ یەکێك لەو پاشا مەزنانە، شکۆمەندیی سوڵتان سولەیمانیان بەرنەکەوت.[46]

دیارە سوپای عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان سولەیماندا، تایبەتمەندیی و دەسەری گەورەیان هەبوو، چونکە ژمارەیان زۆر بوو، و تۆپەکانیان کارا بوون، و ئەندازیاریی سەربازیی بەتوانایان هەبوو، و

46-Edward Creasy(op. cit.)P.158-159.

بایەخدان بەحەوانەوەو پاکیی زۆر، و تەنانەت کۆمەڵێ لەشۆفێرەکان لەناو سەربازەکاندا دەگەڕان، بۆئەوەی ئاوی خواردنەوە بەنەخۆش و پەککەوتەکانیان بگەیەنن. جگە لەوەی کەسەربازەکان متمانەیەکی تەواویان بەسوڵتان سولەیمان هەبوو، و پێیان وابوو کەخودا پشتگیریی دەکات و ناوی لەقورئاندا هاتووە، و دەبێ بەرەو سەرکەوتنی ببات، و پێیان دەگوت(تەواوکەری ژمارەی تەواوە) و مەبەستیان لەژمارەی تەواو، ژمارەی (10) بوو، چونکە دەسەڵاتی سوڵتان سولەیمان، هاورەوتی دە نیاری جۆراوجۆر بوو کەئەم ژمارەیان تیادا بوو، ئەو دەیەم سوڵتانی بنەماڵەی عوسمان بوو، و لەسەرەتای سەدەی دەیەمی کۆچییدا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، و لەم شتانە، جگە لەوەی بەپیرۆزو شانسداریان دەزانی.[47]

سوڵتان سولەیمان لەسەرکەوتنێکەوە بۆسەرکەوتنێکی دیکە دەچوو، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەبەردەمیدا خۆی بگرێت. سەرکەوتنەکانی لەساڵی دووەمی دەسەڵاتەکەیەوە دەستی پێکرد، کاتێ بەلگرادو قەڵا سەختەکەی داگیر کرد، و بەمەیش ڕێگای ئەوروپای ناوەراستیی ئەو دیوی رووباری دانووبی لەبەردەمدا ئاوەڵا بوو. و لە1526 لەشەڕی موهاجدا، سەرکەوتنی یەکالاکەرەوەی بەدەست هێنا کەبۆدابێستی داگیر کرد، دواتر بەرەو شاری مەزنی ڤێننا پێشڕەویی کرد، و لە1529دا ئابلۆقەی داو تۆپە گەورەکانی ئەو شارەیان تۆپباران کرد، بەڵام لەگەڵ هاتنی وەرزی سەرماو سۆڵەو بارینی بەفردا، ئابلۆقەی لەسەر هەڵگرت و بۆدواوە گەڕایەوە.

47-bid, P.160-161&202.



## دڵەراوکێی ئەوروپا:

لە16ی نیسانی1523دا، ئیمپراتۆر شارلکان نامەیەکی بۆ باڵیۆزەکەی خۆی لەبەریتانیا نارد،وتیایدا گوتی:(...پێویستە لەسەرت بۆپاشاو کاردینال رادەی ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە روون بکەیتەوە کەرووبەرووی جیهانی مەسیحی بۆتەوە... و خەریکە بڕوا بەوە بکەین کەتورکەکان دەیانەوێت ئەم ساڵ پەلاماری جیهانی مەسیحی بدەن، و ئیتاڵیا یان هەنگاریا یان لەیەك کاتدا هەردووکیان ببن بەگۆڕەپانی شەڕەکە...بەڵام لەهەر شوێنێکەوە تورکەکان پەلاماری جیهانی مەسیحی بدەن، بەوەی ئیمپراتۆریەت و پارێزەری کەنیسەین، ئەوا سووکایەتی بەئابڕوو وشکۆمەندیمان دەکەن، جگە لەوەی شکۆمەندیی براکەمان پارێزەری بڕوا، رووبەرووی مەترسی دەکاتەوە، ئەگەر هاتو ئێمە لەژیانماندا، چاوپۆشیمان لەو دەستدرێژییە کرد. ئەگەر ڕێگەمان بەدوژمن دا ئەودەستدرێژییە بکات، ئەوە وەکو لەکەیە بۆهەتا هەتایە، لەدەموچاومان نابێتەوەو سەرەرای ئەوەی رووبەرووی نەهامەتی و کوێرەوەریمان دەکاتەوە).[48]

ئەم نامەیە ئەوە دەگەیەنێت کەچەندە ئەوروپا لەپاوانخوازیی عوسمانییەکان دەترسان، و هەندێ لێکچووی مێژوویی لەئارادان دەریدەخەن کە ئەوروپییەکان بەجۆرێ تەماشای دەوڵەتی سەفەوییان لەئێران دەکرد، وەکو ئامرازێك بۆلابردنی مەترسی لەسەر خۆیان. ئەوەبوو باڵیۆزی نەمساوی لەئەستەنبول لەو کاتەدا دەڵێت:(تەنیا ئێرانییەکان

[48] زێن نوورەدین زێن(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە14–15.

لەنێوان ئێمەو وێرانکاریدا دەوەستن).[49] مێژوونووس هارۆڵد لامپ دەڵێت: پەیکە نێردراوەکان لەڤینیسیاوە سەردانی شای ئێرانیان کرد، تاهانی بدەن شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بکات، چونکە ئەو شەڕە ئەگەر هەڵبگیرسێنرایە، ئەوا گوشار لەسەر شاری ڤێننا و لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست کەم دەکرایەوە.[50]

## داگیرکردنی بەغدا :

سولتان سولەیمان هەر لەسەرەتای وەرگرتنی دەسەڵاتەوە، ڕووبەڕووی گوشار دەبووەوە، لەلایەن دەربارو راوێژکارەکانیەوە، و هانیان دەدا بۆ(رزگارکردنی) بەغدا لەدەستی ئێرانییەکان و بۆچاکسازیی مەزاری(ئیمامی مەزن) ئەبو حەنیفە، و شاعیران لەم ڕێگەیەدا، دەیانوروژاند، و (ئاغاکان) هەردەم ئەوەیان وەبیری دەهێنایەوە کەدەبێ ئێرانییە(لادەرەکان) بەزۆری ئاگرو شمشێر، لەسەر شێوازی باوکی، سولتان سەلیم رابماڵێت.[51]

لەساڵی 1524دا، شا ئیسماعیل کۆچی دوایی کردو کوڕە گەورەکەی تەهماسب شوێنی گرتەوە، کەئەو کاتە تەمەنی لەدە ساڵ زیاتر

49-Edward Browne(A Literary History of Persia)-Cambridge1953-vol 4, P.93-94.

[50] هارۆڵد لامپ(سليمان القانوني)–بەغدا1961–وەرگێڕانی شوکری مەحموود نەدیم– لاپەڕە234.

[51] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل235.



نەدەبوو، و سولتان سەلیم لەنامەیەکدا، پیرۆزبایی لەشای نوێ کرد، بەڵام دەستەواژەی بەڵێنکاری لەکۆتایی نامەکانیدا بەکار دەهێنا. و لەساڵی دواتردا شانشینی ئێران ترسا کاتێ هەواڵی پێگەیشت کەئەستەنبوڵ خەریکی خۆئامادەکردنێکی سەربازیی فراوانە، یەکسەر داوای لەپاشای هەنگاریا کرد بۆئەوەی دژی دوژمنی هاوبەش یارمەتی بدات، و کاتێ سولتان سولەیمان بەمەی زانی، فرمانی دا دیلە ئێرانییەکان لەسێدارە بدەن، کە لەگالیبۆلیدا زیندانی بوون.[52]

دواجار لەساڵی 1534دا، سولتان سەلیم سوپاکەی بەرەو تەبرێز خستەڕێ، دواتر لەوێوە بەرەو باشوور لەناوچەکانی رۆژئاوای ئێران، و سوپای ئێران هەنگاو بەهەنگاو، لەبەردەم ئەو سوپایەدا، دەکشایەوە، تاگەیشتە هەمەدان، و لەوێوە ڕووی لەرۆژئاوا، لەبەغدا کرد. لەراستیدا ئەم پێشرەوییە دوورو درێژە، بەتەواوی سەرکەوتوو نەبوو، سوپای عوسمانی بەدەست سەرما و سۆڵەو بارانی زۆرو زۆنگاوەوە ناڵاندی، و زۆرێک لەتۆپ و ئاژەڵەکانی خۆی لەدەست دا، و کاتێ گەیشتە نزیکی بەغدا، بەتەواوی شەکەت بووبوو.

دیارە دوای ئەوەی سولتان سەلیم بەسوپاکەی و بەتۆپەکانییەوە، لەبەغدا نزیکبووەوە، ترسی خستە دڵی گاردە ئێرانییەکەوە، و ئەوە یەکەم جار بوو کەخەڵکی بەغدا ناوی تۆپ ببیستن، و ڕەنگە زێدەرەوی زۆریش

[52] لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە 21.

لەبڵاوکردنـەوەی هـەواڵی ئـەو داهێنانـە ،و لەکاریگـەریی لەوێرانکردنیـدا کرابێت. بەهەر حاڵ، بەبێ هیچ بەرنگارییەك سوڵتان بەغدای داگیرکرد،و بەر لەوە گاردە ئێرانییەکە لەوێ کشابوونەوە.

سـوڵتان لـەدوا رۆژی سـاڵی 1534دا گەیشـتە بەغـدا،و ئاشـکرایە کەرێگـەی بـەتاڵان‌و ئازاردانی دانیشتوانی بەغدای نـەدا. و ئەوسا فزوولـی بەغدادی، شاعیری بـەناوبانگ، وەکو ستایشکردنێك لەسوڵتان، شیعرێکی لەبەردەمیدا خوێندەوە، کە بەم دێڕە دەست پێدەکات:

**أيد اللهم في الآفاق أمن المسلمين          بادوام دولت بايندە سلطان دين**

**واتـە خودایـا لەئاسـۆکاندا پشـتگیریی لەئاسایشـی موسـڵمانان بکـە،و دەوڵەت بالەسایەی سوڵتانی ئاییندا بەردەوام بێت.**

وهەموو دێڕەکانی شیعرەکە بەم شێوەیە بوو، واتە نیو دێڕی یەکـەم بـەزمانی عـەرەبی‌و نیـو دێـڕی دووەم بـەزمانی فارسـی بـوو. شـایانی باسـە، هەردوو ستایشکراوو ستایشکەر سەر بەرێبازی بەکتاشی بوون.

دوای ئـەوەی سـوڵتان بۆمـاوەی چـوار رۆژ لەبەغـدادا حەوایـەوە، بەمەبەستی زیارەتکردنی ئیمامەکان، سەردانی کازمییـەو کەربـەلاو نەجەف کـرد،و دەگێڕنـەوە کەچوار فەرسـەخی مـابوو بگاتـە نەجـەف،و لـەدوورەوە چاوی بەگومەزی مەزاری پیرۆز کـەوت، لەئەسپەکەی دابـەزی‌و بـەپێ بـەڕێ کـەوت،و گوایـا بـەبینینی گومەزەکـە، هـەموو ئەنـدامی گیـانی کـەوتبووە



لەرزین. و دەڵێن لەوکاتەدا بەپێ بەرەو نەجەف دەڕۆیشت، ، بۆستایشکردن لەئیمام، چەندین دێڕ شیعری خوێندۆتەوە.

سـوڵتان فرمـانی دا ئـەو پرۆژەیـە تـەواو بکرێـت کەشـا ئیسـماعیل دەسـتی پێکردبـوو، لەکازمییـە بۆگـۆڕی هـەردوو ئیمـام موسـاو جـواد،و هەروەها فرمانی دا مووچە بۆ خزمەتکاری گۆڕەکە، لەسـەر بودجـەی بەغـدا خـەرج بکرێـت.[53] دواتـر سەرپەرشـتیی قـووڵکردنی جۆگـەی ئـاوی حوسـەینییەی‌و فراوانکردنـی کـرد، بـەجۆرێ ئـاوی فـورات بـەرێکوپێکی بگاتـە کەربـەلا،و خـەڵکیش ئەمـەیان بەدەستکەوتێك بۆشـکۆمەندیی ئیمـام حوسێن زانی لەلایەن سوڵتانەوە.[54]

## داستانی گۆڕی ئەبو حەنیفە :

---

[53] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی4،ل34،29.
[54] لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە 25.

کاتیٚ سولّتان سولەیمان لەزیارەتی کەربەلاو نەجەف گەڕایەوە، زیارەتی مەزاری ئیمام ئەبو حەنیفەی کرد، و ئیٚرانییەکان پیٚشتر رووخاندبوویان و هەلّیاندابووەوە، هەروەکو پیٚشتر ئاماژەمان بۆکرد، و فرمانی دا گومەزیٚك و مزگەوتیٚکی لەسەر دروست بکەن. وادیارە ئەو سەردەمە شویٚنی حەوانەوە لەدەوری مەزارەکەدا نەبوو، و سولّتان فرمانی دا میوانخانەیەك و گەرماوو خانیٚك و نزیکەی چل تاپەنجا دوکان دروست بکەن، دواتر فرمانی دا قەلاّیەك دروست بکەن بۆپاریٚزگاری کردن لیٚی، و چەندین سەربازی کەژمارەیان سەدو پەنجا دەبوو، بەکەرەستەی جەنگی و تۆپەوە لەویٚ دانا.

لەو سەردەمەدا، سەبارەت بەگۆڕەکە، داستانیٚك بلاّوبووەوە، کەبەکەرامەتیٚك بۆئەبو حەنیفە دانرا، کورتەکەی ئەوەیە کەئەبو حەنیفە–بەر لەوەی ئیٚرانییەکان گۆڕەکەی هەلّبدەنەوە–هاتۆتە خەوی مجیٚورەکەو پیٚی گوتووە:(سەندووقی سەر گۆڕەکەم بخەرە سەر ئەو گۆڕەی لەفلاّنە شویٚنە، چونکە لەویٚدا خوانەناسیٚك هەیە شایانی سزادانە)، و مجیٚورەکە لەخەو راپەڕیوەو ئەو فرمانەی ئەبو حەنیفەی بەجیٚ هیٚناوە، بەبیٚ ئەوەی هۆکەی بزانیٚت. و ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەوەدا رەت نەبوو، تائیٚرانییەکان بەغدایان داگیر کرد، و ئەوسا سەندووقەکەیان شکاندو گۆڕەکەیان هەلّدایەوەو بینییان لاشەیەکی پیسی تیادایە، وایانزانی لاشەی ئەبو حەنیفەیە، و فڕیٚیاندایە ناو ئاگرەوە. و کاتیٚ سولّتان سولەیمان بەغدای گرتەوە، ئەبو حەنیفە هاتە خەوی یەکیٚك لەفەرماندەکانی سوپاو لەشویٚنی راستەقینەی گۆڕەکەی ئاگاداری کردەوە، و کاتیٚ ئەو شویٚنەیان هەلّکەند، بەردیٚکی



گەورەیان بینی کەبۆنیٚکی خۆش لەژیٚریەوە دەهات، و ئامادەبووانی مەست کرد، سولّتان بەردەکەی لەشویٚنی خۆیدا هیٚشتەوەو خۆلّی کرد بەسەریدا، و فرمانی دا گومەزیٚك لەسەری دروست بکەن.[55] و سوپا ئەو بڕوایەیان بەلاوە دروست بوو کەئەوە نیشانەیەکە، ئەوە دەگەیەنیٚت کەسولّتان لەلایەن خوداوە ئاراستە کراوە.[56]

# بەشی دووەم

[55] عەباس عەزاوی(سەرچاوەی پیٚشوو)بەرگی 4، لاپەڕە30–31.
[56] هارۆلّد لامپ(سەرچاوەی پیٚشوو)لاپەڕە240.

## دەوڵەتی سەفەویو شیعەگەری

پەیـدابوونی دەوڵـەتی سـەفەوی لەئێرانـدا، لـەرووی سیاسـیو کۆمەڵایـەتیو ئایینییـەوە، کاریگەرییـەکی یـەکجار گـەورەی هـەبوو،و کاریگەرییەکەی تـەنیا ئێرانـی نەگرتـەوە، بـەڵکو تەشـەنەی کـرد بۆعیراقو تورکیاو ئەفغانستانو هیند. لەراستیدا ئێمە ناتوانین بەقووڵی، لەمێژووی عـیراقو سرووشـتی کۆمەڵگـەی عـیراق تێبگـەین، ئەگـەر هـاتو دەوڵـەتی سـەفەوی بەدرێـژیی تـاوتویٚ نەکـەین. هـەوڵ دەدەم لـەم بەشـەدا، لایـەنێك لەدەوڵـەتی سـەفەوی تـاوتویٚ بکـەم، کەپەیوەندییـەکی بتـەوی هەیـە بەکۆمەڵگـەی عیراقـەوە، ئـەویش لایـەنی مەزهەبییـە. ئـەوەی جێگـەی داخـە ئەوەیە، ئـەم لایەنـە ، ئەگەرچی گرنگییـەکی مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی هەیـە، بەڵام وەکو پێویست لەلایەن توێژەرانەوە، بایەخی پیٚ نەدراوە.

### دامەزرێنەری دەوڵەت:



شـا ئیسـماعیلی–هـەروەکو لەبەشـی پێشـوودا ئاماژەمـان پێکـرد– دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوییە،و ئەو شیعەگەریی دوانزە ئیمامی بەسـەر ئێرانییەکانـدا سـەپاند،و کـردی بەمەزهـەبی رەسمیـی حکومـەتی ئێـران. مامۆسـتا بـراون بـەجوانی کەسایەتیی ئـەم پیاوە وەسف دەکات، لـەدەمی هەنـدیٚ لەگەڕیـدەو بازرگانـە ئەوروپییەکانـەوە کەبینیویانـە،و هـەروەکو لەوتـەی بینـەرانی دەردەکـەوێت، چـەندین ئاکاری دژ بەیـەکی تیـادا بـووە، لەلایەکـەوە، هێنـدە دڵـڕەقو بەڕادەیـەك خوێنمـژ بـووە کـە لـەباس نایـەت، لەکاتێکـدا لەلایـەکی دیکـەوە، رەوشـتێکی ناسـکی هـەبووە، لەلایـەن سەربازەکانییەوە خۆشەویست بووە، تارادەیـەك کەسەربازەکانی تائاستی پەرسـتن خۆشـیان ویسـتووە، تەنانـەت بـەبیٚ قـەڵغان خۆیـان فـریٚ دەدایـە گۆڕەپـانی شـەڕەوە، بـەو بڕوایـەی ئـەو لـەکاتی شـەڕدا لەمەترسـیی دەیانپارێزێـت.[57] وادەزانم شـا ئیسـماعیل لەوپیاوانـە بـوو کـە بـەهرەی دانسـقەی هـەبوو–بـاشو خـراپ پێکـەوە–کـە لەوبڕوایـەدام چـارەنووس ئامادەی کردوون، بۆ لەئەستۆ گرتنی ئەرکێك. بەرواڵـەت کـاتیٚ کەهەسـتا بەسـەپاندنی مەزهـەبی شـیعە بەسـەر ئێرانییەکانـدا، لـەوە دڵنیـا بـوو کەلەلایـەن هێزێکـی رۆحیـی بـەرزەوە، ئـەو ئەرکـەی پـیٚ سـپێردراوە. ئـەو هەرچـۆن بێـت بـڕوای بـەوە هـەبوو کەسرووشـێك لەغەیبـەوە هـانی دەداو لەکارەکانیدا رێنموونی دەکات. دەبیٚ ئەوە فەرامۆش نەکەین کـەپیاوێکی سۆفی بوو،و سۆفییەکانیش بڕوایـان بـە(کەشـف)–واتـە سرووشـی غـەیبی هەیـەو ئـەوەی زانـراوە ئەوەیـە کەهـەوادارانی خـۆی ئاگـادار دەکاتـەوە کـە لەشوێنی خۆی جووڵـە ناکات، مەگـەر بـەفرمانی دوانـزە ئیمامەکـەو لـەوەدا

---

57-Edward Browne(A Literary History of Persia)-Cambridge 1953-vol. 4,P.22-23.

پاکەو هیچ مەودایەك لەنێوان ئەوو مەهدیدا نییە.[58] و رەنگە بەهەڵەدا نەچم ئەگەر بڵێم هەموو نیارە نوێکان کەئیسماعیل هێنایە ناو شیعەگەریی ئێرانەوە، هەر لەم چەمکە سۆفیگەرییەوە بوو، چونکە لەتوانای کەسێکدا نەبوو، یەکسەرە ئەو نیارانە بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێت، بەبێ ئەوەی پشت بە کەشفو داوای سرووشی رۆحی نەبەستێت.

لەزاری ئەوەوە دەگێڕنەوە، کاتێ تەبرێزی داگیر کرد، سەرەتادا ویستی بەزۆر شیعەگەری بسەپێنێت بەسەر خەڵکەکەیدا. هەندێ لەراوێژکارەکانی لەپیاوانی ئاییندا ئامۆژگارییان کرد، کەئەو کارە نەکات بەپاساوی ئەوەی دوو لەسەر سێی دانیشتوانەکەی سوننی بوون، و رێگە نادەن لەمینبەرەکانەوە سووکایەتی بەسێ جێنشینەکە بکرێت، بەڵام ئەو وەڵامیان دەداتەوە:( من پێم راسپێردراوە ئەو کارە بکەم، و خوداو ئیمامە پیرۆزەکان لەگەڵمدان، و من لەکەس ناترسم، ئەگەر ببینم کەسێ سەرپێچی دەکات، ئەوا بەکۆمەکی خودا، شمشێرەکەم هەڵدەکێشمو کەسیان بەزیندوویی ناهێڵم).[59]

بەهەر حاڵ دەتوانین بڵێین کەشا ئیسماعیل لەبری ئەوەی سوود بەشیعەگەری بگەیەنێت زیانی پێگەیاند، یان رەنگە هاوکات سوودو زیانی پێگەیاندبێت. لەلایەکەوە ژمارەی شیعەکانی زیاد کرد، چونکە زۆری لەئێرانییەکان هێنایە ناویەوە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە چەندین نیاری هێنایە ناو شیعەگەرییەوە کەزیانی پێگەیاندو ناوبانگی زڕاند، جگە لەوەی

[58] کامیل مستەفا شیبی( الفكر الشيعي والنزعات الصوفية حتى مطلع القرن الثاني عشر الهجري)–بەغدا1966–لاپەڕە413.

59-Edward Browne(op. cit.)vol 4, P.53-54.



شیعەی کرد بەمەزهەبی حکومی، و بەمەیش لاوازی کردو ئەو جەماوەرییە کۆنەی نەهێشت.

## ئامرازەکانی بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکە :

شا ئیسماعیل سووکایەتی کردن بەسێ جێنشینەکەی کرد بەئامرازێك بۆتاقیکردنەوەی ئێرانییەکان، هەرکەسە گوێی لەجنێو بووایە بەوان، دەبوا بەدەنگی بەرز هاوار بکات(بیش باد، کم ما باد)، و ئەم دەستەواژەیە بە زمانی ئازەربایجانی بەو مانایەیە کەبیسەر ئەو دەستەواژەیە پەسەند دەکاتو حەز بەجنێوی زیاتر دەکات، بەڵام ئەگەر بیسەر ئەو دەستەواژەیەی نەگوتایەتەوە، یەکسەر لەملیان دەدا. و شا فرمانی دابوو لەشەقامو بازارو لەمینبەرەکاندا بەئاشکرا جنێو بدرێت، و هەڕەشە لەوانە دەکرا کە ئەو کارەیان ئەنجام نەدەدا، کەلەملیان دەدرێت.

لەم بارەوە داستانێکی خۆش دەگێڕنەوە لەزۆر رووەوە، لەداستانەکەی گالیلۆ دەچێت کەراپێچی دادگا کرا لەئیتالیا، کەگوتبووی زەوی بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، و تەنیا بەنکۆڵی کردن لەو وتەیە لەسزادان رزگاری دەبوو، یەکێك لەزانایانی ناوداری سوننە کەشەمسودینی خەفەری بوو، ئەو کارەی کرد، کە لەکاتی هاتنی شا ئیسماعیل بۆشیراز ئەویش لەوێ بوو، و کاتێ هاتە بەردەم شا بۆئەوەی جنێو بەسێ جێنشینەکە بدات، ئامادە بوو بەتوندی نەفرینیان بکات، و

بەمەیش لەسەربڕین رزگاری بوو،و کاتیٚ لای شا هاتە دەرەوە، هاوڕێکانی سەرزەنشتیان کردو پێیان گوت:(چۆن لەئاییینەکەت هەڵگەڕایتەوەو سیٚ ئیمامەکەی خۆتت نەفرین کرد؟!) لەوەڵامدا گوتی:(...لەپێناوی ئەو سیٚ عەرەبەدا...من بەو هەموو گەورەیی و کەماڵەوە بکوژرێم؟!).[60]

شائیسماعیل لەپێناوی بڵاوکردنەوەی شیعەگەریدا، تەنیا پەنای نەبردە بەر تۆقاندن، بەڵکو بەئەنقەست پەنای بردە بەر ئامرازێکی دیکە، ئەویش ئامرازی پڕوپاگەندەو بڕوا پێهێنانی دەروونی بوو. فرمانی دا ئاهەنگێك رێکبخەن لەیادی کوشتنی حوسێندا، بەو شێوازەی ئیستا پەیرەوی دەکرێت.[61] ئەم ئاهەنگە پێشتر بویهییەکان لەبەغدا، لەسەدەی چوارەمی کۆچییدا دەستییان پێکردبوو، بەڵام پشت گویٚ خرابووو دوای ئەوان بەهێند وەرنەگیرابوو. دواتر شا ئیسماعیل هات و گەشەی پێداو(کۆڕی ماتەمینی)[62]خستە سەری. بەجۆریٚ کەکاریگەریی لەسەر دڵ هەبێت. رەنگە راست بێت ئەگەر بڵێین، یەکێك بوو لەگرنگترین هۆکارەکانی بڵاوکردنەوەی شیعەگەری لەئێراندا، چونکە بەهۆی ئەو رواڵەتانەی غەمگینی و گریانەوە کەتێکەڵ دەبێت لەگەڵ راگەیاندن و تەپڵ لێدان و شتی

---

[60] کامیل مستەفا شیبی(التقیە)–گۆڤاری (الایمان) لەژمارەی 5و 6، ساڵی دووەم –1965– لاپەڕە60.

[61] کامیل مستەفا شیبی(الفکر الشیعي) لاپەڕە415.

[62] نمایشی کارەساتی کەربەلا کەئیستا پێی دەڵێن(الشبیە) لەسەردەمی سەفەویدا دروست نەبوو، بەڵکو دواتر لەسەردەمی قاجارییەکاندا دروست بوو.



لەو جۆرە، دەبووە هۆی ئەوەی ئەو بیروباوەڕە بچێتە ناو ناخەوەو کاریگەریی لەسەر هەست و نەستە نادیارەکانی هەبێت.[63]

هەروەها شا ئیسماعیل فرمانی دا(شەهادەتی سێیەم) لەبانگدا دابنێن، کەبریتییە لە(أشهد أن علیا ولي الله)–وهەر لەسەدەی سێیەمی کۆچییەوە، هەندیٚ لەتوندڕەوان، ئەم شەهادەتەیان نێوئاخنی بانگ کردبوو، بەڵام شیعە میانڕەوەکان لەکاتی خۆیدا نکۆڵییان لەوە کردبووو پەسەندییان نەکردبوو، بەڵام ئیسماعیل بەشێوەیەکی بنجبڕانە شەهادەتی سێیەمی سەپاند،و تائێستایش ئەم شەهادەتە بەلای شیعەکانەوە مشتومڕی لەسەرە...

## شێخ عەلی کورکی:

---

[63] سەبارەت بەم بابەتە، بڕوانە کتێبی(دراسة في طبیعة المجتمع العراقي)ی نووسەر– بەغدا1965–بەشی نۆیەم.

شا ئیسماعیل لەساڵی 1524دا کۆچی دوایی کرد، هێشتا تەمەنی لە38ساڵ تێنەپەڕیبوو، کوڕەکەی تەهماسب شوێنی گرتەوە،و بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا لەپێکهاتەی کەسایەتیدا، جیاوازیی لەگەڵ باوکیدا هەبوو. ئەو دەسەڵاتی بەمیرات بۆ مایەوە،و بەئامادەیی بەدەستیکەوت، بەڵام باوکی دامەزرێنەری دەسەڵاتو فەرماندەی سوپاکانو جگە لەوەی دڵنیا بوو لەوەی سەرۆکی ئایینو دەوڵەت بوو پێکەوە، نیازی بەوە نەبوو کەس لەئایینو کاروباری ئەم دونیادا رێنمایی بکات.

هێشتا تەهماسب دەسەڵاتی بەدەستەوە نەگرتبوو، دەیزانی کەناتوانێت وەکو باوکی لەیەك کاتدا، سەرۆکی ئایینو دەوڵەت بێت. دکتۆر کامل شبیبی دەڵێت: شا تەهماسب بینی کە واپێویست دەکات نیاری بڵاوکردنەوەی شیعەگەری بەجێ بهێڵێت بۆ پسپۆران لەزانایانی ئایینی، بۆیە ئەرکی راپەڕاندنی ئەم ئەرکەی خستە ئەستۆی شێخ عەلی کوڕی عەبدولعالی کورکی.[64]

شێخ عەلی کورکی، خەڵکی گوندی کورك نوحی سەر بە بەعلەبەکە،و کاتێ شا ئەو ئەرکەی بۆ دەست نیشان کرد، نیشتەجێی نەجەف بوو،و کاتێ گەیشتە ئێران شا پێشوازییەکی بێ وێنەی لێکرد، دواتر فرمانێکی دەرکرد بۆسەرانسەری مەملەکەتەکەی، تیایدا ئاماژەی بەوە کرد کەشێخ عەلی خاوەنی راستەقینەی دەوڵەتە، بەوەی جێگری ئیمام مەهدی(صاحب الزمان)ە،و پێویستە لەسەر هەموان فرمانەکانی جێ

[64] کامیل مستەفا شیبی(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە416.



بەجێ بکەن،(کەسێك ئەو لەسەر کاری لاببات دانامەزرێتەوەو کەسێك ئەو دایبمەزرێنێت لابردنی نییە). شاموچەی باشی بۆبڕیەوەو چەند گوندێکی پێ بەخشی، تاوەکو سوود لەداهاتەکەیان وەربگرێت.

لەسەردەمی شا تەهماسبدا، شێخ عەلی کورکی بەکردەوە بوو بەفەرمانڕەوا–هەر نەبێ لەکاروباری ئایینییدا–و یەکێك لەمێژوونووسە ئێرانییەکان، بەم جۆرە وەسفی دەکات:(کەسێك دوای خواجە نەسیرودینی تووسی، وەکو شێخ عەلی کورکی، لەپێناوی بەرزکردنەوەی زانایانی مەزهەبی جەعفەریو برەودان بە ئایینی راستەقینەی دوانزە ئیمامی هەوڵی نەدا،و لەبواری قەدەغەکردنی خراپەکاری،و لەرەگو ریشە هەڵکەندنی یاساکانی بیدعەکاران،و نەهێشتنی لەشفرۆشی،و خواردنەوەی مەی،و سنووردانانو سزادانان،و دانانی فەرزو ئەرکەکان،و پارێزگاریی لەکاتەکانی نوێژی جومعەو جەماعەت،و روونکردنەوەی نیارە تایبەتەکان بەنوێژو خواپەرستی،و بەسەر کردنەوەی ئیمامەکانو بانگدەران،و نەهێشتنی ستەمی ستەمکارانو پیاوخراپان،و سزادانی تاوانبارانی خراپەکاریو یاخیبوان،و بەرنگار بوونەوەی پەیڕەوییکەرانی هەنگاوەکانی شەیتاندا، هەوڵی گەورەو چاودێرییەکی توندی هەبوو. خەڵکی هان دەدا فێری رێنماییە ئایینییەکانو رێورەسمەکانی ئیسلام بن،و لەرێگەی پابەندکردنەوە هانیانی دەدا...). و شێخ هەنگاوی بەرەو هیچ شوێنێك نەدەنا، ئەگەر کەسێکی لەگەڵدا نەبوایە، دروشمی شیعەگەریی هەڵنەگرتایە. چەندین فرمانی بۆسەرانسەری ئێران دەرکرد کەهەڵگری یاساکانی دادپەروەریو چۆنیەتیی هەڵسوکەوتی

فەرمانرەوایان لەگەڵ خەڵکی، لەوەرگرتنی سەرانەو باج و بڕەکەی و ماوەکەی دەرکرد. و فرمانی دا لەهەر شارو گوندێکدا، مەلایەك هەبێت پێش نوێژیی خەڵکی بکات و ڕێنمایی و ڕێساکانی ئایینیان فێر بکات...[65]

## کێشمەکێشی نێوان کورکی و قوتەیفی:

ئەو راستایەی شێخ عەلی کورکی گرتییەبەر، لەخزمەتی دەوڵەتی سەفەویدا، و گرتنە دەستی پلەو پایەی بەرز تیایدا، ئیرەیی گەلیٚ لەزانایانی هاوچەرخی شیعەی لەدژی خۆی وروژاند. ئەوان پێیان وابوو، بەپێی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆیان، هەر حکومەتێك ئیمام ڕێبەرایەتی نەکات ئەوە حکومەتێکی ستەمکارە، خزمەتکردن تیایدا حەرامەو ئەو باجەی ئەو حکومەتە لەخەڵکی وەردەگرێت بەزۆرەو بۆپیاوی ئایینی نەهاتووە، بڕێکی لێوەربگرێت، بەپێی ئەوەی لەقورئاندا هاتووە:(ولا ترکنوا الی الذین ظلموا فتمسکم النار). واتە پەنا بەوانە نەبەن کەستەمیان کرد، چونکە بەر ئاگر دەکەون.

شێخ ئیبراهیمی قوتەیفی لەسەرەوەی نیارەکانی کورکیدا بوو، و لەزانست و پێگەدا خۆی لەشانی دەدا، و ئەویش دانیشتووی نەجەف بوو. کاتیٚ پەیکی شا گەیشتە نەجەف بۆسپاردنی ئەرك بەشێخ کورکی، کێشمەکێشی نێوانیان دەستی پێکرد، چونکە دیاریی بۆهەردووکیان هێنابوو، و کورکی دیارییەکەی شای وەرگرت، لەکاتێکدا قوتەیفی

[65] موحسین ئەمین(أعیان الشیعة)-بەیرووت1958-بەرگی41، لاپەڕە176-178.



ڕەتیکردەوە. کورکی ڕەخنەی لەرەفتاری هاوڕێکەی لەرەتکردنەوەی دیارییەکەدا گرت و پێی گوت(هەڵەت کرد کەرەتتکردەوە، و یان کارێکی حەرام یان قێزەونت ئەنجام دا، کەپەیڕەویت لە ئیمام حەسەن نەکرد، کەدیاریی موعاویەی وەرگرت، لەکاتێکدا تۆ پلەو پایەت لە ئیمام بەرزتر نییە، و سوڵتانیش لەموعاویە خراپتر نییە).[66]

دوای ئەوەی کورکی داوای شای پەسەند کرد لەوەی لەخزمەتی دەوڵەتدا بێت، کێشمەکێشی نێوان ئەم دوو پیاوە توند بوو، و ئەوەی هێندەی دیکە کێشەی نێوانیانی توندتر کرد، ئەوەبوو کەکورکی هەموو ئەو نیارانەی پەسەند کرد کەدەوڵەتی سەفەوی هێنایە ئاراوە، و بەنووسین پشتگیریی لەهەموویان کرد، و قوتەیفی بەنامە هەموویانی رەتکردەوە.

گرنگترینی ئەو نامانەی شێخ عەلی کورکی نووسینی، ئەو نامەیەیە کەتایبەتە بەنیاری باج، لەژێر ناوی:(قاطعة اللجاج في حل الخراج)دا بوو، و قوتەیفیش بەنامەیەك لەژێر ناوی(السراج الوهاج لدفع عجاج قاطعة اللجاج)دا وەڵامی دایەوە. لەپێشەکی نامەکەی قوتەیفیدا، پێنج خاڵ هاتووە: یەکەم سەبارەت بەرێزی پاراستنی نهێنیی زانست و زانستی ئایینی، و دووەم سەبارەت بەسەرزەنشت کردنی زانایانی هەواداری سوڵتان، و سێیەم لەستایش کردنی ئەوانەی هاوکاریی خوازیارانی زانست دەکەن و سەرزەنشت کردنی ئەوانەی ئازاریان دەدەن، و چوارەم لەستایشی زانای کارگێڕو سەرزەنشتکردنی زانای بیٚ کردەوە، و پێنجەم سەبارەت بەگزیی شەرعی بوو. و دیارە ئەم پێنج خاڵە، هەر هەموویان رەخنەی

[66] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو) دیمەشق 1936-بەرگی5، لاپەڕە203.

ئاراستەکراو بوون بۆکورکیو ئەو کارانەی لەخزمەتی دەوڵەتدا، ئەنجامیانی دەدا. قوتەیفی لەنامەکەیدا، باج رەتدەکاتەوەو بەستەمو کاری زۆرداریی هەژمار دەکات،و ئاماژە بەوە دەکات کەشا داوای لێکردبوو، هەروەکو چۆن داوای لەکورکی کردبوو، بۆئەوەی کار بۆبرەوپێدانی ئایینو دەرخستنی چاکەی شیعەگەری بکات، بەڵام ئەو رەتی کردبووەوە، چونکە پێی وابوو ئەگەر ئەو حەرام وەربگرێتو نیاری ئایین پشت گوێ بخات، چۆن دەتوانێت برەو بەئایین بدات.[67]

وادیارە شێخ عەلی کورکی زێدەرەوی کردووە، لەپشتگیریکردنی داهێنانەکانی دەوڵەتی سەفەویدا، بەجۆرێ رەزامەندیی لەسەر چەند نیارێك دەربڕیوە کەنەدەبوا بەپێی شەرع رەزامەندیی لەسەر بدات–هەمووی یان هەندێکیو رەنگە هەرئەوە وایکردبێت نەیارانی، نازناوی(داهێنەری شیعە)یان بەسەردا بڕیبێت. یەکێك لەنامەکانی، ئەو نامەیەیە سەبارەت بەرێگەدان بەجنێودان، لەژێر ناونیشانی(نفحات اللاهوت في لعن الجبروت و الطاغوت)و یەکێکی دی، سەبارەت بە رێگەدان بەکڕنوش بردن بۆ بەندە،و سێیەمیش سەبارەت بەرێگەدان بەکرنوش بردن لەسەر خاکی حوسەینی.[68] ئەمەو کورکی چەندین نامەی دیکەی لەسەر بابەتگەلێکی دیکە نووسیوە،و قوتەیفی بۆهەر یەکێك لەو نامانە، وەڵامی خۆی هەبووە. ئەوەی سەرنج راکێشە ئەوەیە کەکورکی نامەیەکی سەبارەت بەوە نووسیوە کەدەبێ نوێژی هەینی ئەنجام بدرێت، لەکاتێکدا شیعە هەر لەدێر زەمانەوە

[67] سەرچاوەی پێشوو،ب4، ل186.

[68] کامیل مستەفا(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە414–416.



هەڵیانوەشاندبووەوە، چونکە مەرجی ئەوەیان بۆدانابوو، کەدەبێ سوڵتانێکی دادپەروەر لەئارادا بێت،[69] گومانی ئەوە دەکرێت کەکورکی بۆیە ئەو فەتوایەی دابوو، چونکە لەو بڕوایەدا بووە لەحکومەتەکی شادا دادپەروەری هەبووە.

ئەم کێشمەکێشەی لەنێوان کورکیو قوتەیفیدا بەرپا بوو، بووە هۆی دابەشبوونی زانایانی شیعە بەسەر دوو گرووپی ناکۆك بەیەکدی،و بەڵام ئەم دابەشبوونە زۆری نەخایاند،و بەسەرکەوتنی کورکیو هەوادارانی کۆتایی هات. هێندەیش قورس نییە دۆزینەوەی ئەو هۆکارەی ئەو سەرکەوتنەی لێکەوتەوە، چونکە ئەوە چاوەڕوانکراوو گونجاو بوو لەگەڵ سروشتی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، چونکە دەوڵەت هێندە پارەو پۆستی فریودەری هەیە، دەتوانێت ئەو گرووپە لەزانایان بەهێز بکات کەپشتی دەگرن،و ئەو لایەنەیش لاواز بکات دژی دەوەستنەوە.و بینیمان وڵاتە کۆنەکان–بەجیاوازیی بیروباوەڕو بۆچوونیانەوە– هەر ئەو کارەی دەوڵەتی سەفەوییان ئەنجام دەداو سەرکەوتنی باشیشیان تیادا بەدەست دەهێنا.

## کۆچ لەجەبەل عامیلەوە:

[69] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)ب5، ل203.

لەو کاتەی دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا سەریهەڵدا، جەبەل عامیل راپەڕینێکی زانستیی دانسقەی بەخۆوە بینی، ولەگەڵ بچووکیی شوێنەکەو ئەوەی ناوچەیەکی هەژاربوو، زیاتر لەهەر شوێنێکی دیکەی شیعەنشین، زانایانی ئایینیی زۆری تیادابوو.[70] و ئەم راپەڕینە هەر لەسەدەی چواردەیەمی زایینی-واتە سەدەی هەشتەمی کۆچی-یەوە دەستی پێکرد، و رۆژ بەرۆژ زیاتر گەشەی دەکرد.[71]

دەکرێ بڵێین جەبەل عامیل کەدەکەوتە ناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییەوە، لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی یاوز، بووە هۆی روودانی شتێك لەچەوساندنەوە-کەم تازۆر- لەسەر شیعەکان، ئەمە هاوکات لەگەڵ ئەوەدا رووی دا، کەدەوڵەتی سەفەوی زانایانی شیعەی بۆلای خۆی رادەکێشا و پارەو پۆستی فریودەری بۆهەڵدەڕشتن، و ئەمەیش بێگومان دەبووە هۆی ئەوەی زانایانی جەبەل عامیل، بەفراوانی بەرەو ئێران کۆچ بکەن. دکتۆر کامیل شبیبی دەڵێت: بەجۆرێ جەبەل عامیلییەکان بەلێشاو روویان لەئێران کرد کەلەمێژووی شیعەدا بێ وێنە بوو.[72]

بەناوبانگترینی عامیلییەکان کەروویان لەئێران کرد دوای کورکی، شێخ حوسێن کوڕی عەبدوسەمەد بوو، و لەپۆستی شێخی ئیسلامدا، شوێنی کورکی گرتەوە. هەڵسوکەوتی ئەم پیاوە جیاواز بوو لە کورکی، ئەو وەکو کورکی منەی خۆشگوزەرانی و پلەو پایەی نەدەکرد، و هەردەم

[70] لەراستیدا پەیدا بوونی وەها راپەڕینێکی زانستی لەشوێنێکی بچووکی وەکو جەبەل عامیل، نیارێکە سەرنج رادەکێشێت، و ئەو پرسیارە دەوروژێنێت کە ئەو هۆکارانە چین کەزەمینەیان بۆئەوە خۆش کرد؟ ئەمە بابەتێکی کۆمەڵایەتییە کەشایانی توێژینەوەیە.

[71] محەممەد کازم مەکی(الحركة الفكرية والأدبية في جبل عامل)-بەیرووت1963-ل 68.

[72] کامیل مستەفا شیبی(سەرچاوەی پێشوو)ل417.



ژیانی مامۆستاکانی خۆی لەجەبەل عامیلی لەبەرچاو بوو کەبەکوێرەوەری دەژیان، و رەنگە هەر بەبۆنەی ئەمەشەوە بووبێت کە بەدەست باری دەروونییەوە دەینالاند، و لەدوارۆژەکانی ژیانیدا، رووی لەسۆفیگەری و گۆشەنشینی کردو لەو پۆستە دوور کەوتەوە کەبۆی دیاری کرابوو. بۆحەج چوو، و لەوێوە رووی لەبەحرێن کردو تیایدا نیشتەجێ بوو، دواتر نامەی بۆکوڕەکەی شێخ محەممەد(بەهایی) نووسی، داوای لێکرد ئێران و دەرباری سوڵتان بەجێ بهێڵێت، لەنامەکەیدا هاتبوو:( ئەگەر ئەم دونیا هەڵدەبژێریت ئەوا برۆ بۆهیند، و ئەگەر ئەو دونیا هەڵدەبژێرێت، ئەوا برۆ بۆ بەحرێن، و ئەگەر نەئەم دونیا و نەئەو دونیات دەوێت، ئەوا لەولاتی عەجەمدا نیشتەجێ ببە). دواتر شێخ حوسێن لەبەحرێن کۆچی دوایی کرد، و هێشتا مەزارەکەی لەگوندی موسەلا[73] بەناوبانگەو خەڵکی بەمەبەستی تەواف، زیارەتی دەکەن.

## شا عەبباسی گەورە:

[73] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)-دیمەشق1948-ب 26، ل226-247.

لەسەردەمی شا عەبباسدا کەنازناوی(گەورە)یان پێ بەخشیبوو، دەوڵەتی سەفەوی بەبەرزترین شکۆمەندیی خۆی گەیشت. لەسەردەمی ئەم شایەدا، چیتر ئێران نیازی بەوە نەمابوو زانایان لەجەبەلی عامیل یان لەشوێنی دیکەوە رابکێشێت، چونکە توانایی ئەوەی پەیدا کردبوو، بەپێی پێویستی خۆی زانایان بەرهەم بهێنێت.

شا عەبباس لەساڵی 1588ی زاییندا، لەکاتێکدا تەمەنی لەحەڤدە ساڵ زیاتر نەبوو، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، و شتێکی خۆش دەگێڕنەوە بەبۆنەی وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتەوە، کەئەوە دەگەیەنێت عەقڵییەتی ئەو سەردەمە چۆن بووە، ئەویش ئەوەیە کە ئەستێرەناسان ئامۆژگاریی شایان کرد کەدەبێ لەماوەیەکی کورتدا، دەست لەدەسەڵات هەڵبگرێت، چونکە ئەستێرەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کەمەترسییەکی توند لەو ماوەیەدا تووشی خاوەن تەخت دەبێت، شایش ملی بەئامۆژگارییەکەیان داو بەشێوەیەکی کاتی، دەستی لەتەخت هەڵگرت، و پیاوێکی دەبەنگی بەناوی یوسف لەشوێنی خۆی دانا، و ئەم داماوە تەنیا سێ رۆژ لەسەر تەختی دەسەڵات مایەوە، و لەرۆژی چوارەمدا، شا داوای کرد بیکوژن و تەختەکەی لەدەست وەربگرنەوە. ئەوسا ئەستێرەناسان بەشایان گوت، ئەو شکۆمەندییەکی دوورو درێژو مەزنی دەست دەکەوێت.[74]

دیارە ئەم پێشبینییەی ئەستێرەناسان، سەرەرای سروشتە پڕوپووچەکەی، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پێکهێنانی کەسێتیی شا هەبوو، چونکە ئەو سرووشە دەروونییە بەهێزەی بەلاوە دروست کرد، کەبڕوای بەخۆی هەبێت بەپێی پێشبینیی ئەستێرەناسان،

74-Perey Sykes(A History of Persia)-London1958-Vol2,P.174-175.



کەشکۆمەندییەکی مەزن بەدەست دەهێنێت. نابێ لەم رووەوە، ئەوەیش فەرامۆش بکەین، کەگەلێ لەونیارانەی بەشتی پڕوپووچیان دەزانین و سووکایەتییان پێدەکەین، رەنگە کاریگەریی زۆر گرنگییان، لەسەر تاك و کۆمەڵگە هەبێت.

لەراستیدا، دەوڵەتی سەفەوی-کاتێ شا عەبباس جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت- لەسنوورەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا پێکەوە، رووبەرووی مەترسیی گەورە بووبووەوە. سەرەرای ئەو مەترسییەی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە روو بەرووی دەبووەوە، مەترسییەکی دیکە لەلایەن دەوڵەتی ئۆزبیك لەسنوورەکانی رۆژ هەڵاتەوە رووبەرووی دەبووەوە، و ئۆزبیکەکان ئەو کاتە توانییان، دوای ئابڵۆقەیەکی نۆمانگی، شاری هەرات داگیر بکەن، و دواتر تووس- ئەو شارەی مەزاری ئیمام عەلی کوڕی موسای رەزای تێدایە- داگیر بکەن، و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی سەربڕن، و گەنجینەی مەزارەکە بەتاڵان ببەن، و لەو شتانەی تاڵانیان کرد پارچە ئەڵماسێك بوو، بەئەندازەی هێلکە مریشکێك، و دواتر درێژەیان بەداگیرکاری دا تانەیشاپورو سەبزەوارو ئەسفرایین و تەبەس و چەندین شاری دیکەیان لەناوچەی خۆراساندا داگیر کرد.

شا عەبباس بەوەی زانی کەناتوانێت هاوکات لەدوو بەرەدا شەڕ بکات، ویستی ئاشتی لەگەڵ عوسمانییەکاندا بکات، تاوەکو خۆی بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئۆزبیکدا تەرخان بکات، و ئەوەی ویستی لەساڵی 1590دا بۆی هاتەدی ،و پەیمانێکی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بەست، و

پابەندبوو بەوەی ناوچەی ئازەربایجان و جۆرجیا و بەشێك لەلوڕستانی پیٚ بدات، و ڕێگە بەخەڵکی نەدات سووکایەتی بەسیٚ جێنشینەکە بکەن.[75]

دواتر شا ڕووی لەئۆزبیك کرد، و توانی بەباشی لەساڵی 1597دا بیانشکێنێت، و دواتر توانی ئەو ناوچانە بەدەست بهێنێتەوە کە لەدەستییان دابوو، بەتایبەتی شارۆچکەی پیرۆزی تووس. و لەو کاتەوە سەردەمێکی نویٚ لەئێراندا دەستی پێکرد، کەئێرانییەکان بە(سەردەمی زێڕین) لەمێژووی نوێی خۆیاندا هەژماری دەکەن.

## هەوڵەکانی عەبباس بۆئاوەدانکردنەوە:

شاعەبباس گەلیٚ خولیای ئاوەدانکردنەوە بوو، و لێرەدا بواری ئەوە نییە باس لەهەوڵەکانی بۆئاوەدانکردنەوە بکەین، بەڵام بەهۆی گرنگیی کۆمەڵایەتییانەوە، تەنیا ئاماژە بەدوو نیار دەکەین: یەکێکیان ئەوەبوو پایتەختی لەقەزوێنەوە گواستەوە بۆ ئەسفەهان، و چەندین کۆشکی گەورە و مزگەوتی جوانی تیادا دروست کرد، کەتائیستایش گەریدەکان لەئێراندا بۆی دەچن، و ئەسفەهان بەهۆی ئەوەوە بوو، وەکو نموونە بۆ گەشەسەندنی ئاوەدانی و شارستانی ئاماژەیان پێدەکرد و تەنانەت دەیانگوت(اصفهان نصف جهان)، واتە ئەسفەهان نیوەی جیهانە.

75-Carl Brockelmann(History of Islamic People)-Cornwall1947-P.325.



بەڵام نیاری دووەم ئەوەیە کەشا عەبباس بایەخی بەچاکسازیی مەزاری ڕەزای لەتووس داوە و گومەزەکەی بەئاڵتون زاخاو داوە. و ئەمەیش لەساڵی 1598دا ڕووی دا، و لەساڵی 1601دا، توانی ئەو پارچە ئەڵماسە دزراوە پەیدا بکات و بەفەتوای زانایان ناردی بۆ ڕۆم بەمەبەستی فرۆشتنی، و دواتر بەپارەکەی زەوی و موڵکی کڕی بۆمەزارەکە. و لەساڵی دواییدا، شا بەمەبەستی زیارەتی مەزارەکە، بەپیٚ لەئەسفەهانەوە بۆتووس ڕۆیشت-کەمەوداکەی هەشت سەد میلە- بەگەیشتنی بەدەستی خۆی فتیلەی مۆمە گەورەکانی بڕی کەمەزارەکەیان ڕووناك دەکردەوە، و دەگێڕنەوە کەشێخ بەهایی ئامادە بووە و چەند دێڕ شیعری تیادا خوێندۆتەوە، و تیایدا هاتووە کە پەرییەکان لەئاسمانەوە دابەزین و بەدەوری مۆمەکاندا هاواریان کرد: ئەی ئەوپیاوەی بەدوارد(مقەست)ەکەت فتیلەی مۆمەکان دەبڕی، ئاگاداربە باڵی جبرەئیل نەبڕی.[76]

دوای ئەوە شا عەبباس ئێرانییەکانی هان دەدا کە بەهەر شێوەیەك بووە، زیارەتی مەزاری ڕەزا بکەن، و ئەوەی لەم بارەوە ئەنجامی دا، ئەوەبوو لەهەموو ئێراندا، ڕێگە و بانی چاك کرد و پرد و خانی تیادا دروست کرد، بەشێوەیەك کەلە مێژووی ئێراندا بیٚ وێنە بوو. دەڵێن ژمارەی ئەو خانانەی دروستی کردن گەیشتە هەزار خان، هەریەکێکیان شوێنی سەدان کەس بەئاژەڵ و بارەکانیانەوە دەبووەوە، و لەبری ئەوە کرێیان لێوەرنەدەگیرا، و تا ئەمڕۆیش ئاسەواریان هەر ماوە.[77]

76-Percy.Sykes(Op.Cit.)Vol.P.181.

[77] محەممەد جواد مەغنییە(دول الشيعة في التأريخ)-نەجەف1964-ل132-133.

هەندێ لەنووسەران بایەخدانی شا عەبباس بەزیارەتی رەزا والێکدەدەنەوە، کەویستوویەتی بیکات بەئەڵتەرناتیڤی حەج لەلای ئێرانییەکانو، لەو نووسەرانە گەڕیدەی میسری محەممەد سابیتە کەدەربارەی شا عەبباس دەڵێت:(وای لەخەڵکی دەکرد نەچن بۆزیارەتی مەکە، لەبەر رقو کینەیان لەعەرەب،و بۆئەوەی ئەو بڕە پارەیەی لەو رێگەیەدا خەرجییان دەکرد لەوڵاتێکدا کە رقیان لێیبوو، بۆیان بمێنێتەوە...).[78] من پێموایە ئەمە رایەکە لەراڤەکردندا هەڵەی تێدایە، شا عەبباس لەراستیدا حەزی بەوە نەدەکرد ئێرانییەکان لەحەج کردن دوور بخاتەوە، واتە نەیدەتوانی ئەو کارە بکات، بەڵام تەنیا ئەوەی دەویست ئێرانییەکان زیارەتی مەزارە پیرۆزەکانی عیراق نەکەن، کە لەژێر کۆنترۆڵی نەیارە عوسمانییەکانیاندا بوون. ئەوەی لەم بارەوە شایانی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کەگەشتیارە ئێرانییەکان کەبۆزیارەتی شوێنە پیرۆزەکان دەچوون، لەسەردەمی عوسمانیدا، بەدەستی ئازاردانی منداڵان لەکۆڵانەکانی بەغداو کارمەندان لەقشڵەو فەرمانگەکاندا دەیانناڵاند،و گەلێ جار لەکاتی گەڕانەوەیاندا، سکاڵایان دەبردە لای شا، سەبارەت بەو ئازارانەی لەعیراقدا تووشیان دەبوو.

هەرچۆنێك بێت، مەزاری رەزا لەتووس-هەر لەسەردەمی شا عەبباسەوە- بوو بەیەکێك لەشوێنە گرنگەکانی کۆمەڵگەی ئێران،و

[78] محەممەد سابیت(جولة في ربوع الشرق الأدنى)-قاهیرە1952-ل 161.



چەندین جار بەبەردەوامی چاکسازی کراو گەورە کرا تائەمڕۆ،و لەتوانامانندا نییە دیمەنێکی تەواو لەسەر تەلارو نەقشو نیگارەکانو گەنجینەو زێڕیو ئەو هەموو موڵکەی روون بکەینەوە، چونکە لەباس نایەت. و ئەمڕۆ ئەو مەزارە دەوڵەمەندترین مەزاری پیرۆزەو لەرووی بیناو نەقشو نیگارو شتومەکی بەنرخەوە بێ وێنەیە.[79]

ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لەزیارەتکەر سەردانی مەشهەد دەکەنو ئەمڕۆ بەیەك ملیۆن مەزەندە دەکرێن، کەلەسەرانسەری ئێرانەوە -و لەعیراقو سەرجەم وڵاتە شیعەنشینەکانەوە رووی تێدەکەن. لەئێراندا ئەوەی زیارەتی رەزا بکات، نازناوی(مەشتی) پێدەبەخشن- واتە مەشهەدی. و ئەم نازناوە لەپێشەوەی ناوی خۆیەوە دادەنێن،و دەڵێن(مەشتی فلان) وەکو چۆن نازناوی (کەبلی)-واتە کەربەلایی- دەبەخشن بەوەی زیارەتی حوسێن بکات.

## داگیرکردنی بەغدا:

[79] جەعفەر خەلیلی(موسوعة العتبات المقدسة-قسم خراسان)-بەیرووت1968-ل258.

لەدوا سالانی سەدەی شانزەیەمدا، سێر ئینتۆنی شیرلی لەبەریتانیاوە ، لەگەڵ براکەی سێر رۆبێرتدا، سەردانی ئێرانی کردو لەنێوان پیاوەکانیاندا شارەزایەك لەدروستکردنی تۆپدا هەبوو، شا عەبباس ئەم دەرفەتەی قۆستەوەو پشتی بەو پیاوە بەست، بۆئەوەی تۆپ بۆسوپاکەی دروست بکات، بەجۆرێ بتوانێت بەرامبەر تۆپە عوسمانییەکان بوەستنەوە کە لەوسەدەیەدا، بەهێزترین تۆپ بوون لەجیهاندا.

لەساڵی1602دا، شا دەستی کرد بەپەلاماردانی سنووری عوسمانییەکان،و دوای دوو ساڵ بەهێزی تۆپە نوێکانی، توانی تەبرێز بەدەست بهێنێتەوە،و دوای ئەوە سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، تا توانی لەساڵی1623دا، بەغدا داگیر بکات–دوای ئەوەی سێ مانگ ئابلۆقەی خستە سەری، تیایدا خەڵکی منداڵیان دەخوارد،و نرخی کەر گەیشتە هەزار ئەقچە.[80]

دیارە شا عەبباس ئەوەی بەسەر بەغدادا هێنا کاتێ داگیری کرد، کە پێشتر شا ئیسماعیل بەسەریدا هێنای،و تۆبڵێ زیاتری بەسەردا هێنا، هەردوو مەزاری ئەبو حەنیفەو شێخ عەبدولقادری رووخاند، دواتر لیستی دابەش کرد بەمەبەستی تۆمار کردنی سونییەکان لەدانیشتوانی بەغدا، بۆئەوەی هەموویان لەناو ببات،و ئەگەر سەید دەراج کلیلداری حوسەین فریا نەکەوتایە، ئەوا شا ئەو کارەی ئەنجام دەدا. ئەو سەیدە پێگەیەکی تایبەتی لای شا هەبوو،و توانی گەلێ لەخەڵکی سوننی رزگار بکاتو

[80] عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين)–بەغدا1949–ب4 ،ل258.



ناوەکانیانی لەلیستەکەی خۆیدا تۆمار کرد، گوایا لەدۆستانی ئەهلی عەبا، واتە شیعەن،و لەکوشتن رزگاری کردن.[81]

شا عەبباس–دوای داگیر کردنی بەغدا– زیارەتی مەزارە پیرۆزەکانی کازمییەو سامەراو کەربەلاو نەجف کرد،و پارەی زۆری بۆ چاکسازیو دابەشکردنی خەڵاتو دیاری خەرج کرد،و لەچاکسازیدا، زیاتر بایەخی بەنەجەف دا،و خانی زۆری تیادا دروست کرد، بەمەبەستی حەوانەوەی گەشتیاران،و فرمانی دا جۆگەیەك لەژێر زەویدا لێبدەن، بۆهێنانی ئاو بۆناو شارەکە،و سەربازەکانی یارمەتی کرێکارانیان دا لەهەڵکەندندا، تا ئاویان گەیاندە شوێنێکی نزیکی شارەکە،و لەوێدا ئەستێلێکی دروست کرد لەسەردابێکدا، خەڵکی بۆ ئاو خواردنەوە بەپلیکانە دەچوونە خوارەوە.[82]

ئەوەی شا عەبباس ئەنجامی دەدا–بەوەی هاوکات دەیڕوخاندو بینای دەکرد،و دڵڕەقو بەبەزەیی بوو– شتێکی سەرسووڕهێنەر نەبوو، چونکە ئەوە کارێکە زۆربەی خەڵکی بەجیاوازیی چینایەتییانەوە، بەبێ جیاوازیی لەنێوان خەڵکی ئاساییو پاشادا ئەنجامی دەدەن، بەڵام رەفتاری پاشا ناوبانگ دەردەکاتو لەنێوان خۆیاندا دەیخەنە پاڵی، لەکاتێکدا رەفتاری کەسی ئاسایی، تەنیا چەند کەسێك پێی دەزانن،و دوای ماوەیەك لەبیر دەکرێت. ئەوەی حەز دەکات لەگەڵ خەڵکی هەموویاندا رەفتاری باش بێت، ئەوە کەسێکی ئاسایی نییە.

[81] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی4 لاپەڕە180.

[82] جەعفەر مەحبووبە(ماضي النجف وحاضره)–نەجەف1958–بەرگی1، لاپەڕە193.

سونییەکان شا عەبباس بەدێو لەقەڵەم دەدەن کە لەخراپەو ئازاردان زیاتر هیچی لەدەست نایەت، لەکاتێکدا شیعەکان بەکەسێکی پیرۆزی دادەنێن کەسەرقاڵی ئاوەدانکردنەوەو دادپەروەریو حەقخوازی بوو. گرفتی ئەم دوو تاقمە، لەهەندێ رووەوە، لەگرفتی ئەو دوو ژنە دەچێت، کە لەپێشەکیی ئەم کتێبەدا باسی شەڕی نێوانیانمان کرد، کەهەر یەکەیان دەیویست چاوی لەسەر ئەو ئازارە بێت کەتووشی کوڕەکەی خۆی بووە،و زێدەرەویی تیادا بکات، بەبێ ئەوەی گوێ بەرادەی ئەو ئازارە بدات، کەتووشی کوڕەکەی دی بۆتەوە.

دەگێڕنەوە دوو سوار لەسوارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، لەرێگادا نزیکی پەیکەرێکی کۆن بەیەك دەگەن،و لەسەر رەنگەکەی دەبێت بەدەنگە دەنگیان: یەکێکیان بەزەردی دەبینێت،و ئەوی دی بەشینی دەبینێت،و لەراستیدا پەیکەرەکە لەیەك کاتدا، زەردو شین بوو، چونکە هەر رووەی رەنگێك کرابوو کەجیاوازیی لەگەڵ رووەکەی دیکەدا هەبوو. هەردوو سوارەکە دەبێ بەشەڕیان، بەر لەوەی لەراستیی پەیکەرەکە بگەن،و هەر یەکەیان حەزی بەوە دەکرد دژی بۆچوونی ئەوی دیکە بێتو وایدەزانی بەرامبەرەکەی هەڵەیە یان نکوڵی دەکات. شەڕو شۆڕ شەکەتی کردن نەیانتوانی بەراستی بگەن،و تاکێشەکەی نێوانیان توندتر بوایە، ئەوا هەردووکیان زیاتر پێیان لەسەر رای خۆیان دادەگرتو زیاتر دەچوونەوە بەگژی راو بۆچوونی یەکدیدا.

## شێخ بەهایی:



لەسەردەمی دەوڵەتی سەفەویدا، ژمارەیەك لەگەورە زانایانو بیرمەندان پەیدا بوون، کەدوانیان گەلێ بەناوبانگ بوون: شێخ محەممەد کوڕی شێخ حوسێنی عامیلی، ناسراو بە(بەهایی)و مەلا محەممەد باقیری کوڕی مەلا محەممەد تەقی ناسراو بە(مەجلیسی).

بەهایی لەسەردەمی شا عەبباسی گەورەدا ژیاوەو بوو بەشێخی ئیسلامو لەلایەن شاوە پایەیەکی هەبوو کەکەس پێی نەگەیشت،و دەردەکەوێت خۆی هێندە دڵنیا نەبووە لەشانسی لەدونیادا،و هەروەکو بڵێی لە شێخ حوسێن کوڕی عەبدوسەمەدی عامیلی باوکییەوە خواپەرستنو سۆفیگەریی بۆمابووەوە، کەپێشتر ئاماژەمان بەهەندێ لایەنی کرد. لەنووسینەکانی لەکتێبەکانیدا باسی ئەوە دەکات، کەئەگەر باوکی نەهاتایە بۆ وڵاتی عەجەم، ئەویش تووشی بەتووشی سوڵتانەوە نەدەبوو.[83] جارێکیان لەوەسفی خۆیدا دەنووسێت:( ئەگەر باوکم–خودا رۆحی شاد بکات– لەوڵاتی عەرەبەوە نەهاتایە،و تێکەڵی پاشاکان نەبوایە، ئەوا من دەبووم بەپاکترین کەسو لەهەموویان زیاتر خواپەرست دەبووم، بەڵام ئەو لەو وڵاتە دەری کردم،و هێنامی بۆئەم دیارە،و تێکەڵی خەڵکی دونیاپەرست بوومو رەوشتی خراپیانم وەرگرتو چوومە پێستی ئەوانەوە، دواتر لەو تێکەڵبوونە، جگە لەسەر ئێشەو کێشمەکێش شتێکی دیکەم

[83] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی2، لاپەڕە235.

دەست نەکەوت، تاوایلیٚهات هەموو نەزانێك بەرنگارم دەبووەوەو هەر سستێك زۆرانی لەگەڵمدا دەگرت).[84]

بەهایی وەکو ئیبن سیناو هزرمەندە بەناوبانگە کۆنەکان، ئاگاداری هەموو زانستو هونەرەکانی سەردەمی خۆی بوو-و ئەمەیش نیارێك بوو دەرەتانی بۆدەرەخسا لەسەردەمە کۆنەکاندا، بەپێچەوانەی ئەم سەردەمەوە- بەڵام بەهایی لەوەدا جیاوازیی لەگەڵ ئیبن سینادا هەبوو، کەلەماتماتیكو ئەندازیاریدا بەناوبانگ بوو، لەکاتێکدا ئیبن سینا لەپزیشکیو فەلسەفەدا بەناوبانگ بوو، و لەبەهایی چەندین ئەفسانە دەگێڕنەوە، سەبارەت بەلێهاتوویی ئەو لەماتماتیكو ئەندازیارییدا، کەلەو ئەفسانانە دەچن کەسەبارەت بە ئیبن سینا لەمەڕ پزیشکی دەیگێڕنەوە، و هێشتا خەڵکی لەئێران چەندین داستان دەگێڕنەوە، کەزێدەرەویو بەشانو باڵ هەڵدانیان تێدایە.

بەهایی لەپۆستی(شێخی ئیسلام) بێزار بوو، بەهۆی ئەو پیلانو نەخشانەوە بۆی دادەڕێژرا کەبیرمەندە گەورەکان بەرگەی ناگرن، و حەزی لەژیانی سۆفیگەریو گەڕان بەدوای زانستدا دەکرد، وەکو موسڵمانەکانی سەرەتای ئیسلام، بۆیە جلی دەروێشی لەبەر کردو دەستی کرد بەگەڕان بەوڵاتە ئیسلامییەکاندا، وەکو تورکیاو وڵاتی شامو میسرو حیجاز، و بۆماوەیەك لەقودسدا مایەوە، و هەروەها لەدیمەشقو قاهیرەیشدا مایەوە، و دەڵێن گەشتەکەی نزیکەی سی ساڵی خایاند، و لەهەر وڵاتێکدا کەدەمایەوە، متمانەوسەرنجی زانایانی بۆلای خۆی رادەکێشا، چونکە

[84] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی44 لاپەڕە231.



دڵسۆز بوو لەداوای زانستدا، و ئازاد بوو لەبیرکردنەوەداو خۆی بەگەورە نەدەزانی.

بەهایی لەو گەشتە بەناوبانگەیدا، کتێبی(کەشکۆڵ)ی نووسی، و ئەم ناوەی لەو کەشکۆڵەوە وەرگرت، کە دەروێشەکان هەڵیدەگرنو ئەوەی تیادا دادەنێن کەکۆی دەکەنەوە، و ئەوە کتێبێکی بێ وێنەیە، و لەکەشکۆڵی دەروێشەکان دەچێت، لەبەر ئەوەی زانیاریی هەمە جۆرەی تیادایە، خوێنەر بابەتی فەلسەفیو سۆفیگەریو ئەدەبیو ئایینیو ماتماتیكو هتدی تیادا دەخوێنێتەوە. هەندێ لەنووسەران هەوڵیان دا لاسایی بەهایی بکەنەوە، چەندین کتێبیان نووسی، لەسەر رەوشی(کەشکۆڵ)، بەڵام بەئاستی ئەو نەگەیشتن-جیاوازیی لەنێوان داهێنەرو لاساییکەرەوەدا ئاسمان تارێسمانە!

ئەوەی لەنیاری بەهاییدا سەرنج راکێشە، ئەوەیە کەسونییەکان بەسوننی دادەنێنو شیعەکانیش بەشیعەی دەزانن، و کتێبەکەی(کەشکۆڵ) لەمیسرو ئێران پێکەوە رەواجی هەبوو، دواتر لەهەردوو وڵاتدا چاپ کرا، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە جیاوازیی لەنێوان هەردوو چاپی ئێرانیو میسریدا هەیە، کە لەچاپە ئێرانییەکەدا، شتی وای خراوەتە سەر کە لەگەڵ زەوقی دەوڵەتی سەفەویو ئەو بیروباوەڕانەی دایهێنا بگونجێت، و ئێمە نازانین ئایا ئەوە کاری نووسەر بووبێت، یان کاری ئەو کەسەی کتێبەکەی چاپ کردووە؟![85]

□□ عەبدوڵلا نیعمەت(فلاسفة الشیعة)، بەیرووت -لاپەڕە406.

## تیۆری بەهایی لەمەعریفەدا :

رەنگە گونجاو بێت-لەکاتێکدا ئێمە باس لەبەهایی دەکەین- بەکورتی ئاماژە بەتیۆرەکەی لە مەعریفەو لێبوردوویی ئاینی ئەو بکەین. پوختەی تیۆرەکەی هەروەکو لەکتێبی رەخنەگرانیدا هاتووە، ئەوەیە:(کەسی ئەرك پێسپێردراو ئەگەر هەوڵی خۆی خستە گەر، بۆبەدەست هێنانی بەڵگە، هیچی لەسەر نییە ئەگەر هاتو لەبیروباوەڕەکەیدا هەڵەبوو، و لەئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە ئەگەر لەسەر حەق بوو).

ئەم تیۆرە گرنگییەکی زانستیی گەورەی هەیە، ئەگەرچی سادەو رواڵەتی دێتە بەرچاو، لەراستیدا لەگەڵ نوێترین ئاکامەکانی توێژینەوە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکاندا دەگونجێت. گومانی ئەوەیش دەکرێت کەبەهایی لەگەشتە زۆرەکانیو تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکیو لەگەڵ هەڵگرانی بیروباوەڕی جۆراوجۆردا، ئەو زانیارییانەی کۆکربێتەوە. دەتوانین بڵێین کەهەر بیرمەندێکی خاوەن بیروبۆچوونی راست، ئەگەر زانیاریی لەسەر بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکان پەیدا کرد، ئەوا دەتوانێت راستییەکی روونیان تیادا بدۆزێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەخاوەن هەر بیروباوەڕێك بڕوای تەواوی بەراستیی بیروباوەڕەکەی خۆی هەبێت، گومانی تیادا نییە چەندە تیایدا قووڵ ببێتەوەو بیری لێبکاتەوە، ناتوانێت بیرەکەی خۆی بەدوور رابگرێت، لەو بەڵگەو قاڵبە لۆژیکییانەی کە لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیدا گونجاوە، بەومانایە کەمرۆڤ لەهەر بیروباوەڕێکدا، کە لەژینگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیەوە بەدەستی هێناوەو لەسەری پەروەردە بووە، سەرزەنشت ناکرێت، چونکە بەپێی بۆچوونی خۆی، ئەو بۆچوونەی راستە، هەروەکو چۆن ئێمە بیروباوەڕی خۆمان بەراست دەزانین، ئەگەر ئێمە لەژینگەکەی ئەودا پەروەردە ببووینایە، هەمان بیروباوەڕی ئەومان



دەبوو. بەکورتی مرۆڤ، گەلیٚ جار بەویستو بیرکردنەوەی خۆی بیروباوەری خۆی هەڵنابژێرێت، بەڵکو بەئامادەکراوی، لەژینگە کۆمەڵایەتییەکەیەوە وەریدەگرێت، دواتر وادەزانێت ئەوە باشترین بیروباوەرە کەبۆ مرۆڤ دابەزیوە-و ئەمەیش ئاکاری ملیۆنەها کەسە!

شایانی باسکردنە، جاحیزیش تیۆرێکی لێکچووی ئەم تیۆرەی بەهایی هەبوو،[86] بەڵام دژایەتی کراو دواتر ونبوو، و تەنیا چەند بەشێکی مایەوە کەرەخنەگران ئاماژەیان پێکردووە. جاحیز پێی وابوو کەسی نەخوێندەوار کەلە کوێرەدێیەك، یان لەژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی دابڕاودا دەژی، دەبینین جگە لەبیروباوەڕی خۆی نەبێت، هیچ دەربارەی بیروباوەڕەکان نازانێت، کەواتە ناتوانێت جگە لەچوارچێوەی ئەو بیروباوەڕەی خۆی، بیر بکاتەوە، و لەسەر ئەوەیش سەرزەنشت ناکرێتو خودایش لەسەر ئەوە سزای نادات، خودا بەپێی توانایی کەسەکە، ئەرکی بەسەردا دەسەپێنێت. جاحیز بەو ئاکامە دەگات، خوداوەند لەناو خوانەناساندا، تەنیا ئەوانە سزا دەدات کەبەرهەڵستکاری دەکەن، لەکاتێکدا دەرکی راستی دەکەنو خۆیانی لیٚ لادەدەن، لەپێناوی شوێنو پێگەیان، یان لەبەر هەر هۆیەکی لەو جۆرە، بەڵام ئەوانی دیکەیان-ئەوانەی خەڵکی رەشۆکنو زۆرینەیان پێکدەهێنن- ئەوە ستەمە سزا بدرێن، چونکە لەراستی تێناگەن، تەنیا لەرێگەی دابو نەریتو ئەو بیروباوەڕانەوە نەبێت، کەلەسەری پەروەردە بوون، و خوداوەندیش ستەم لەبەندەکانی خۆی ناکات![87] پێویست بەوە ناکات بڵێین، ئەم تیۆرەی کەجاحیزو بەهایی

[86] سەبارەت بە تیۆرەکەی جاحیز، بڕوانە کتێبی(منطق ابن خلدون في ضوء حضارته وشخصيته)ی نووسەر- قاهیرە 1962- لاپەڕە 49-52.

[87] ئەحمەد ئەمین(ضحى الاسلام)-قاهیرە 1943-بەرگی3 لاپەڕە134.

هەڵگری بوون، لەلایەن توندڕەوانەوە پەسەند ناکرێت، کەراهاتوون لەسەر ئەوەی بەچاوی دوژمنایەتیی توندەوە بڕواننە ئەو کەسانەی لەبیروباوەڕدا جیاوازن، و وایاندابنێن کەبۆهەتا هەتایە لەئاگردا دەمێننەوە، و نەپاڕانەوەی کەس بەدادیان دەگات و نەخوداوەند هیچ پاساوێکیان پەسەند دەکات. خەسڵەتی دەمارگیران ئەوەیە کەپێیان وایە راستی روونەو بەئاسانی دەکرێ پێی بگەین، لەرێگەی بەڵگەی هزرییەوە، و پێیان وایە ئەوەی بەپێچەوانەی ئەوانەوە بیر بکاتەوە، ئەوا بەرهەڵستکارانە لەراستی لایداوە، چونکە لەناخی خۆیدا، راستی دەزانێت،بەڵام دواتر بەئەنقەست لێی لادەدات. هەر ئەمەیش وا لەدەمارگیراندەکات، کەهەڵگری بیروباوەڕی جیاوازن، سڵ نەکەنەوە لەئەشکەنجەدانی نەیارانیان، یان سەربڕینیان، و ژن و منداڵیان لەناوببەن، بەبێ ئەوەی بەزەییان پیایاندا بێتەوە، و ویژدانیان بۆیان بجوڵێت.

لەسەردەمی خۆی و لەسەردەمانی دوای خۆیدا، زیاتر لەچەند پیاوێکی ئایینی، وەڵامی بەهاییان داوەتەوە. سەیر ئەوەیە یەکێکیان ویستی بەرگریی لەبەهایی بکات، و گوتویەتی:(نەیاران هیچ هەوڵی ئەوەیان نەداوە بەڵگە بەدەست بهێنن، و ئەگەر ئەو هەوڵەیان بدایە، ئەوا بەراستی دەگەیشتن.[88] دیارە ئەم پیاوەیش وەکو دەمارگیرانی دیکە، لەسەر بیروباوەڕێکی دیاریکراو پەروەردە کراوە، و پێی وابووە کەراستی روونە، و ئەوەی نەزانیوە کەئەو نەیارانەی لەسەر بیروباوەڕی دیکە پەروەردە کراون، هەر پێیان وایە راستی لەوەدا روونە-(وهەر تاقمەو دڵیان بەبۆچوونی خۆیان خۆشە).

[88] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی 44 ص23لاپەڕە238.



## محەممەد باقری مەجلیسی:

مەلا محەممەد باقری مەجلیسی لەدوا قۆناغی دەوڵەتی سەفەویدا ژیاوە، و لەساڵی 1699 واتە بەر لەرووخانی دەوڵەتی سەفەوی بەبیست و سێ ساڵ کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵێ رووەوە جیاوازیی لەگەڵ شێخ بەهاییدا هەبووە، ئێمە لێرەدا باسی دوانیان دەکەین:

یەکەم: مەجلیسی، بەپێچەوانەی بەهاییەوە، خۆشگوزەران ژیانی بەسەر بردووە، و لەو ژیانەیش دڵنیا بووەو پەسەندی کردووە. مەجلیسی پۆستی شێخی ئیسلامی لەسەردەمی شا سولەیماندا وەرگرتووە، و دواتر لەسەردەمی شا حوسێن، دوا پاشای دەوڵەتی سەفەویدا، بەمەبەستی رێزلێنانی، پۆستی مەلای گەورە-واتە سەرۆکی زانایان-ی وەرگرتووە.

دووەم: مەجلیسی بەتوندی پابەندی بیروباوەڕی خۆی بووەو ئامادە نەبووە بەراوردی بکات لەگەڵ هەر بیروباوەڕێکی دیکەدا، و دەوڵەتی هان دەدا نەیارانی خۆی بچەوسێنێتەوە، کە لەناو سنووری ئێراندا دەژیان، وەکو سوننییەکان و سۆفییەکان و ئاگر پەرستەکان و جوولەکەو مەسیحییەکان، و تەنانەت فەیلەسووفەکانیشیان بەسەلامەتی دەرنەدەچوون، چونکە بەهەوادارانی یۆنانییە خوانەناسەکانی دەزانین.[89]

مەجلیسی بەوە ناوبانگی دەرکرد، کەبەرهەمی زۆری هەبووە، بەتایبەتی بەکتێبی(بحار الأنوار) ناوی دەرکرد، کە لە(25) بەرگی گەورە

89-Laurence Lokhart(The Fall of The Safavi Dynasty)-Cambridge 1958-P. 70-71.

پێکهاتووە،و دیارە زێدەرەوی کراوە لەزۆری کتێبەکانیدا، تەنانەت دەڵێن ڕۆژانە نزیکەی پەنجا هەزار وشەی نووسیوە.[90] گومانی ئەوە دەکرێت کەهەموو ئەو وشانەی بەدەستی خۆی نەنووسیبێت، بەڵکو چەندین نووسەری هەبووە،و خۆی ڕێنموونی کردوون، بۆوەرگرتنی ئەوەی ویستویەتی لەسەرچاوەکانەوە،و ئەوەی یارمەتی داوە لەنووسینی کتێبەکەی(بحار الأنوار)دا، ئەوەیە کەکتێبی زۆری کۆدەکردەوە،و خۆیشی خولیای ئەو کارە بوو،و دەوڵەتیش بۆئەو مەبەستە یارمەتی دەدا، جارێکیان ئاگاداری دەکەنەوە کەئەو کتێبەی ئەو پێویستییەتی، لەیەمەندا هەیە، ئەویش ئاگاداری شای کردەوە،و شایش ، لەگەڵ دیاری زۆردا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی کتێبەکە بالیۆزێکی نارد بۆلای پاشای یەمەن.[91]

مەجلیسی کتێبی(بحار الأنوار)ی بەزمانی عەرەبی نووسی، لەکاتێکدا بەرهەمەکانی دیکەی بەزمانی فارسیین،و لەنووسینە فارسییەکانیدا، شێوازێکی سادەو ساکاری گرتەبەر، کەئەمەیش کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر گەلی ئێران، دەڵێن کتێبەکەی(حق الیقین) هۆکاری بەشیعە بوونی حەفتا هەزار سوننی بوو لەئێراندا.[92]

بەڵام کتێبی(بحار الآنوار) شتێکی دیکەبوو، ئەوە گەورەترین کتێبە بەلای شیعەکانەوە،و بەئینسکلۆبیدیایەکی گەورە هەژمار دەکرێت، چونکە

90-Edward Browne(Op. Cit.)Vol 2, P.404.

[91] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی44 لاپەڕە97–100.

[92] دوایت دۆندڵسن(عقیدة الشیعة)–وەرگێڕانی ع.م– قاهیرە1946–لاپەڕە302.



هەموو وتەکانی شیعەکان و هەواڵیان و زانستەکانیان لەخۆ دەگرێت. بەپێی هەندێ لەتوێژەران، مەجلیسی لەم کتێبەدا زیاتر لەوەی سوودی بەشیعە گەیاندبێت، سووکایەتیی پێکردوە، ئەو هەموو هەواڵ و داستان و ئەفسانانەی دەستی کەوتووە، لەو کتێبەدا بڵاوی کردۆتەوە–بەبێ ئەوەی جیاوازیی بکات لەنێوان باش و خراپدا– دواتر خستوویەتییە بەردەم هەموو ئەوانەی دەیانەوێت بیقۆزنەوە،و دواتر هاتۆتە سەر ماتەمینیخوێنان و وتاربێژانی مینبەرەکان، بەجۆرێ بەهەوەسی خۆیان دەتوانن چییان دەوێت لێی وەربگرن،و بەمەیش گوێی خەڵکییان پڕ کردووە لەئەفسانەو درۆو دەلەسە،و وایان لێکردوون لەجیهانێکی پڕ لەخەیاڵ، کەهیچ پەیوەندیی بەجیهانی واقیعەوە نییە بژین.

کاتێ کتێبی(بحار الأنوار) نووسرا، شا هەندێ لەسامانی تایبەتی خۆی بۆئەوە تەرخان کرد، تابۆقوتابییەکان دابینی بکات.[93] و کاتێ لەسەردەمی قاجارییەکاندا بردیان بۆچاپخانەی سەنگی لەئێراندا ، ئەمە یەکێك بوو لەو کتێبانەی کەبەتیراژی زۆر چاپکرا. و چەندین بەرگی هێنرا بۆعیراق، کەئەمەیش بووە هۆی ئەوەی زانیارییە بێ کەڵکەکانی لەناو عیراق، هەروەکو چۆن لەناو ئێراندا رووی دا، بڵاوببێتەوە.

[93] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی44 لاپەڕە98.

# بەشی سێیەم

## سەردەمی عوسمانی لەقۆناغی دووەمیدا

لەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی و لەکۆتایی سەدەی شانزەیەمدا، دەوڵەتی عوسمانی گەیشتە ئەوپەڕی دەسەڵات و گەورەیی خۆی، ئیتر دوای ئەوە بەرەو لەبەریەکهەڵوەشاندنەوە و کزبوون ڕۆیشت. لەگەڵ تێکچوونی سیستمی سوپای ئینکشاریدا، کاروباری دەوڵەتیش تێکچوو، و ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کەئەم سوپایە کەلەسەرەتادا، یەکێك بوو لەفاکتەرەکانی نەشونمای دەوڵەتی عوسمانی و گەشە کردنی، دواتر بوو بەیەکێك لەگرنگترین فاکتەری لەناوچوونی.

ساتیع حوسەری دەڵێت: سوپای ئینکشاری وردە وردە هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆی لەدەست دا، و دواتر بوو بەئامێری گەندەڵی و ئاژاوە، پەیوەندیی ئینکشارییەکان بەئۆردوگاکانیانەوە بچڕا، و زۆربەیان دەستیاندایە پیشەی دیکە، دوای ئەوەی کارتی(ئاڵفەکانیان)–واتە مووچەکانیان– دەفرۆشت بەو کەسانەی ئارەزوویان لێی هەبوو، هەروەکو چۆن بڕەبەش و قەواڵە دەفرۆشرێن، و تەنیا بۆئەوە کۆدەبوونەوە کەدەنگی یاخی بوون، یان داوای لابردنی وەزیرێك، یان لەسێدارەدانی چەند وەزیرێك رابگەیەنن، و کاتێ دەوڵەت ویستی ڕەوانەی شەڕیان بکات، کەمتر خۆیان لەبەردەم پەلاماری دوژمناندا دەگرت، بەڵام دەیانویست هەڵاتنیان لەشەڕەکاندا بەبڵاوکردنەوەی مقۆمقۆ لەنێوان خەڵکیدا داپۆشن، گوایا



سەرکردەکان ویستوویانە بیانفرۆشن بەدوژمنە خوانەناسەکان، بۆیە زۆرجار ئەو شەڕانەی دەوڵەتی عوسمانی پێی هەڵدەستا، تەنیا بەشکستی گەورە کۆتایی دەهات، و سنووری دەوڵەت وردە وردە بچووك دەبووەوە.[94]

سەیر ئەوەیە، لەوکاتەدا کەشا عەبباسی سەفەوی خۆی بۆداگیر کردنی بەغدا ئامادە دەکرد، ئینکشارییەکان لەئەستەنبوڵدا سەرقاڵی سووکایەتی پێکردن و ئاژاوەنانەوە بوون، و تا ڕادەیەك کەپەلاماری سوڵتان عوسمانی دووەمیان دا لەکۆشکەکەیدا–لەنێوان هاوسەرو کەنیزەکانیدا– بەسووکایەتی پێکردنەوە هێنایانە دەرەوە و دواتر کوشتیان، و لەوە بەدواوە، دەوڵەت بوو بەگەمەی دەستیان، و بەهەوەسی خۆیان وەزیریان دادەنا و لایان دەبرد، و پۆستیان بەوانە دەدا کەخەڵات و دیارییان بۆدەهێنان، پۆستەکانی دەوڵەت بەئاشکرا دەفرۆشران.[95] لەساڵی 1623دا–بەچەند ڕۆژ بەر لەداگیرکردنی بەغدا، لەلایەن شا عەبباسی سەفەوییەوە–ئینکشارییەکان سوڵتان موڕادی چوارەمیان لەسەر تەخت دانا، هێشتا منداڵێکی دوانزە ساڵەبوو، بەو گومانەی ملکەچی فرمانەکانیان دەبێت و دەبێت بەبووکەشووشەی دەستیان.

### سوڵتان موڕادی چوارەم:

[94] ساتیع حوسەری(البلاد العربية والدولة العثمانية)–بەیرووت1960–لاپەڕە47–48.

[95] محەممەد فەرید(تأريخ الدولة العلمية العثمانية)–قاهیرە1912–لاپەڕە125.

ئینکشارییەکان ئومێدیان بەسوڵتان مورادی چوارەم نەما، ئەو لەبری ئەوەی ببێت بەبووکەشووشەی دەستیان، توانی ئەوان بکات بەبووکەشووشەی دەستی خۆی. دەتوانین سەردەمی ئەم سوڵتانە گەنجە بەقۆناغی بووژاندنەوە لەجەستەی دەوڵەتە نەخۆشەکەدا دابنێین، بەڵام ئەم ماوەیە زۆری نەخایاند، چونکە لەتەمەنی بیستو هەشتساڵیدا کۆچی دوایی کرد،و بەمەیش دەوڵەتی عوسمانی پیاوێکی قارەمانی لەدەست دا، کەدەیتوانی هێزە لەدەستچووەکەی بۆبگێڕێتەوە.

سوڵتان موراد وەکو قارەمانە پێشووەکان خوێنڕێژ بوو، بێ بەزەیی بوو تائەوپەڕی،و دیارە ئەم خەسڵەتە لەسەردەمە دێرینەکاندا، پێویست بوو بۆ ئەوانەی دەیانویست مێژوو بجوڵێننو وزەی جەماوەر بقۆزنەوە، خۆ ئەگەر لەدەستی بدایە، ئەوا دەبوو بەگاڵتەجاڕی خەڵکیو گوێڕایەڵی فرمانەکانی نەدەبوون. لەراستیدا سوڵتان موراد لەستەمگەرییدا، شتێکی لەسوڵتانی پێش خۆی سەلیم یاوز کەم نەبوو، تەنانەن وایلێهات بۆدڵڕەقی بەنموونە دەیانهێنایەوە،و دەگێڕنەوە کەژیانی خەڵکی بەلاوە گرنگ نەبووە لەستایشکردنیدا. دەڵێن لەتاوان لێبوردنی نەبوو تەنیا بەسزادان نەبێت.[96]

تازە سوڵتان موراد دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتبوو، کەکەڵکەڵەی گێڕانەوەی بەغدا لەدەستی سەفەوییەکان کەوتە سەری، دواتر دوو جار هێزی گەورەی رەوانە کرد، یەکێکیان لەساڵی1624و دووەمیان لەساڵی 1630،و لەهەردوو جارەکەدا، بەتوندی ئابڵۆقەی بەغدایان دا، بەڵام سوپای عوسمانی ناچار بوو لەهەر جارێکدا، ئابڵۆقەکە هەڵبگرێتوبۆشوێنی خۆی بگەڕێتەوە.

[96] سیتون لوید(الرافدان)-وەرگێڕانی تەها باقیر وبەشیر فەرەنسیس- بەغدا-لاپەڕە244.



دیارە ئاژاوەگێڕیی ئینکشارییەکان یەکێك بوو لەهۆکارە سەرەکییەکانی ئەو تێکشکانەی رووبەرووی سوپای عوسمانی بووەوە،و سوڵتان موراد زانی کەناتوانێت دەست بەکارێکی سەربازیی یەکالاکەرەوە بدات، ئەگەر بێتو لووتی ئینکشارییەکان نەشکێنێتو ئاژاوەگێڕانی ناو ریزەکانی لەناو نەبات،و لەساڵی 1632دا بەمەرامی خۆی گەیشتو فرمانی دا ئەوانە بکوژن کە لەرووداوی دوا ئاژاوەگێڕیدا، دەستیان هەبوو.[97]

لەو کاتەدا کەسوڵتان موراد سەرقاڵی هەوڵە بێ فەڕەکانی بوو بۆگێڕانەوەی بەغدا، رای گشتیی سوننییەکان دژی مانەوەی بەغدا بوون لەدەستی عەجەمەکاندا. دەگێڕنەوە دەروێشێك رووی لەئەستەنبوول کرد، بەمەبەستی ئەوەی چاوی بەسوڵتان بکەوێتو سەرزەنشتی بکات، لەسەر ئەوەی کەدواکەوتووە لە(رزگارکردنی) بەغدا. لەرۆژی هەینیدا دەروێشەکە چووە ناو ئەو مزگەوتەوە کەسوڵتان نوێژی تیادا دەکرد، هەر کەچاوی پێکەوت بەرەو مزگەوت دەهات هاواری کرد بەسەریدا،و لەتوڕەییدا دەلەرزی، گوتی: تۆ لەناو پاسەوانو هاوسەرەکانتدا خۆت شاردۆتەوە،و سەرقاڵی رابواردنو خۆشگوزەرانیی خۆتی... ئایا نازانیت رافیزییەکان گۆڕی شێخ عەبدولقادریان هەڵتەکاندووە؟! دەڵێن سوڵتان، لەم قسانەی دەروێشەکە نارەحەت بوو،و سوێندی خوارد کەدەبێ بەغدا لەدەستی عەجەم رزگار بکاتو دووبارە مەزاری شێخ عەبولقادر، بەوجۆرەی شایستەی پلەو پایەی بێت، دروست بکاتەوە.[98]

[97] محەممەد فەرید(سەرچاوەی پێشوو)لاپەڕە125-127.

[98] مەدام دیولاڤوا(رحلة مدام دیولافوا)-وەرگێڕانی عەلی بەسری-بەغدا1958-لاپەڕە64-65.

## گێڕانەوەی بەغدا:

لەساڵی 1637دا، سوڵتان موراد بەبەرییەوە نەما و(تۆغی هومایۆنی) دەرهێنا، کەپەرچەمی تایبەت بوو، تەنیا لەکاتی پێویستدا دەردەکرا، و فرمانی دەرکرد بۆخۆئامادە کردن بۆداگیر کردنی بەغدا، بەمەرجێ خۆی سەرکردایەتیی لەشکرەکە بکات هەروەکو چۆن گەورەکانی پێش خۆی وەکو سەلیم یاوزو سولەیمان قانوونی ئەنجامیان دەدا. کاتێ سوپا لەئەستەنبووڵەوە بەڕێ کەوت، سوڵتان وەکو یارانی پێغەمبەر، کەروویان لەشەڕ دەکرد، جل و بەرگی عەرەبەکانی پۆشی. پێنج تۆپی گەورەی لەگەڵ خۆی برد: دوانیان ئەندازەی بیست هۆقە لەباروت و سیانیان ئەندازەی هەژدە هۆقە بوون[99].

کاتێ سوڵتان بەسوپاکەیەوە گەیشتە نزیکی بەغدا، و ئابڵۆقەی شارەکەی دا، فرمانی دا چادرە تایبەتەکەی خۆی(ئەوتاغ) لەکەناری رووباری دیجلە هەڵبدەن، لەبەرامبەر مەزاری ئەبو حەنیفە، بەبێ ئەوەی بچێت بۆزیارەتی، بەر لەوەی بەغدا بگرێت، و گوتی:( من شەرم دەکەم، بەر لەوەی بەغدا بگرم، زیارەتی بکەم). دەگێڕنەوە بۆخۆی چاودێریی کاروباری ئابڵۆقەی بەغدای دەکرد، بۆئەوەی ورەی سەربازەکانی بەرز بێت، و بەدەستی خۆی چەك و تفاقی شەڕی بەسەریاندا دابەش دەکرد، و رۆژانە سەردانی جەنگاوەرەکانی دەکرد لەسەنگەرەکانیاندا و هانیانی

[99] عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين)-بەغدا1949-بەرگی4 لاپەڕە209-210.



دەدا، و دەیگوت:(هەوڵەکانتان با لەپێناوی ئایین و شکۆمەندیی ئیسلامدا بێت و کەمتەرخەمی نەکەن، ئەمە رۆژی هەوڵدان و رۆژی ئەوەیە هەرچی لەتواناداا بێت بەکاری بهێنن...).[100] بەیانیان و ئێواران نوێژی دەکرد و لەخودا دەپاڕایەوە و چاوانی پڕ لەفرمێسك بوون.[101]

ماوەی ئابڵۆقەکە چل رۆژی خایاند و هەردوو لا جەنگاوەرانە بەرنگاری یەکدی بوونەوە. و لە22ی کانونی یەکەمی 1638دا، هەشت تۆپەکە بەدرێژایی هەشت گەز، لەرووی رۆژهەڵاتەوە کونیان کردە دیواری بەغدا، و عوسمانییەکان پێشڕەوییان کرد و شەڕ توند بوو لەنێوان ئەوان و ئێرانییەکاندا، لەو کەلەبەرەدا بەدرێژایی دوو رۆژی رەبەق، بەبێ ئەوەی نیشانەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن، ئەمەیش سوڵتانی ئاڵۆز کرد و توڕە بوو، و تەیار محەممەد پاشای سەرەك وەزیرانی خۆی سەرزەنشت کرد و بەترسنۆك لەقەڵەمی دا. و لەرۆژی سێیەمدا سەرەك وەزیران شمشێری دەرهێنا و لەکەلەبەرەکەوە بەسەرکردایەتیی هێزێك لەسەربازانەوە، بەهاواری(ئەڵڵا..ئەڵڵا) پەلاماریان دا، وەزیر بەنارنجۆکێك کوژرا، بەڵام سەربازەکان پێشڕەوییان کرد و دیوارەکەیان بڕی، و شار کەوتە ژێر دەستیان...

[100] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی4 لاپەڕە220-230.

[101] سیتون لوید(سەرچاوەی پێشوو) لاپەڕە245.

## قۆرتەکانی داگیرکردن:

هێشتا سەربازە عوسمانییەکان خەریك بوون دیواری بەغدا ببڕن، تابەکتاش خان سەرۆکی پاسەوانانی ئێرانی پەیامی نارد بۆسوڵتان موراد و خۆبەدەستەوەدانی خۆی و گاردەکەی راگەیاند، و فەرماندەکە بۆخۆی هات بۆ(ئەوتاغی) سوڵتان لەنێوان دوو ریز لەپاسەوانە بەجەربەزەکان بەڕێ کرا، تاگەیشتە بەردەستی سوڵتان، و ئەویش لێی خۆش بوو، و خەڵاتی بەهاداری پێشکەش کرد.

لەو کاتەدا، خەڵکەکە وایانزانی کەکوشتار تەواو بووە، و پەرچەمی ئاشتی بەسەر بەغدادا دەشەکێتەوە، بەڵام ڕووداوێك ڕووی دا هێشتا ناوەڕۆکەکەی بەوردی نازانرێت، لەپڕ بەغدای لەگەشبینییەوە گۆڕی بۆرەشبینی، و بەغا قەسابخانەیەکی بەخۆوە بینی، هیچی کەم نەبوو لەو قەسابخانانەی لەمێژوودا روویان داوە.

مێژوونووسان لەسەر دیاریکردنی هۆکاری قەسابخانەکە تەبا نین، تورکەکان بۆئەوەی دەگێڕنەوە کەپاسەوانە ئێرانییەکان مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدانیان پێشێل کردووە، و ئێرانییەکان بۆرۆحی تۆڵەسەندنەوەی توندی سەربازە عوسمانییەکانی دەگێڕنەوە، کاتێ چوونەتە ناو بەغداوە. هۆکەی هەرچییەك بێت، عوسمانییەکان دایان بەسەر گاردە ئێرانییەکەداو قەتڵوعامیان کردن، بەجۆرێ تەنیا سێ سەد



سەربازیان خۆیان بەدەستەوە دا، لەکاتێکدا ژمارەیان لەکاتی خۆبەدەستەوەدانەکەدا، نزیکەی بیست هەزار دەبوو.[102]

ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کەچەند ڕۆژێك دواتر، قەسابخانەیەکی دیکە ڕووی دا، و هۆکارەکەی بەهۆی تەقینەوەی گەنجینەیەکی باروت بوو لەبەغدادا، کەبووە هۆی کوشتنی هەشت سەد کەس لەئینکشارییەکان، ئەوسا سوڵتان فرمانی قەتڵو عامی دا بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوە. و مێژوونووسان-لێرەیشدا- جیاوازییان هەیە لەبۆچوونەکانیاندا، سەبارەت بەوانەی بەر قەتڵوعامەکە کەوتوون. مێژوونووس کریسی دەگێڕێتەوە کە قەتڵوعامەکە دانیشتوانی بەغدای گرتەوە-ڕەنگە مەبەستی شیعەکانی ئەو شارە بووبێت- و لەمێژوونووسە تورکەکان دەگێڕنەوە کەژمارەی کوژراوەکان لەم جارەدا، گەیشتە سێ هەزار.[103] بەڵام مێژوونووس لۆنکریك ئەوەیشی دەخاتە سەر، کە: سوڵتان فرمانی دا سێ سەد زیارەتکەری ئێرانی بکوژن کە لەو کاتەدا بۆزیارەتی کازمییە هاتبوون، و هەروەها فرمانی دا هەزار دیل بکوژن کەخۆیان هاتبوونە بەردەستی، و یەکسەرە لەملیان درا.[104]

دوای ئەوەی قەتڵوعامەکە کۆتایی هات، پاشماوەی خەڵکی بەغدا ریزیان بەستو منداڵو ژنیان پێشی خۆیان داو هاواریان دەکرد(داڵدەمان

---

[102] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی4لاپەڕە229.

103-Edward Creasy(History of the Ottoman Turks)-Beirut 1961-P.256.

[104] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)-وەرگێڕانی جەعفەر خەیات-بەغدا1962-لاپەڕە 74.

بدەن)، ئیتر سوڵتان فرمانی دەرکردو داڵدەیانی دا،و سەربازانی سوپا بۆیان نەبوو خۆیان لەماڵو منداڵی خەڵکی بدەن،و راگەیاندرا هەرکەسێ لەخێوەتەکەیدا سامانی کەسێکی دی ببینرێت، ئەوا لەسێدارە دەدرێت.

دوای ئەوە، سوڵتان رۆیشت بۆزیارەتی ئەبو حەنیفە لەئەعزەمییەو گوتی(ئیستا کاتی زیارەت هاتووە) لەوێدا قورئان خوێندراو رازونیاز کراو مەڕیان سەربڕیو خێروخێرات بەخشرایەوە. دادوەر تاجودین مالیکی چەند دێڕ شیعری هۆنییەوە، کەرۆژی داگیرکردنەکە دیاری دەکات، تیایدا هاتووە:

خلیفة اللّه مراد غزا　　　　قلعة بغداد فأرداها

فلنشرحن فعل مراد بها　　　　مؤرخا قد ذبح الشاها[105]

لە17ی شوباتی ساڵی 1639دا، سوڵتان موراد لەگەڵ سوپاکەیدا، لەدەروازەی سوور- کەئەوسا پێیان دەگوت(ئاق قاپو)، واتە دەروازەی سپی، کەدواتر بەدەروازەی تەلیسم ناونرا- بەغدای بەجێ هێشت،و فرمانی دا بۆهەتا هەتایە ئەو دەروازەیە دابخرێتو دەمی دەروازەکە بەخشت هەڵچنرا. کاتێ سوڵتان گەیشتە ئەستەنبوڵ، بەگەرمییەکی بێ وێنەوە پێشوازیی لێکرا، بەجۆرێ سەربانو بن بانیماڵەکان پڕ بوو وخەڵکی لەشەقامەکاندا دەستیان بۆرادەتەکان،و لەکاتی رەتبوونی سوڵتان بەبەردەمیاندا، دەست بەسینگەوە وەستابوونو پیرۆزباییان لێدەکرد!

---

[105] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی4 لاپەڕە230-232.



سوڵتان بۆماوەیەکی زۆر چێژی لەو سەرکەوتنە وەرنەگرت، دوای ماوەیەکی کەم لەگەڕانەوەی بۆپایتەخت، تووشی تایەك بوو ماوەی پانزە رۆژ درێژەی هەبوو. ئەم تایە توندتر بوو بەهۆی مەی خواردنەوە، دواتر وارێکەوت کەخۆر گیرا، لەکاتی نەخۆشییەکەیدا،و بەمەیش ترس کەوتە دڵیەوە،و بەمەیش کاریگەریی نەخۆشییەکە زیاتر بوو لەسەری، تائەوەی گیانی دەرچوو.

## ( تۆپی ئەبو خوزامە ):

کاتێ سوڵتان موراد بەغدای بەجێ هێشت، یەکێك لەتۆپە قورسەکانی لەوێ بەجێ هێشت، بۆئەوەی لەدەروازەی قەڵا دابنرێت،و ئەم تۆپە لەلای خەڵکی بەغداو بەتایبەتی پیرەکانەوە بەشتێکی پیرۆز دانراوو چەندین ئەفسانەی لەسەر دروست بوو.

خەڵکی بەغدا ئەم تۆپەیان ناونا(تۆپی ئەبو خوزامە)،و هۆکەیشی بۆئەوە دەگێڕنەوە کەشەقێکی بچووك لەلوولەی تۆپەکەدا هەبووە وەکو کونە لووت وابووە،و ئەفسانە میللییەکان هۆی ئەو شەقە بۆئەوە دەگێڕنەوە کەتۆپەکە لەکاتی ئابڵۆقەدانی بەغدادا، لەئاسمان بووە،و خوداوەند فرمانی بەجبرەئیل کردووە دایگرێتە سەر زەوی، بۆیارمەتیدانی سوڵتان موراد بۆداگیرکردنی بەغدا،و جبرەئیلیش بەلووت رایکێشاوە. ئەفسانەی دیکەیش هەیە کەخەڵکی بەغدا دەیگێڕنەوە سەبارەت بەم تۆپە، لەوانە، ئەو نۆ ماسییە نەخشکراوەی ئەم لاو ئەولای تۆپەکە کاتێ پێوەی

لكێنراون كە(دەریای دەسەلاتی) بڕیوە، لەكاتی هێنانە خوارەوەی لەئاسمان، و دەڵێن كاتیٚ تۆپەكە لەسەر زەوی دادەنرێت، خاك و خۆڵی لەدەوری خۆی كۆكردۆتەوە و بەفرمانی خودا بووە بەنارنجۆك و دوژمنی پیٚ داگیراوە.[106]

هەروەها لەئەفسانەیەكی میللیدا هاتووە، كەسوڵتان موراد رۆژێكیان لەتۆپەكە توڕە دەبێت و بەمشتەكۆڵە لێی دەدات، و هێشتا ئاسەواری ئەو مشتەكۆڵەیەی پێوەماوە، كەهێمایەكە بۆبەهێزیی سوڵتان، و دەگێڕنەوە كەخودی تۆپەكەیش توڕە بووە-رەنگە بەهۆی مشتەكۆڵەكەی سوڵتانەوە- ئیتر خۆی خستۆتە ناو رووباری دیجلەوە، و ئەمەیش سوڵتانی ناچار كردووە بەلووت رایبكێشێت و بیهێنێتەوە كەناری ئاوەكە.

ئەفسانەكان گەیشتنە ئەوەی كەژنان زیارەتی تۆپی ئەبو خوزامە بكەن و قوربانیی بۆبڕیار بدەن، و پەتی پێوە ببەستن بەو شێوەیەی لەمەزارە پیرۆزەكاندا ئەنجامی دەدەن، و لەبەغدادا بووبوو بەباو كەكۆرپە دوای حەوت رۆژ لەلەدایكبوونی بهێنن و بەدەوری تۆپەكەدا تەواف پێبكرێت، و سیٚ جار سەری بكرێت بەناو لوولەكەیدا، و ئەم خووە تا ئەم دواییانەیش هەر ئەنجام دەدرا، كەسەید مەحموود شوكری ئالووسی ناچار كرد، لەكۆتایی سەردەمی عوسمانیدا، نامەیەك بنووسێت بۆرەتكردنەوەی، لەژێر ناوی:(وتەی بەسوودتر بۆبەرپەرچدانەوەی زیارەتی تۆپەكە). و لێرەدا بۆچوونی محەممەد بەهجەت ئەسری لەسەر ئەو نامەیە دەخەینە روو:

[106] عەزیز جاسم حەجییە(بغدادیات)-بەغدا 1968-بەرگی2 لاپەڕە139-140.



(وتەی بەسوودتر بۆ بەرپەرچدانەوەی زیارەتی تۆپەكە: نامەیەك بۆ بەرنگاربوونەوەی هەندیٚ لەدیاردەكانی بت پەرستی كەلەناو خەڵكی رەشۆكدا باوبوو، و ئەو تۆپە یەكێكە لەتۆپەكانی سوڵتان مورادی عوسمانی، كە لەشەڕ لەگەڵ فارسەكاندا بەكاری هێنان بۆدەركردنیان لەبەغدا، لەدەروازەی پێگەی سەربازیی لەبەغدا دانرا، وەكو هێمایەك بۆهێز، و بە(تۆپی ئەبو خوزامە) ناوی دەركرد. و چەندین ئەفسانەی بۆهۆنرایەوە، و شتی سەیرو سەمەرەی لەسەر دروست كرا، لەكاتی بەكارهێنانی بۆداگیركردنی بەغدا، هەروەكو بڵێی ئەوەی بەغدادییەكان هەستیان پێكرد لەشەرمەزاریی بەهۆی داگیركاریی فارسەكانەوە، وای لەخەڵكە رەشۆكەكەی بەغدا كرد ئەوداستانانە بهۆننەوە، هەروەكو بڵێی لەسەرەتادا، سەرنج راكێش بوو بەلایانەوە، و دواتر ئەو سەرسووڕمانە لەگەڵ رۆژگاردا بوو بەكاری پیرۆز، و ئیتر قوربانی و نەزریان بۆدەكرد و رازونیازی خۆیان بۆلای دەبرد و ماچیان دەكرد. بەمەیش هێندەی دی بەلایانەوە بەرزتر بووەوە، بەجۆریٚ نەیاندەتوانی خۆیانی لیٚ دوور بخەنەوە، و تەنانەت ئاموژگارییەكانیش لێی بیٚ نیاز نەدەبوون، و ئالووسی ئەم نامەیەی نووسی، و تیایدا مێژووی ئەم تۆپەو ئەو گەندەڵییانەی لێی كەوتەوە، تاوتویٚ دەكات، و پێشكەش بەموشیر هیدایەت پاشای كرد، بۆئەوەی والەخەڵكی بكات زیارەتی نەكەن و نەزری بۆنەكەن، و نامەكە وەرگێڕایە سەر زمانی توركی).[107]

[107] محەممەد بەهجەت ئەسەری(محمود شكري الآلوسي وآراؤه اللغوية)-قاهیرە1958-لاپەڕە 113.

خەڵكی رەشۆك وازیان لەوە نەهێناو ئەو تۆپەیان بەشتێكی پیرۆز دەزانی، تائەوەی گوێزرایەوە بۆ مۆزەخانەی جەنگی لە(دەروازەی ناوەڕاست) بەماوەیەكی كەم بەر لەشەڕی دووەمی جیهانی–ئەوەی لەبیرم مابێت– ئەوسا خەڵكی لەبیریان كردو كەراماتەكانیان فەرامۆش كرد. ماوەیەك لەمەو بەر، تۆپەكەیان هێنایەوە بۆگۆڕەپانی (مەیدان) نزیكی شوێنە كۆنەكەی خۆی، و سەكۆیەكی تۆكمەی بۆدروست كرا. ئەمڕۆ بەشوێنەوارێكی كۆن هەژمار دەكرێت و هیچ پیرۆزییەكی نەماوە.

## گەنج عوسمان:

دوای داگیر كردنی بەغدا، تەنیا(تۆپی ئەبو خوزامە) نەبوو كەپیرۆزیی بۆخۆی قۆرخ كرد، ، بەڵكو پیاوێك بەناوی(گەنج عوسمان) هاوبەشیی تۆپەكەی كرد لەو پیرۆزییەدا، و ئەم پیاوە یەكێك لەسەركردە سەربازییەكانی عوسمانی بوو، و بەر لەهاتنی سوڵتان موراد گەیشتە بەغدا، بەسەركردایەتی هێزێكی سەربازی، و حیلەو رەماحیەو كەربەلاو نەجەف داگیر كردو بەڵام بەر لەداگیركردنی بەغدا، كۆچی دوایی كرد، و دوای داگیركردنی بەغدا، تەرمەكەی گوێزرایەوە بۆبەغداو لەنزیكی سەرا بەخاك سپێردرا. خەڵكی بەغدا پێیان وابوو كەئەویش یەكێكە لەوانەی لەشەڕەكەدا شەهید بوون و لەنێوانیاندا ئەفسانە لەمەڕ كەراماتی بڵاوبووەوە. دەڵێن لەكاتی داگیر كردنی بەغدادا، پەرچەمێكی لەپێش سوڵتان مورادەوە هەڵگرتووە، و هەردوو دەستی بڕاوەتەوە، بەڵام پەرچەمەكە خۆی بەتەنیا رۆیشتووە، بەبێ ئەوەی كەسێك هەڵیبگرێت، و پەرچەمەكە نەكەوتۆتە زەوی، دوای ئەوە نەبێت كەخەڵكەكە بینیویانەو سەریان لەو كارە سووڕماوە.

ئیتر گۆڕی گەنج عوسمان بوو بەمەزارێك، و گومەزێكی لەسەر دروست كرا، و جۆگەلەیەك ئاوی بۆراكێشرا. لەساڵی1720دا، والی ناودار، حەسەن پاشا مەزارەكەی نوێ كردەوە، و لەسەر پەنجەرەی گۆڕەكە كەدەیڕوانی بەسەر شەقامەكەدا، ئەمەی نووسی:(ألا ان أولياء اللّه لاخوف عليهم ولا هم يحزنون.سەروەری شەهیدان گەنج عوسمان. حەسەن پاشای خێرخواز لەساڵی 1133ی كۆچیدا، چاكسازیی كرد).

لەساڵی1917دا، كاتێ بەریتانیا بەغدای داگیر كرد، فەتوا لەزانایانەوە وەرگیرا، بۆگواستنەوەی ئێسك و پروسكەكەی بەگۆڕستانی(الشهداء) لەعیوازییە، بەمەبەستی فراوانكردنی شەقامەكە، و دیارە ئەو فەرمانبەرەی ئەركی گواستنەوەی پێسپێردرابوو، نەیوێراوە ئەو كارە ئەنجام بدات، ئەو ئێسكانەی دەستی كەوتبوو، هەر لەشوێنی خۆیدا جێی هێشتبوو، بەبێ ئەوەی هیچی لێ بگوێزێتەوە، و تەنیا پەنجەرەكەی گواستبووەوە كەلەسەر گۆڕەكە دانرابوو، و لەسەر یەكێك لەگۆڕەكانی گۆڕستانی(الشهداء) دایتابوو.[108]

[108] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)–بەغدا1953–بەرگی5 لاپەڕە17–20.

## ئاشتیی نێوان دوو دەوڵەتەکە :

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر داگیرکردنی بەغدا بەدەستی سوڵتان موراد، پەیمانی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەویدا بەسترا، و لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەبەغدا لەقەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانیدا بمێنێتەوە، و لەبری ئەوە دەوڵەتی سەفەوی شارۆچکەی ئیرەوان لەئەرمینیا وەربگرێت. و وا لەچارەی ئەم ڕێکەوتننامەیە نووسرابوو کەدرێژ خایەن بێت، و نزیکەی (90) ساڵ بەبێ ئەوەی هیچ کوشتارو کێشەیەکی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە کاری تێبکات بەردەوام بێت.

لەساڵی 1674دا، مقۆمقۆی ئەوە بڵاوبووەوە لەبەغدا، گوایا کەدەوڵەتی سەفەوی بەنیازە بەغدا داگیر بکات، دڵەڕاوکێ لەنێوان خەڵکیدا بڵاوبووەوە، و بازاڕ تووشی کەسادی بووەوە، و جموجۆڵی کاروانەکان کزبوو، و دواتر دەرکەوت کەئەو مقۆمقۆیە ڕاست نییەو ئارامی بۆخەڵکەکە گەڕایەوە.[109]

هۆی بەردەوامیی ئەم ئاشتییە بۆئەوە دەگەڕێتەوە، کەدەوڵەتی سەفەوی لەو کاتەدا بەدەستی لاوازییو تێکشکانەوە دەیناڵاند، و توانایی ئەوەی نەمابوو شەڕ بکات، یان لەشەڕدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. شا سەفی کەدوای کۆچیی دوایی شاعەبباسی باپیری لەساڵی 1629دا، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، بەبەردەوامی سەرخۆش بووو نغرۆی

[109] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی5 لاپەڕە110.



ڕابواردنو خۆشگوزەرانی بوو، و گوێی بەکاروباری وڵات نەدەدا، و هەروەها کوڕەکەیشی شا عەبباسی دووەم، و شاسولەیمانی کوڕەزایشی ئەوانیش هەر وەهابوون. شا سولەیمان کەلەساڵی 1666 تاوەکو ساڵی 1694 دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، دەسەڵاتی بەخشی بەجووتە گونیومەلا محەممەد باقری مەجلیسی، بۆخۆیان مشتومڕیان بوو لەسەر دەسەڵات، و ئەویش سەرقاڵی مەیو ژنان بوو، و کاتێ گوتیان کەعوسمانییەکان بەنیازن پەلاماری وڵاتەکەی بدەن، هەمان وەڵامی موستەعسەمی عەبباسی دایەوە، کە: ئەو بایەخ بەپەلاماردانەکەیان نادات، بەمەرجێ ئەسفەهانی بۆبەجێ بهێڵن. کاتێ هەندێ لەوڵاتە ئەوروپییەکان باڵیوزیان بۆلای نارد بۆهاندانی لەسەر گێڕانەوەی بەغدا، کاتێ دەوڵەتی عوسمانی سەرقاڵی شەڕەکانی ئەوروپای بوو، وەڵامی دەدانەوە کەحەز بەوە دەکات پابەندی ئەو ڕێکەتننامەیەی نێوان خۆیو سوڵتانی عوسمانی بێت، و دەیەوێت بەئاشتی لەگەڵیدا بەسەر ببات. لۆکهارت لەسەر وەڵامەکەی دەڵێت:(نابێ هیچ گومانێك لەئارادا بێت، بەهۆی لاوازیی سوپای ئێرانو دابەزینی ورەی لەو کاتەدا، بۆیە ئەو بڕیارە لەشوێنی خۆیدا بووە، و بەڵام شیمانەی ئەوە دەکرێت کەبڕیارەکە دەرئەنجامی گوێ پێنەدان بووبێت، نەك بەهۆی ژیرییەوە).[110]

دەبێ لەم بارەوە ئەوە فەرامۆش نەکەین، کەدەوڵەتی عوسمانیش ، لەوسەردەمەدا، بەدەستی لاوازییو تێکشکانەوە دەیناڵاند، و ساتیع حوسەری یەکێك لەدیاردەکانی ئەو تێکشکانەی ڕوون کردۆتەوە، کەزۆربوونی پیاوانی ئایینی بووە، کەجڵەوی کاروباریان بەدەستەوە

110-Laurence Lockhart(The Fall of The Safavi Dynasty)Cambridge 1958-P.29-30.

بووه، و دەڵێت:ئەوان دابەش ببوون بەسەر چەند تاقمێکدا، هەندێکیان دادوەر، موفتی، ئیمام، وتاربێژ، سەید، شێخ، مامۆستا، تەلەبە، و دەروێش، و...هتد بوون، و ژمارەیان هەر لەزیاد بووندا بووە، و ساڵ بەساڵ نۆرێنیان زیاتر دەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا، ئاستی زانیارییان بەخێرایی بەرەو دواوە دەچوو، و لەنێوانیاندا دەمارگیریی کوێرانە بڵاوبووەوە، و لەوانیشەوە بۆ ناو خەڵکی تەشەنەی کرد، و بەسەر ئەقڵ و بیری فەرمانڕەوایان و سوڵتانەکاندا زاڵ دەبوو، و مێژووی عوسمانی پڕە لەو نموونانە: بۆنموونە، یەکێك لەسوڵتانەکان داوای لەشێخی موسڵمانان کردووە کەفالی بۆبگرێتەوە، تابزانێت کێ لێهاتووە بۆپۆستی سەرەك وەزیران، و پیاوێکی ئایینی بەسوڵتانێك رادەگەیەنێت کەپیاوێك لەپۆستێکدا دانەنێت، چونکە ناوەکەی لەوناوانە نەبووە کەپیرۆزن، و یەکێك لەفەرماندەکان دەست لەهەندێ لەرووداوەکانی شەڕ لەشەودا هەڵدەگرێت، چونکە پیاوانی ئایینی لەناو ریزەکانی سوپاکەیدا، شەڕی شەوانەیان بەو نیارانە لێکدەدایەوە، کە لەگەڵ رێورەسمی ئیسلامدا ناگونجێت. گەلێ جار پیاوانی ئایینی ئیمزایان کۆدەکردەوە لەپێناوی دانانی والییەکان و لابردنیان، بۆیە هەلپەرستان هەوڵیان دەدا، لەپێناوی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیاندا هەڵیان نێن.[111]

[111] ساتیع حوسەری(سەرچاوەی پێشوو) لاپەڕە51-52.



## تێکشکان لەعیراقدا:

ئەو تێکشکانە گشتییەی تووشی دەوڵەتی عوسمانی بوو، دەبوا عیراق بڕەبەشی خۆی لێوەربگرێت، و رەنگە راست بێت ئەگەر بڵێین بڕەبەشی عیراق لەو تێکشکانە گشتییەدا، بەجۆرێ لەجۆران، زۆرتر بوو لەبڕەبەشی هەندێ لەهەرێمەکانی دیکەی عوسمانی. عیراق وەکو تاراوگەیەك وابوو بۆوالی و فەرمانبەرە تورکەکان، چونکە ئەوانە کەمتەرخەمییان لەکارەکاندا دەکرد، هەروەکو چۆن ئەمڕۆ-بۆنموونە- فەرمانبەران ئەو کارە دەکەن لەزۆنگاوەکانی چبایشدا، و هیچ فەرمانبەرێك ئامادە نەبوو کاری تیادا بکات، مەگەر ئەو فەرمانبەرە نەبێت کەلەشوێنێکی دیکەدا ئیشی دەست نەدەکەوت، یان ئەو کەسەی وایدەزانی بۆماوەیەکی کەم لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە، تاوەکو سامانێك کۆبکاتەوە، لەپاشەڕۆژدا سوودی لێ ببینێت. هەرئەمە وایکرد دامودەزگا حکومییەکان لەعیراقی ئەو سەردەمەدا، لەخوارترین پلەی لاوازیو گەندەڵیدا بن.

پێویست بەوە ناکات بڵێین گەندەڵیی دەزگای حکومی لەوڵاتێکی وەکو عیراقدا، هەردەبێ ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی(تەوژمی خێڵەکی) تیایدا. حکومەت-هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد-گرنگترین پشتگیریی شارستانییە، و کاتێ حکومەت لاواز دەبێت، شارستانیش لەگەڵیدا لاواز دەبێت، و بەمەیش سیستمی ئاودێری تێکدەچێت و دانیشتوان

کەمدەبنەوەو شارەکان وێران دەبن،و ئەوسا هۆزە سارانشینەکان ئەو دەرفەتە دەقۆزنەوەو لەبیابانەوە دێن‌و تەشەنە دەکەنە ناو سەرانسەری ولاتەوە،و شوێنی حکومەت دەگرنەوە، بۆکۆنترۆڵ کردنی ڕێگاوبان‌و شارەکان. هەر ئەمەیش بەراستی، لەو قۆناغە(تاریکە) لەمێژووی عیراقدا رووی دا.

گەڕیدەی فەرەنسی تافرنیٚ، لەناوەراستی سەدەی حەڤدەدا، سەردانی عیراقی کرد،و کاتیٚ بیرەوەرییەکانی دەخوێنینەوە، کەلەو گەشتەیدا نووسیویەتی،[112] دەتوانین ئەوەی لێهەڵقۆزین کەزۆربەی ناوچەکانی عیراق، لەژێر کۆنترۆڵی هۆزە سارانشینەکاندا بوون،و ئەو هۆزانە لەئاستێك لەخۆشگوزەرانیدا دەژیان، کەباو نەبوو لەناو ژیانی سارانشینیدا، کەئەوە دەگەیەنێت باجی زۆریان لەسەر کاروانەکان‌و گەشتیاران دادەنا.

گەڕیدەی ئەڵمانی نیبور کەلەساڵی 1765دا سەردانی عیراقی کرد، سەبارەت بەو رەوشەی ئەو خێڵە سارانشینانە دەیانگرتە بەر، بۆوەرگرتنی باج لەکاروانەکان، دەڵێت: بازرگانان دەبوا بڕە پارەیەکی دیاریکراو، لەبری بارەکانیان لەکارواندا، بەسەرۆکی کاروان(سەرکاروان) بدەن، بەر لەوەی کاروان بکەوێتەڕیٚ، ئەم سەرۆکە ئەگەر تاقمێکی لەعەرەبە سارانشینەکان ببینییایە کەرێگە بەکاروانەکە دەگرن، بەسوارییی، لەگەڵ چەند کەسێك لەتاقمەکەی، بەرەو روویان دەڕۆیشت،و دانوستان دەستی پێدەکرد لەسەر

[112] جان بابتیَست تافرنیه(العراق في القرن السابع عشر)–وەرگێڕانی فەرەنسیس وگۆرگیس عەواد–بەغدا1944.



ئەو بڕە پارەیەی دەبوا ئەو پێیان بدات، لەبری ئەوەی کاروانەکەیان پاراستووە، لەکاتی رەتبوونی بەناوچەکەیاندا،و رەنگ بوو دانوستان لەنێوان دوو تاقمەکەدا درێژە بکێشێت،و رەنگ بوو بەهێزی چەك هەڕەشە لەیەکدی بکەن، تا لەکۆتاییدا رێکدەکەوتن،و کاروانەکەیش بیٚ وەی درێژەی بەرۆیشتن دەدا.

هەروەها نیبور سەبارەت بەگەشتی کەشتییەکان لەناو ئاوی فورات، لەنێوان بەسرەو حیللەدا، دەڵێت:(ئەم زەوییە بەپیتانە، ئێستا ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کەدوورن لەرووبارەوە، وەکو بیابان، لەبەر ئەوەی دانیشتوان‌و جۆگەی ئاوی تیادا نییە. گوندەکان گەلیٚ دوورن لە رووبارەوە،و بەشێوەیەکی ناشیرین دروست کراون،و دەردەکەوێت کەشێخە عەرەبەکان، شتێکی ئەوتۆیان بۆ دانیشتوانە هەژارەکان نەهێشتۆتەوە،و خانووو پەرژینەکان لەقامیش دروست کراون. بەکورتی لەهیچ شوێنێکدا کۆخی خراپتر لەکۆخەکانی ئەم ناوچەیەم نەبینیوە، کە بەسروشتیی بەپیتە،و لەکۆنەوە بەناوبانگ بووە، چونکە ناوچەیەك بوو بەدانیشتوانی زۆرەوە...).[113]

[113] کارستن نیبور(رحلة نیبور الی بغداد)–وەگێڕانی سوعاد هادی عومەری–بەغدا 1954–لاپەڕە67–69.

## یەکێتیی تیرەییەکان:

سەرهەڵدانی چەندین یەکێتیی گەورەی تیرەیی، و بەتایبەتی لەناوچەکانی باشووردا، یەکێك لەگرنگترین نیشانەکانی( تەوژمی سارانشینی) لەعیراقی ئەو سەردەمە بوو، کە مونتەفیق و خەزاعیل و زوبەید و بەنولام و قەشعەم بەناوبانگترینیان بوون.

هەر یەکێك لەم یەکێتییانە، لەدەوری سەرۆکێکی بەهێز، یان بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار کۆدەبوونەوە، و وردە وردە هۆزە بچووکە نزیکەکان دەچوونە ریزیانەوە، و تاهێزی یەکێتییەکان زیاتر دەبوو، ژمارەی ئەو هۆزانەی دەچوونە ریزیانەوە زیاتر دەبوون، تا لەدواییدا دەبوون بەنیمچە هەرێمێکی سەربەخۆ، تەنیا پەیوەندییەکی لاوازیان بە بەحکومەتی ناوەندەوە لەبەغدا دەما، کەئەویش (پابەندبوونی باج) بوو، و حکومەت گوێی بەوە نەدەدا سەرەك یەکێتییەکە هەڵسوکەوتی چۆن بوایە، مادامێك پابەند بوایە بەدانی ئەو بڕە پارەیەی کەدەبوا ساڵانە بیدایە، و گەلێ جار کەسەرەك یەکێتییەك هەستی بەوە بکردایە بەهێزە، ئەوا پارەکەی نەدەدا–هەمووی یان هەندێکی–ئەوسا شەڕ لەنێوان ئەوو حکومەتدا بەرپا دەبوو.

هەر تیرەیەکی بچووك بیزانییایە، ناتوانێت تەنیا بەهێزی چەکی خۆی بمێنێتەوە، و دەبوا بچێتە ریزی یەکێتییەکەوە، بۆئەوەی بەهۆیەوە



هێز پەیدا بکات، بەڵام ئەگەر بەتەنیا بمایەتەوە، ئەوا درەنگ یان زوو دراوسێ بەهێزەکانی دەیانماشییەوە. رەنگە ئەمە بۆ دانیشتوانی شارو گوندەکانیش روویدات، بۆیە دەبوا لەگەڵ یەکێك لەعەشیرەتە دراوسێ بەهێزەکاندا هاوپەیمان بن. تائێستایش ئاسەواری ئەم دیاردەیە لەهەندێ لەشارەکاندا ماوە–تاك لەشاردا لەگەڵ یەکێك لەعەشیرەتەکاندا رێکدەکەوت، کەپەیمانی دەدا لەدوژمنەکانی بیپارێزێت، و ئەگەر بکوژرایە تۆڵەی دەسەندەوە، و ئەویش لەبەرامبەردا بەڵێنی دەدا بەشداریی لەخوێنباییو... بکاتو، لەکاتی پێویستدا، لەگەڵیدا بەشداریی شەڕ بکات. زۆرجار دانیشتوانی شار دەکرێن بەدوو بەشی دژبەیەکدی، بەهۆی پشتگیرییان لەدوو عەشیرەتی نەیار بەیەك.

## کۆچی شەمەرو عەنزە:

لەساڵی 1640وە کۆچی شەمەر-هۆزە سارانشینە بەناوبانگەکە- لەشوێنە کۆنەکانیان لەناوەراستی دوورگەی عەرەبەوە بەرەو باکوور، بیابانی شام دەستی پێکرد، و هەر بەو بۆنەوە، شەڕی خوێناویی لەنێوانیان و نێوان هۆزی موالی کەنیشتەجێی ئەوێ بوون، دەستی پێکرد، و ئەو شەڕە ماوەی بیست ساڵ بەردەوام بوو، و شەمەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا و موالی بەرەو سنووری سوریا گەڕانەوە.

هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەوەدا رەت نەبووبوو، تاشەپۆلێکی سارانشینیی نوێ، لەناوەراستی دوورگەی عەرەبەوە دەستی پێکرد، کەئەمجارەیان لەلایەن هۆزی عەنزەوە بوو، و شەڕ لەنێوان عەنزەو شەمەردا، وەکو ئەوەی پێشتر لەنێوان شەمەرو موالیدا رووی دا، دەستی پێکرد. عەنزە توانی بەسەر فوراتدا، شەمەر رابماڵێت-بەرەو ناوچەی(جەزیرە) لەعیراق-دوای چەندین شەڕی گەورە، کەتائێستا سارانشینەکان بەسەرهاتەکانی دەگێڕنەوە.[114]

ئەم رووداوانە بوونە هۆی گۆڕانکاریی گەورە لەبالانسی هێزی خێڵەکایەتی لەعیراقدا، و هەروەها بووە هۆی ئەوەی بەخوێنێکی نوێی خێڵەکایەتی زاخاو بدرێت. کاتێ هۆزی شەمەر هاتنە ناوچەی(جەزیرە) هێشتا پارێزگاریی لەتوندوتیژیی خێڵەکایەتیی خۆی دەکرد، بەهەموو زەبرو زەنگ و خولیابوونی داگیرکردن و کوشت و کوشتارەوە، و هەربۆیە

[114] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو)لاپەرە79-80.



عەشیرەتەکانی نیشتەجێی ئەو ناوچەیە، ناچار بوون روو لەناوچەی دیکە لەباشوور یان رۆژهەلاتی رووباری دیجلە بکەن، و ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی چەندین عەشیرەتی دیکەیش ناوچەکانی خۆیان بەجێبهێڵن. بەو مانایە کەئەم دابەشکردنە خێڵەکایەتییە لەعیراقدا، تووشی ئەو شەپۆلە توندە بوو، کەشەپۆلی بچووکتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

## والیی ستەمکار:

لەکاتێکدا کەتەوژمی سارانشینی زاڵ بوو بەسەر عیراقدا-بەو شێوەیەی ئاماژەمان بۆکرد-والییەکان لەبەغدا، یەك بەدوای یەکدیدا دەهاتن، بەبێ ئەوەی هیچیان دەسەلاتی ئەوەیان هەبێت رێگە بەو عەشیرەتانە بگرن، یان ملکەچی حکومەتیان بکەن.

دوای ئەوەی لەسەر دەستی سوڵتان موراد لەساڵی 1638 دا بەغدا داگیر کرا، تاکۆتایی سەدەکە، نزیکەی سی والی هاتنە بەغدا، و هەر یەکەیان، وەکو سیتۆن لۆید دەڵێت: لەکاتی لابردنیدا، نەیتوانی کارێکی وا دوای خۆی بەجێ بهێڵێت، مەگەر دروست کردنی گومەزی مزگەوتێك، یان چارەسەر کردنی رووداوێکی شوومی وەکو شۆڕش یان گرانی نەبێت.[115]کەچی بەغدا لەساڵی 1704 دا والییەکی بەخۆوە بینی کە لەشێوازی والییەکانی پێش خۆی نەبوو، و بەیەکێك لەمەزنترین والی

[115] سیتۆن لۆید(سەرچاوەی پێشوو)لاپەرە247.

عوسمانی هەژمار دەکرێت، لەرووی هێزو لێهاتووییدا، ئەویش حەسەن پاشا بوو.[116]

ئەم والییە نوێیە تێگەیشت کە گەورەترین کێشە لەعیراقدا، کێشەی خێڵەکایەتیو کۆنترۆڵکردنی ڕێگاو بانە، و دیارە بوونی تۆپەکانی قۆستۆتەوەو ویستویەتی بەوان خێڵەکان بتۆقێنێتو ملکەچیان بکات. و وارێکدەکەوێت کەدزییەکی گەورە ڕوودەدات، لەلایەن هەندێ لەخێڵەکانەوە، دوای ماوەیەکی کورت، لەگەیشتنی حەسەن پاشا بۆبەغدا. شێخ عەبدورەحمان سویدی ئەو ڕووداوە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:

(لەم ساڵەدا، لەموسڵەوە چەندین کەڵەك بەڕێ کەوتن، وخۆراكو کەلوپەلی باشیان هەڵگرتبوو، لەکاتێکدا درێژەیان بەرێگەی خۆیان لەناو دیجلەدا دەدا، لەناوەراستی ڕێگە، بنەماڵەی شەهوانو بنەماڵەی غرێر لەعەرەبە سارانشینەکانی عیراقو تاقمە دووروەکان لێیان هاتنە دەست، و زۆربەی سامانو کەلوپەلەکانیان بەتاڵان بردو زۆربەی پیاوەکانیان کوشت، و پاشماوەکەیان هاتن بۆ بەغداو دادو فەریادیان بوو، و سکاڵای خۆیان بردە لای وەزیر، و هەر لەو ساڵەدا ئەو عەرەبە خێڵەکییانە، ڕێگەی کەرکوکیان گرتو هەموو گوندەکانی ئەو ناوچەیەیان تاڵان کردو هەرکەسێ بەرنگارییانی بکردایە دەیانکوشت).[117]

[116] ئەم والییە بە(جەدید حەسەن پاشا) ناوی دەرکرد، و هێشتا لەبەغدادا، گەڕەکێك هەیە بەو ناوەوە، و دەڵێن بەرەچەڵەك ئومەوی بووە، و بۆیە نازناوی(جەدید)یان لێناوە، بۆئەوەی جیابکرێتەوە لەو هاوناوەی کەپێشتر لەعیراقدا دەسەڵاتی هەبووە.

[117] عەبدورەحمان سویدی(حديقة الزوراء في سيرة الوزراء)–بەغدا1962–بەرگی1 ل18.



وادیارە، حەسەن پاشا ویستویەتی ئەو خێڵە عەرەبانە بکات بەپەند بۆئەوانی دیکە، بۆیە سوپایەکی بەهێزی، بەپاڵپشتی تۆپ ڕێکخستو خۆی سەرکردایەتی کرد، و لەشوێنێك لەباشووری موسڵ، بەناوی(خانووقە) چواردەوریاندانو تۆپبارانێکی خەستی کردن، و زۆربەیانی لەناو دا، و سەرکردەکەیانی دەستگیر کرد، و سەربازەکان سامانەکانیان تاڵان کرد، بەڵام ڕێگەی بەسەربازەکان نەدا، بەپێچەوانەی دابو نەریتی سەربازانی ئەو ڕۆژگارە، دەستدرێژیی بۆسەر ژنانیان بکەن.

کاتێ حەسەن پاشا سەرکەوتوانە گەڕایەوە بۆبەغدا، فرمانی دا نووسراوێکی توند بنووسنو بەچەندین وێنەو بیگشتێنن بەسەر هەموو خێڵو هۆزەکانی عیراقدا، و هەڕەشەیان لێبکەن. لێرەدا بەشێك لەو نووسراوە بڵاو دەکەینەوە، کەئەوە دەگەیەنێت بارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی عیراق چەندە سەیر بووە:

(دوای سوپاسی خودا، لەجیهانی پڕ لەگەندەڵی، و درووود بۆپێغەمبەر، بۆسەرکوتکردنی تاوانکارانو یاخیبوانو ئاژاوەگێڕان، و سڵاو لەبنەماڵەو یارانی پێغەمبەر، کەکاروباری خەڵکییان ڕێکخستووە. ئەم نووسراوەی من کەئاڕاستەی ئێوە کراوە، ئەی خەڵکی سارانشین... هەر لەدێر کاتەوە، فرمانتان پێکراوە ملکەچی فرمانەکانی سوڵتان بن، و ڕێگەی ئەوەتان پێنەدراوە کاری خراپە ئەنجام بدەنو یاخی ببن، و زێدەرەویتان کردووە، لەگەندەڵیداو یارمەتی تاقمی خراپەکاریو گەندەڵیتان داوە، و خەڵکی دادو بێدادیانە بەدەستتانەوە، لەهەر شوێنێکدا ئاگری شەرئەنگێزیتان کڵپەی سەندبێت، هەروەکو بڵێی بەپێچەوانەوە فرمانتان پێدرابێت، تەنانەت سامانتان تاڵان کردووە، و کوشتارتان کردووە، و پابەندی ڕێنماییەکانی ئیسلام نەبوونە...فریوی ئەوە نەخۆن کەزۆرن،

شمشـێرمان تیـژەو زۆرو بۆریتـان ناتانپارێزێـتو ڕمـی ئێمـە درێـژە...و زانایـان فـەتوای ئـەوەیان داوە خوێنتـان حەڵاڵـە،و خـاوەنی مـاڵو خێزانـی خۆتـان نـین. و ئەگـەر سـووربوون لەسـەر شـەڕکردن، ئـەوە بـاش بـزانن کـەدوارۆژتان نزیـك بۆتـەوە...ئەگـەر بۆئەوپـەڕی جیهـان بـڕۆن، بەئاسـانی پێتان دەگەین، و دروێنەی کەللەسەرتان، بۆئێمە کارێکی نوێ نییە).[118]

دیـارە خێڵـەکان گوێیـان بـەو هەڕەشـانە نـەدا، پێیـان وابـوو وەکـو هەڕەشـەو گوڕەشـەی والییـە پێشـووەکان وایـە، ئـیتر هێنـدەی نـەبرد کەبنەماڵەی لام پەلاماری دەوروبەری بەغدایان داو تەنانەت گەیشتنە خان بـەنی سـەعد. ئەوسا حەسـەن پاشا بەسـوپاو تۆپـەوە راوینـان، ئـەوانیش پـەنایان بـردە چـیای پشـتکێو، بـەڵام نـەیانتوانی لەدەسـتی قوتـار بـبن،و حەسـەن پاشـا دواتـر تـوانی گـورزی کوشـندەیان تـێ بسـرەوێنێتو سامانەکانیان تالاّن بکات.[119]

ئەمە سەرەتای چەندین شەڕی نێوان خێڵەکانو سوپای حکومەت بوو، بێ وچان بۆماوەی دە ساڵ بەردەوام بوو،و لەوماوەیەدا، حەسەن پاشا لەشەڕێکەوە بۆشەڕێکی دیکە دەڕۆیشت، لەگەڵ خێڵەکاندا. تەنیا خێڵی قەشعەم بەر گورزەکانی نەکەوت،چونکە لەبیابانی رۆژئاوای فوراتدا نیشتەجێ بوون،و سەرۆکەکەی شبیب، ملکەچی حکومەت بوو،و جێگەی متمانـەی والـی بـوو، بۆیـە خێڵـەکانی دیکـە بەچـاوی دوژمنایەتییـەوە سەیریان دەکرد،و دەیانویست سووکایەتی پێبکەن،و چەندین جار ماڵیان تالاّن کرد.[120]

[118] عەبدورەحمان سویدی(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی1 ل23.
[119] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)بەرگی5 ل165.
[120] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی5 ل184.



## پە یمانی مەزن:

ئـەو توندییـەی کەحەسـەن پاشـا گرتییەبـەر بۆسـەرکوتکردنی خێڵـەکان، هـانی کۆمـەڵێکی زۆریـانی دا، لـەکۆتایی سـاڵی 1708دا، هاوپەیمانییەك دروست بکەن دژی، بەسەرۆکایەتی(مغامس مانیع) گەورە شـێخی مونتـەفیق،و ئـەم شـێخە بەسـرەی داگیرکـرد،و لەلایـەن هـەموو خێڵەکانی شەمەرو خەزاعیلو زوبێدو مەیاحو غەزیەو بنەماڵەی سەرای،و بنەماڵـەی خالیـد کۆمـەكو یارمـەتییان بۆرەوانـە دەکـرد، تائەوەی ژمارەیـان گەیشتە زیاتر لەسەد هەزار کەس.

ئەم سوپا گەورەیە لەبیابان، لەنزیکی بەسرەدا، رووبەرووی سوپای حەسەن پاشا بوونەوە،و شەڕێکی خوێناویی لەنێوانیاندا رووی دا، دەڵێن ژمارەی کوژراوان گەیشتە دە هەزار،و لاشەکانیان لەگۆڕەپانی شەڕەکەدا لەسەر یەکدی کەڵەکە بوون. و شەڕەکە بەسەرکەوتنی سوپای حکومەت کۆتایی هات،و حەسەن پاشا بەزێڕو زیو ئەو کەسەی خەڵات دەکرد، کەکەللەسەر، یان دڵی یەکێك لەو کوژراوانەی بۆبهێنایە.

ئەو رووداوە بەیەکێك لەشانازییەکانی حەسەن پاشا دانرا،و کاتێ دوای سـەرکەوتنەکە گەڕایـەوە بۆبەغـدا، بەگـەرمی پێشـوازیی لێکـرا،و شـاعیران لەستایشـکردنیدا، چـەندین شـیعریان هۆنـدەوە،و هەنـدێکیان نازناوی(برای فاتیمە)یان پێ بەخشی.

مێژوونووس عەبباس عەزاوی دەگێڕێتەوە، کەخێڵە عیراقییەکان، ئەگەر لەو شەڕەدا سەرکەوتنیان بەدەست بهێنایە، ئەوا عیراق هەر لەوکاتەوە سەربەخۆیی بەدەست دەهێنا.[121] و بەندە لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، ئەو بۆچوونە بەراست نازانم، چونکە لەتوانای کۆمەڵی لەخێڵدا نییە، هەرچەندە بەهێز بێت، سەربەخۆیی سیاسی بۆوڵاتەکەی دەستەبەر بکات. سروشتی خێڵ وایە کەهاوپەیمانییان کاتییەو کێشمەکێشیان بەردەوامە، ئەگەر بواریان بۆرەخسا لەسەر نیارێك رێکبکەون، و سەرکەوتنێك بەدەست بهێنن، ئەوا هەر زوو تێکدەچن، هەر بۆیە ناتوانن بۆخۆیان کیانێکی جێگیر دابین بکەن.

ناکۆکییەکی سروشتی لەنێوان تیرەگەری و گەلاڵەبوونی دەوڵەتدا هەیە. ئەگەر ئەوسەرۆکی خێڵانەی گەلەکۆمەیان لەحەسەن پاشا کرد، سەربکەوتنایە بەسەریدا، سوودیان لەو سەرکەوتنە نەدەبینی، و گریمان ئەوکاتە دەیانتوانی دەوڵەتی عوسمانی لەعیراقدا دەربکەن، تارادەیەکی کەم کاریان راست دەبووەوە، چونکە بەشبوونیان بەسەر خۆیاندا، هانی وڵاتانی دیکەی دەدا، وڵاتەکەیان داگیر بکەن، ئەوسا دەبوون بەدوو تاقمەوە: تاقمێك لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەرو تاقمێك دژی. ئەمە خەسڵەتی خێڵە، لەهەر کات و شوێنێکدا، ناتوانن دەست بەرداری ببن، مەگەر ئەوکاتەی دەست بەرداری تیرەگەری ببن.

[121] سەرچاوەی پێشوو، ب5 ل179.



## بەشی چوارەم

## هەرەسهێنانی دەوڵەتی سەفەوی و پەیدابوونی نادر قولی

لەکاتێکدا، حەسەن پاشا سەرقاڵی ئەوەبوو خێڵەکان بهێنێتە ژێربارەوەو بنەماکانی دەوڵەتی عوسمانی لەعیراقدا سەقامگیر بکات– هەروەکو لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد– دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا، بەخێرایی بەرەو مەرگ دەچوو، بەپێی دەربڕینی مێژوونووسی بەریتانی سرجۆن مالکۆڵ(وەکو ساختمانێکی گەورە خەریکە دەڕووخێت).[122]

بەم دواییە، دەوڵەتی سەفەوی لەسەر دەستی خێڵێکی ئەفغانی هەرەسی هێنا، و لێرەدا شایانی ئاماژە بۆکردنە، دەوڵەتی سەفەوی لەرۆژانی هێزیدا، بەشێکی گەورەی وڵاتی ئەفغانی داگیر کرد، و سونییەکانی ئەو وڵاتەی چەوساندەوە، بەڵام نەیتوانی بیانکات بەشیعە، بەوشێوەیەی لەئێراندا بۆی کرا، و ئەفغانییەکان–بەتایبەتی خێڵەکییەکانیان– بۆدەرفەت دەگەڕان بۆئەوەی لەدەوڵەتی سەفەوی هەڵبگەڕێنەوەو تۆڵەی لێبسەننەوە.

122-Percy Sykes(A History of Persia)-London 1958-vol.2,P.237.

## میر وەیس:

لەساڵی 1707دا، میر وەیس یەکێك لەسەرۆك خێڵەکانی ئەفغان بۆ حەج رۆیشت، و لەوێ پرس و رای بەزانایانی مەزهەبی حەنەفی کرد- کەخۆی یەکێك بوو لەپەیرەوانی ئەو مەزهەبە- سەبارەت بەشەڕکردن لەگەڵ عەجەم و تالان کردنی سامان و کوشتنی ژن و منداڵیان، هەر هەموویان رێگەی ئەوەیان پێدا، تەنیا عەبدولکەریم سندی نەبێت، وەها فەتوایەکی نەدا. دوای ئەوەی میر وەیس لەحەج بووەوە، رووی لەمەدینە کرد و پارەیەکی زۆری خەرج کرد، تاوەکو بتوانێت لەمەزاری پێغەمبەردا بخەوێت، و بەونیازەی شەڕ لەگەڵ عەجەمدا بکات، لەو شوێنە خەوت، و پێغەمبەری لەخەودا بینی، کەشمشێرێکی کرد بەقەدیدا، میروەیس بەخۆشحاڵییەوە لەخەو هەستا، بەبڕوای ئەوەی پێغەمبەر مۆڵەتی پێدابێت شەڕ لەگەڵ عەجەمدا بکات، و سامانیان تالان بکات و ژن و منداڵیان بکوژێت.[123]

ئەم خەوەی میروەیس لەمەزاری پێغەمبەردا بینی، کاریگەریی زۆری لەسەری هەبوو، لەو سەردەمەدا، لەناو موسڵماناندا، وا باوبوو- و تائیستایش بەلای زۆربەیانەوە هەروا باوە- کەهەر کەسێ لەخەودا

[123] عەبدورەحمان سویدی(حدیقة الزوراء في سیرة الوزراء)-بەغدا1962-ب1 ل86.



پێغەمبەر ببینێ، ئەوا بەراستی بینیویەتی، چونکە شەیتان ناتوانێت خۆی بکات بەو، و بۆیە پێغەمبەر لەخەودا، هەرشتێك بەموسڵمانان بڵێت بەنیارێکی پیرۆز، یان بەپێشبینییەکی راستگۆیانەی دەزانن.[124] لێرەوە دەبینین میروەیس دەگەڕێتەوە بۆوڵاتەکەی، بەبڕوای تەواوەوە، بەوەی کەئەرکێك ئەنجام دەدات، کەپێغەمبەر پێی راسپاردووەو (بەپشتیوانی خودا) تیایدا سەرکەوتوو دەبێت.

ژمارەیەکی زۆر لەهەواداران، لەدەوری میروەیس کۆبوونەوە، جگە لەهەوادارانی لەهۆزەکەیدا، و دەستی کرد بەپەلاماردانی دەوڵەتی سەفەوی. لەساڵی 1709دا، یەکەمین سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا، کەشارۆچکەی قەندەهاری داگیرکرد، دوای ئەوەی فەرماندەکەی و هەموو پاسەوانە ئێرانییەکانی کوشت. ئیتر لەو کاتەوە، بزاوتەکەی وردە وردە گەشەی سەند، و سەرکەوتنی یەك بەدوای یەکدای بەدەست هێنا. لەماوەی چەند ساڵێکدا، توانی دەوڵەتێکی ئەفغانیی شکۆدار پێکبهێنێت.

[124] بۆئەو مەبەستە، بڕوانە کتێبی(الأحلام بین العلم والعقیدة) ی نووسەر-بەغدا، 1959- پێشەکی و بەشی یەکەم.

## میر مەحموود:

میروەیس لەساڵی 1715دا کۆچی دوایی کرد، و کوڕەکەی میر مەحموود لەشوێنی دانیشت، و تائەوپەڕی، کوڕێکی ئازا بوو، بەڵام لەلایەکی دیکەوە، تائەوپەری بیٚ بەزەیی بوو، و پێدەچێت تووشی نەخۆشیی(سادیزم) بووبێت.

میر مەحموود بەسوپاکەیەوە چووە ناو ئێرانەوە، و لەساڵی 1722دا، ئەسفەهانی پایتەختی داگیر کرد، دوای گەمارۆدانێکی توند، و شا حوسێنی دوا پاشای دەوڵەتی سەفەوی بەدیل گرت. رۆژێك لەساڵی دواییدا، لەئەسفەهاندا ئاهەنگێکی گەورەی گێڕا، نزیکەی سیٚ سەد کەس لەپیاوماقووڵانی ئەو شارەی بانگێشت کرد، و کاتیٚ هەموو کۆبوونەوە، فرمانی دا هەموویان سەربڕن، و لاشەکانیان توڕبدەنە گۆڕەپانی گەورەوە، دواتر کەسێکی نارد تاوەکو نزیکەی دووسەد لەمنداڵەکانیان سەربڕن. ئەوسا بڕیاری سەربڕینی سەرجەم ئەو سەربازە ئێرانییانەی دەرکرد، کە لەکاتی ئابڵۆقەدانی شاری ئەسفەهاندا، هاتنە ریزییەوە، و ژمارەیان سیٚ هەزار کەس بوو، هۆی سەربڕینیانی بەوە پاساو دەدایەوە، کەئەگەر ئەوان ئامادەبن خیانەت لەپاشای خۆیان بکەن، ئەوا لەدەرفەتی گونجاودا، خیانەت لەویش دەکەن. دیارە ئەو تازیاتر لەکوشتن بیری بکردایەتەوە، ئەوا زیاتر تینووی خوێن دەبوو، بۆیە بڕیارێکی دووەمی دەرکرد، بەکوشتنی هەر کەسێك لەخزمەتی پاشای پێشوودا بووبێت، و ئەو قەتڵوعامە ماوەی پانزە رۆژ درێژەی هەبوو، بەبیٚ ئەوەی هیچ هەوڵێك



بۆبەرگریی کردن بدەن، تەنانەت وایلێهات خەریك بوو ئەسفەهان چۆڵ ببێت.

لەساڵی 1725دا، میر مەحموود بڕیاری دا هەموو خێزانی سەفەوی بکوژێت تەنیا شا نەبێت، بەفرمانی ئەو، هەموویان لەگۆڕەپانی کۆشکدا ریزکران، و دەستیان لەپشتەوە بەستەوە، کەدوانیان منداڵی شا بوون، و میر مەحمود لەگەڵ دوان لەجەلادەکانیدا هاتنە پێشەوە، و بەشمشێر دەیانکوشتن. و لێرەدا دیمەنێکی یەکجار دڵتەزێن رووی دا، لەکاتێکدا شای پێشوو نزیك بوو لەشوێنی ئەو قەتڵوعامەوە، هەر کەگوێی لەهاتوهاواری کوژراوەکان بوو، بەپەلە بەرەو دوو منداڵەکەی هات و ئەوانیش داوای یارمەتییان لێکرد، وایاندەزانی دەتوانێت لەکوشتن رزگاریان بکات، و لەو چرکەساتەدا میر مەحموود شمشێرەکەی بەدەستەوە بوو، دەیویست دوو کوڕەکەی بکوژێت، شا دەستی هەڵبڕی بۆئەوەی شمشێرەکە لەسەریان دوور بخاتەوە، بەڵام نەیتوانی رزگاریان بکات، و میر مەحموود کوشتنی، و لەئاکامی ئەوەیشدا، شا بریندار بوو...

بۆئەوانەی ئەو دیمەنەیان بینیبوو، دەرکەوتبوو، کەمیر مەحموود تێکچووە، چونکە کەسیٚ ئەقڵی تەواو بێت وەها کارێك ئەنجام نادات. تەنیا چەند رۆژێك بەسەر ئەم رووداوەدا رەت نەبووبوو، تا بەروونی شێتیی لەمیر مەحمووددا دەرکەوت، ئیتر هەرکەسێك لێی نزیك بکەوتایەتەوە جنێوی پێدەدا، و لەهەڵچووندا گازی لەخۆی دەگرت.

دواتر سەرکردە ئەفغانییەکان بڕیاریان دا شا لەسەر کار لاببەن، ئەشرەف خانی ئامۆزای کە لەبەندیخانەدا بوو، ئازاد کرد و ئەویش توانی سەدان کەس لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، و پەلاماری کۆشکی شایانە لەئەسفەهان بدات و دەستی بەسەردا بگرێت. دوای سیٚ رۆژ میر

مەحموودیان بەمردوویی دۆزییەوە، ئیتر نەزانرا هەر خۆی مردبوو یانکوژرابوو،و لەرۆژی دواتردا ئەشرەف خان بوو بەپاشا.[125]

## دەنگدانەوەی رووداوەکان لەبەغدادا:

والی بەغدا حەسەن پاشا بەسڵکردنو ئاگادارییەوە، چاودێریی رووداوەکانی ئێرانی دەکرد،و لەئەستەنبوڵەوە فرمانی پێکرا، پێگەکانی بەرگریی خۆی بەهێز بکات، نەکا دوای ئەوەی ئەفغانییەکان لەداگیرکردنی ئێران ببنەوە، پەلاماری عێراق بدەن، ئەویش سەنگەرەکانی بەغدای ئامادەکردو دیوارەکەی چاکسازیی کرد.[126]

سەرەتا حەسەن پاشا ویستی میر مەحموود دابمرکێنێتەوە، نامەیەکی بۆنارد، تیایدا سەبارەت بەمەبەستی لەپەلاماردانی ئێران پرسیاری لێکردبوو. میر مەحمود لەوەڵامیدا وتبووی:(بەئەرکی ئایینیو پارێزگاریی لەئیسلامیی خۆی زانیبوو، کەوڵات لەو خوانەناسانە پاك بکاتەوە، کەگەندەڵییان لەسەر زەمیندا بڵاوکردبووەوە،و مەبەستی تەنیا ئایینی پیرۆزی ئیسلامەو هیچ مەبەستێکی دیکەی نەبووە،و هەروەها ئەوهەواداری دەوڵەتی عوسمانییەو لەوەوە کۆمەك وەردەگرێت، لەپێناوی

125-Laurence Lockhart(The Fall of The Safavi Dynasty)-Cambridge 1958-P.207-211.

[126] ستیڤن هیمسلی لۆنگریك(اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث)-وەرگێرانی جەعفەر خەیات-بەغدا 1962-ل 128.



پارێزگاریی لەسرووتەکانی ئایینی ئیسلامو نەهێشتنی خوانەناسیو گەندەڵی لەنێوان موسڵماناندا). میر مەحموود بەدەستی باڵیۆزی تایبەتی خۆی ناردی بۆبەغدا،و هانی حەسەن پاشای دا، تاوەکو یارمەتیی میر مەحموود بداتو بەهێزی بکات، بۆئەوەی سەرانسەری وڵاتی ئێران داگیر بکات،و ببێت بەهاوپەیمانێکی دڵسۆزی دەوڵەتی عوسمانی.[127]

دیارە حەسەن پاشا چاوی بریبووە ئێران[128]و هەرەسهێنانی خێرای دەوڵەتی سەفەوی بەدەستی هۆزە ئەفغانییەکان ترساندی،و رەنگە خەفەتی بۆخواردبێت، چونکە هەرەسهێنانی ئەو دەوڵەتە بەدەستی ئەو ئەنجام نەدرا،و بۆیە ئەستەنبوڵی هان دەدا، بۆئەوەی دەرفەتی گونجاو بقۆزێتەوە، بەر لەوەی کار لەکار بترازێت، بەشەکانی دیکەی ئێران داگیر بکات. ئەم هاندانە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەهاندانی ئەستەنبوڵدا. خێرا شێخ عەبدوڵڵای موفتی ئەستەنبوڵ فەتوایەکی دەرکرد، تیایدا لەپێناوی بەگژداچوونەوەی رافزییەکان داوای جیهادی کرد و پشتگیریی لەمیر مەحموود کرد. پوختەی فەتواکە، هەروەکو نووسەری کتێبی(دوحة الوزراء) دەیگێڕێتەوە، بەم جۆرەبوو:

(لەبەر ئەوەی رافیزییەکانی ئێران، هەر لەسەردەمی ئیسماعیلی سەفەوییەوە، گەندەڵی لەسەر زەویدا بڵاودەکەنەوە،و سووکایەتی بەیارانی پیرۆز ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان دەکەنو جگە لەعەلی هەموویان

[127] رەسووڵ کەرکووکلی(دوحة الوزراء)-وەرگێرانی موسا کازم نەورەس-بەیرووت-ل16-17.

[128] عەبباس عەزاوی(تاريخ العراق بين احتلالين)-بەغدا1953-ب5 ل202.

بەکافریان دەزانن، و سووکایەتیی بەعایشە دەکەن و پەیڕەویی لەمەزهەبی بێ ئاینەکانی پێش خۆیان دەکەن، و بەپێی ئارەزووی خۆیان ئایەتەکانی قورئان راڤە دەکەن، و سوننییەکان دەکوژن و ژنانیان بۆخۆیان حەڵاڵ دەکەن، و چەندین کاری قێزەونی دیکەیش، بۆیە وڵاتەکەیان بەقەڵەمڕەوی شەڕ هەژمار دەکرێت، و شەریعەتی ئیسلامییان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت، سەبارەت بەهەڵگەڕاوەکان و پێویستە بەرنگاریی بکرێنەوە و وڵاتیان لێپاك بکرێتەوە).[129] شێخی ئیسلام دوو فەتوای دیکەی لەلایەن زانایانی ئایین لەم بارەوە بەدەستهێنا، و ئەوەی تێبینی دەکرێت، ئەوەبوو کەلەماوەی نەوەت ساڵ لەوەوبەر، وەها فەتواگەلێ دەرنەدەکران–کاتێ پەیمانی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانیدا بەرقەرار بوو–دواتر بینیمان ، کاتێ دەوڵەتی سەفەوی لەدوا رۆژی ژیانیدابوو لەپڕ دەردەچێت. عەبباس عەزاوی لەم بارەوە دەڵێت:( لەم بارودۆخە سیاسیی و ئەو فەتوایانەوە دەردەکەوێت کەمەبەست داگیرکردنە، و ئاییینی کردبووە ئامرازێك بۆهەژاندنی رای گشتی. شێخی ئیسلام بۆدەرکردنی وەها فەتوایەك دواناکەوێت. ئێرانییەکانیش ، لەشەڕەکانیان لەگەڵ عوسمانییەکاندا هەروایان دەکرد...).[130] فرمان درا بەحەسەن پاشا کەئێران داگیر بکات. و ئەمیش سوپایەکی ئامادە کرد، چەندین خێڵی عیراقیی وەکو خەزاعیل بەشدارییان تیادا کرد، کاتێ گەیشتنە نزیکی کرماشان–لەساڵی

[129] رەسوول کەرکوکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل17.

[130] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل206.



1723دا– عەبدولباقی خانی فەرمانداری شارو پیاوماقووڵانی شار هاتن بەپیرییانەوە و کلیلی شاریان پێشکەش کرد، و حەسەن پاشا بەباشی رەفتاری لەگەڵ دانیشتوانی شارەکەدا کرد.

حەسەن پاشا زستانی لەکرماشاندا بەسەر برد، و دیاربوو ئەو جموجوڵانەی ئەو دواییە، ماندووی کردبووو تەمەنی حەفتا ساڵ بوو، و بەر لەهاتنی بەهار، کۆچی دوایی کرد. یاوەرانی پێیان باش نەبوو، لەوێ بەخاکی بسپێرن، نەکا دوژمنانی گۆڕەکەی هەڵبدەنەوە، سکیان هەڵدڕی و ریخۆڵەکانیان شۆردو پڕیان کرد لەمیسك و عەنبەرو کافوور، دواتر تەرمەکەیان گواستەوە بۆبەغدا، و لەپاڵی ئەبوحەنیفە لەئەعزەمییە بەخاك سپێردرا.[131] ئەو رۆژەی تەرمەکەی گەیشتە بەغدا، رۆژێکی خەمناك بوو، وخەموخەفەت خەڵکی داگرت و ژن و پیاو بۆی گریان، و ماتەمینی بۆگێڕدرا.

[131] عەبدورەحمان سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل111.

## ئەحمەد پاشا:

فرمانی سوڵتانی دەرچوو، کەئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشا، شوێنی باوکی لەویلایەتی بەغدادا بگرێتەوە، و ئەمە یەکەمو دواجار بوو، لەویلایەتی بەغدا، لەسەردەمی عوسمانیدا، کەکوڕێك شوێنی باوکی بگرێتەوە. لەراستیدا، ئەحمەد پاشا لەتوندیو کەسایەتیدا، شتێکی لەباوکی کەم نەبوو، و هەر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، یەکسەر بەسوپایەکی گەورەوە پەلاماری ئێرانی دا. لەبەهاری 1724دا، گەیشتە هەمەدانو شارەکەی گەمارۆ دا، بەڵام پاسەوانانی شار ئازایانە بەرگرییان لەشار کرد، بەڵام تۆپە باڵادەستەکانی عوسمانی توانییان کەلەبەرێك لەدیوارەکەدا دروست بکەن، و شەڕ کەوتە سەر شەقامەکانی شار، و سێ شەوو سێ رۆژ بەردەوام بوو. لەرۆژی سێیەمی شەڕەکەدا، رێکەوتی جەژنی قوربان بوو، و قوربانییەکانی ئەم شەڕە مرۆڤ بوون. دواتر بەئاگربڕ شەڕ کۆتایی هات، و یەکێك لەمەرجەکان ئەوە بوو، هەمەدان ببێت بەویلایەتێکی عوسمانیو ناوی سوڵتان لەنوێژدا بهێنرێت. کاتێ مژدەی داگیرکردنی هەمەدان بەئەستەنبوڵ گەیشت، ئاهەنگو شادییان گێڕاو سوڵتان بەدەستی خۆی سوپاسنامەیەکی بۆ والی ئەحمەد پاشا نارد.[132]

[132] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل131.



شایانی ئاماژەپێکردنە، لەکاتێکدا ئەحمەد پاشا سەرقاڵی ئێران بوو، خێڵە عیراقییەکان ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە، و بشێویی سەرانسەری وڵاتی گرتەوە–هەر لەشارە پیرۆزەکانەوە تادیاربەکر–ئەحمەد پاشا ناچار بوو، بەرەی شەڕ بەجێبهێڵێتو بەپەلە بۆبەغدا بگەڕێتەوە،[133] و گورزی کوشندەی لەخێڵە یاخی بووەکان وەشاندو سامانیانی تاڵان کرد. بەڵام هێشتا لەبەغدا نەگیرسابووەوە، دوای ئەو ماندووبوونو شەکەتییەی رێگا، تاخێڵەکان بەرەیەکی گەورەیان لەدژی پێکهێنا.

لەپاییزی 1725دا، هەواڵ بەبەغدا گەیشت، کەژمارەیەکی زۆر لەسەرەك خێڵەکان لەشارۆچکەی کەفەل کۆبوونەتەوە، لەوانە سەرۆکی شەمەرو بنەماڵەی لامو ساعیدەو بنەماڵەی شبلو سەرکردەی دیکە، و گوایا پەیمانێکی خێڵەکایەتی گەورەیان بەستووە، کەلەمێژووی عیراقدا بێ وێنە بوو. دواتر دەیاندا بەسەر گوندەکانداو رێگەیان دەگرت، و ئەم دۆخەیش ماوەی چەند مانگێکی پێچوو.

لەسەرەتای مایسی 1726دا، ئەحمەد پاشا لەپڕ پەلاماری ئەو هاوپەیمانییە خێڵەکییەی دا، و بۆخۆی ئازایەتییەکی بێ وێنەی نواند، و بەشمشێرەکەی ریزەکانی دوژمنی دەبڕی. شەڕەکە بەسەرکەوتنی ئەوو تێکشکانی خێڵە هاوپەیمانەکان کۆتایی هات. لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ بەغدا، شاعیران ستایشیان کرد، لەوانە شێخ عەبدوڵڵای سویدیو شێخ حوسێن راویو سەید عەبدوڵڵا ئەمینی فەتوا.[134]

[133] سەرچاوەی پێشوو، ل153.

[134] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل215.

## کێشەی عوسمانیو ئەفغانی:

کاتێ لەنیسانی ساڵی 1725دا، ئەشرەف خان دەسەڵاتی هەرێمی ئەفغانی بەدەستەوە گرت، کێشەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا دەستی پێکرد، و سەرەتا کێشەکە بەمشتومڕ لەسەر فیقهی ئیسلامو دواتر بۆشەڕە شمشێر گەورەبووەوە.

شایانی باسە، لەم بارەوە کەدەوڵەتی عوسمانی چەند ساڵێك لەوەوبەر، پەیمانی لەگەڵ روسیادا بەستبوو، و لەسەر دابەشکردنی ئێران رێککەوتبوون، و ئەشرەف خان ئەو پەیمانەی وەکو پاساو دەهێنایەوە، و سەرزەنشتی دەوڵەتی عوسمانی دەکرد، لەسەر ئەوەی هاوکاریی لەگەڵ وڵاتێکی مەسیحیدا دەکات،[135] و رایگەیاند کەئەو لەهەر کەسێکی دیکە لەپێشترە بۆفەرمانرەوایی ئێران، و دەبێ سوپای عوسمانی لەو ناوچانە بکشێتەوە.

ئەشەرف خان باڵیۆزێکی بەناوی عەبدولعەزیز سوڵتان نارد بۆئەستەنبوڵ، و باڵیۆزەکە کۆنووسێکی لەگەڵ خۆیدا برد، کەلەلایەن نۆزدە زانای ئەفغانییەوە مۆرکرابوو، کەتیایدا دانیان بەفرەئیمامیدا نابوو–واتە لەیەك کاتدا زیاتر لەجێنشینێك هەبێت– بۆئەوەی ئەشرەف خان مافی ئەوەی هەبێت دەسەڵاتی ئێران بەدەستەوە بگرێت، و لەکۆنووسەکەدا

135-Percy Sykes(Op. -136Cit.)vol.2,P.239.



هاتبوو کەئەوان بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر خالیدی کوڕی وەلید، بۆیە ئەوان لەپێشترن لەتورکەکانی بنەماڵەی عوسمان لەجێ نشینیدا، بەپێی ئەو حەدیسەی کەدەڵێت:(ئیمامەکان لەقورەیشن).

دەوڵەتی عوسمانی دەتوانێت هەموو بۆچوونێك پەسەند بکات، تەنیا ئەو بۆچوونە نەبێت کەدوودڵیی لەراستیی جێنشینییەکەیدا دروست دەکات، و بۆیە بەرپرسان لەئەستەنبوڵ گەلێ لەگەیشتنی باڵیۆزی ئەفغانی وەڕس بوونو کاتێ کۆنووسەکەی پێشکەش کرد، و یەکسەر زانایانی ئەستەنبوڵ کۆبوونەوەو کۆنووسێکی دژ بەویان نووسی، و تیایدا پشتیان بەو حەدیسە بەست، کەدەڵێت:(ئەگەر بەیعەت بۆدوو جێنشین کرا، ئەوا دووەمیان بکوژن). شێخی ئیسلامیش فەتوایەکی دەرکرد، کەناکرێ دوو ئیمام لەیەك کاتدا هەبێت، مەگەر ئەوەی بەربەستێکی گەورە لەنێوانیاندا هەبێت، ئەگینا دووەم بەیاخی لەقەڵەم دەدرێت، و کوشتنی ئەرکە.[136]

لەسەر فەتواکەی شێخی ئیسلام، فرمانی سوڵتانی دەرچوو، بەراگەیاندنی شەڕ دژی ئەشرەف خان، بەوەی لایداوەو فرمان نێردرا بۆئەحمەد پاشا لەبەغدا، و شێخ عەبدوڵلا سویدی، کە لەوکاتەدا گەورە زانای سونییەکان بوو لەعیراقدا، پشتگیریی لەفەتوای شێخی ئیسلام کردو فەتوای زانایانی ئەفغانی رەتکردەوە.

[136] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل217–219.

## شەڕی سەرسوورڕهێنەر:

لەکۆتاییدا، ئەحمەد پاشا لەگەڵ ئەشرەف خان، بەسەرۆکایەتیی سوپایەك، ژمارەکەی شەست هەزار کەس دەبوو، لەگەڵ حەفتا تۆپدا بۆشەڕکردن بەڕێ کەوت. هەردوو سوپاکە، لەبیستی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی1726دا، لەشوێنێك لەنێوان هەمەدان و ئەسفەهاندا، رووبەرووی یەکدی بوونەوە.

ئەشرەف خان دەیزانی سوپاکەی لەبەرامبەر سوپای عوسمانیدا لاوازە، چونکە تەنیا بیست هەزار جەنگاوەری هەبوو، و تۆپەکانی لەبەراورد لەگەڵ تۆپەکانی دوژمندا بچووك بوون، و بەڵام دەیزانی دەتوانێت هێزی دوژمنەکەی، ،و بەگزییەکی وەکو گزییەکەی موعاویە لەشەڕی سەفەیندا پەنای پێبرد، لەرێگەی پڕوپاگەندەوە سووك بکات.

ئەشرەف خان بڵاوکراوەی نارەزامەندیی لەشەڕی نێوان سونییەکاندا بڵاو کردەوە، و بەنهێنی لەناو سوپای عوسمانیدا بڵاویان کردەوە، و هەروەها خەڵات و دیاری بۆسەرۆك خێڵە کوردەکان نارد، کەسەر بەلایەنەکەی دیکە بوون. پلانەکەی ئەشرەف خان گەیشتە ئەوپەڕی، کاتێ چوار زانای رێزداری نارد بۆلای ئەحمەد پاشا، بۆئەوەی بەراشکاوی لێی بپرسن: چۆن رێگە بەخۆی دەدات، لەبەگژاچوونەوەی رافیزییەکاندا شەڕیان لەگەڵدا بکات، لەکاتێکدا وەکو ئەو سوننین، و ئەوانیش وەکو ئەو ملکەچی رێنماییەکانی ئیسلامن، ؟! لەو کاتەدا ئەو زانایانە مشتومڕیان بوو لەگەڵ ئەحمەد پاشادا، دەنگی بانگ بەرزبووەوە، بەبێ دەنگ هەموویان راست بوونەوە، لەناوەراستی سوپای عوسمانیدا نوێژیان کرد، و ئەمەیش کاریگەرییەکی دەروونیی قووڵی هەبوو لەسەریان.



ئەم شێوازە بلیمەتانە سوودی هەبوو، بۆلاواز کردنی ورەی سەربازە عوسمانییەکان، و دیارە ئەحمەد پاشا هیچ بایەخێکی پێ نەدا، بەهۆی ئازایەتیی خۆی و ئەوسوپا گەورەیە و ئەو تۆپە قورسانەی هەیبوو. کاتێ شەڕ دەستی پێکرد، ئەوسا هەستی بەوگورزە کوشندەیە کرد کەتێیان سرەواند، بەبێ ئەوەی ئاگادار بێت، هەموو کوردەکان سوپاکەی ئەویان بەجێ هێشت، هەروەها کەسانی دیکەیش، ئەوسا فرمانی دا پاشەکشێی گشتی بکرێت، دوای ئەوەی دوانزە هەزار کوشتەی لەگۆڕەپانی شەڕدا بەجێ هێشت،[137] ئەوە یەکێك بوو لەگەورەترین شکستی سوپای عوسمانی بەدرێژایی مێژووی خۆی.

لەکۆتایی 1727دا، هەردوولا رێککەوتن، و یەکێك لەمەرجەکان ئەوەبوو، کەناوچە داگیرکراوەکانی ئێران لەقەڵەمڕەویدا بمێنێتەوە، و ئەشرەف خان دان بەجێنشینیی عوسمانیدا بنێت، و ئەویش وەکو پاشا بەجێگریی سوڵتان، لەئێراندا بمێنێتەوە. دواتر ئەشرەف خان دیاریی بەهاداری بۆسوڵتان نارد، بەمەبەستی بتەوکردنی پەیوەندیی نێوان هەردوولا، و یەکێك لەو دیارییانە، فیلێکی مەشق پێکراو بوو، کەراخەرێکی لەشێوەی گومەزی بەسەرەوە بوو، سێ کەس لەسەری دادەنیشتن. فیلەکەیان نارد بۆبەغدا، بۆئەوەی رەوانەی ئەستەنبوڵ بکرێت، و خەڵکی هاتن بۆتەماشای، و والی ئەحمەد پاشا لەساباتێك لە(باب المعظم)دا دانیشت و فیلەکە بەرەو رووی هات، و خەرتوومەکەی بەرز دەکردەوە، هەروەکو بڵێی سڵاوی لێدەکات. والی خەڵاتی پێشکەش کرد. فیلەکە بەهۆی سەرما و سۆڵەوە، کەگەیشتە دیاربەکر، رەقبووەوە.[138]

[137] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل132.

[138] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب5 ل222.

## پەیدابوونی نادر قولی:

کاتێ خەڵکی بەغدا دەرچوونە دەرەوە بۆتەماشای فیلەکە، وایاندەزانی کەبۆهەتا هەتایە کێشەی نێوان ئێران‌و عوسمانییەکان کۆتایی هاتووە،و ئیتر لەو بەڵا هەمیشەییە رزگاریان دەبێت کەئەو دوانە هۆکاری بوون. نەیاندەزانی کەستەمکارێ لەستەمکارەکانی مێژوو، لەئێراندا سەریهەڵداوەو منەی ئەوە دەکات دووبارە کێشەکە هەڵبگیرسێنێتەوە– کەئەویش نادر قولییە، کەدواتر بەنادر شا ناوی دەرکرد.

نادر قولی لەریزی ئەسکەندەرو چەنگیزخاندا بوو،و ئەوروپییەکان نازناوی(ناپلیۆنی رۆژهەلات)یان پێ بەخشی. لێرەدا بواری ئەوە نییە بەدرێژیی باسی ژیانی ئەم پیاوە بکەین، تەنیا ئەوە نەبێت کەئەویش وەکو زۆربەی ستەمکارانی مێژوو، پێگەیشت‌و لەمنداڵیدا شوان بوو، لەنزیکی خۆراسان، دواتر بووبە رێگرو کۆمەڵی لاتی بەدواوە بوو،و هێدی هێدی ژمارەی هەوادارانی گەشەی سەند، تا لەساڵی 1727–کەساڵی فیلە، سەبارەت بەخەڵکی بەغدا– دا، گەیشتە نزیکەی پێنج هەزار جەنگاوەر.

شەوێکیان نادر قولی لەخەویدا، ئیمام عەلی دەبینێت، کەشمشێرێکی پێشکەش دەکات‌و داوای لێدەکات ئێران رزگار بکات‌و تەختی بۆبگێرێتەوە،و ئەم خەوە وەکو خاڵێکی وەرچەرخان وابوو لەژیانیدا، چونکە دڵنیابوو، لەوەی ئەرکێکی پێ سپێردراوەو دەبێ جێ بەجێی بکات. هەر لەو کاتەدا، وارێکەوت لەمازندەراندا، پیاوێك پەیدا بوو، داوای تەختی ئێرانی دەکرد، ناوی تەهماسب شا بوو، کەکوڕی دوا شای



سەفەوی، شا حوسێن بوو، یەکسەرە نادر قولی، خۆی‌و هەوادارانی چوونە ژێر فرمانیەوە.

تەهماسب شا متمانەی تەواوی بەنادر قولی هەبوو، فەرماندەیی سوپاکەی بەو دا،و نازناوی(تەهماسب قولی)، واتەغولامی تەهماسبی پێ بەخشی.[139] نادر یەك لەدوای یەك سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، هێشتا ساڵی 1729 کۆتایی نەهاتبوو، توانی ئەفغانییەکان لەئێران دەربکات،و ئەشرەف خانی سەرکردە زۆرزانەکەیانی لەناو دا،و لەساڵی دواییدا، توانی عوسمانییەکان لەناوچەکانی رۆژئاوای ئێران دەربکات،و بەمەیش ئێران سنوورە کۆنەکانی خۆی بەدەست هێنایەوە،و خەڵکی پێیان وابوو، دەوڵەتی سەفەوی دووبارە ژیانی بۆگەڕاوەتەوە.

کاتێ هەواڵی ئەو سەرکەوتنە گەورانە بەئەستەنبوڵ گەیشت، دەوڵەت ئامادەباشی راگەیاند،و سوڵتان فرمانی بۆوالیی بەغدا دەرکرد، کەیەکسەرە بڕوات بۆئێران(بۆ تەمێکردنی ئەم دوژمنە ستەمکارەو لەناوی ببات).[140] لە16ی ئەیلولی 1731دا، هەردوو سوپای ئێرانی‌و عوسمانی، لەشوێنێکدا، کەرۆژەرێیەك لەهەمەدانەوە دوور بوو، بەیەك گەیشتن.

تەهماسب شا خۆی سەرکردایەتیی سوپای ئێرانی دەکرد،و لەو رۆژەدا نادر قولی لەخۆراسان بوو، ئەحمەد پاشا توانی شکستێکی گەورەی بەسەردا بهێنێت،و تەهماسب نیوەی سوپاکەی‌و هەموو تۆپەکانی

[139] نادر لەعیراقدا بەو نازناوە ناوی دەرکرد کاتێ هات بۆداگیرکردنی،و ناوەکە لەسەر زاری خەڵکی گۆڕانی بەسەردا هات‌و بوو بە(تەهمان).

[140] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل25.

لەدەسـت دا. دواى دانوسـتانێكى دوورو درێـژ هـەردوولا رێككـەوتن،و تەهماسب جۆرجياو ئەرمينياى دا بەدەوڵەتى عوسمانى.[141]

كـاتىَ نـادر قـولى هـەواڵى ئـەو رێكەوتنـەى بيسـت، تـورِە بـووو سـووربوو لەسـەر ئـەوەى هەڵيبوەشـێنێتەوە،و بەپەلـە خـۆى گەيانـدە ئەسفەهان،و تەهماسبى لەسەر تـەخت لابـردو كورِەكـەى لەشـوێنى دانـا، كەتەمـەنى شـەش مـانگ بـوو،و خـۆى كـرد بەسەرپەرشـتيارى ئـەو پاشـا بچـووكە. دواتـر نامەيـەكى بۆئەحمـەد پاشـا نـارد،و تيايـدا بـەڵێنى داو ئاگادارى كردەوە، كەپـەلامارى بەغدا دەدات، بەمەبەستى داگير كردنـى،و بـۆى نووسـى:( بـا بـاش بزانيـت، ئـەى پاشـاى بەغـدا، ئێمـە داواى مافێـك دەكـەين، كەمشـتومرِى لەسـەر نييـە، لـەزيارەتى مـەزارى ئيمـامى عـەلى و حوسێن و مەهدى و موسا. داواى گێرِانەوەى هەموو ئەو ئێرانييانە دەكەين، كـە لـەدوا شـەرِدا بـەديل گـيراون... و هەرئێسـتا بەسـەركردايەتيى سـوپا سەركەوتووەكەمان پێشرِەويى دەكەين، تاوەكو هەواى پاكى دەشتى بەغدا هەڵمژين و لەسايەى ديوارەكانيدا بحەوێينەوە).[142]

## گەمارۆى بەغدا:

141-Edward Browne(A Literary History of Persia)-Cambridge 1953-vol. 4, P. 134.

[142] ستيڤن هيمسلى لۆنكريك(سەرچاوەى پێشوو) ل135.



لەرۆژانى يەكەمى ساڵى 1733دا، نادر قولى لەسەر رووبارى ديالـە پەرِييـەوە، لـەرووى بـەهرزەوە،و بـەرەو بەغدا پێشرِەويى كـرد،و ، لـەرووى رەسـافەوە گـەمارۆى بەغـداى دا. دواى چـەندين هـەوڵى بـێ سـوود، بۆپەرِينەوە لەديجلە، دواتر–بەيارمەتيى ئەندازيارێكى ئەوروپى– لەدوورى چـەند ميلێـك لـەباكوورى بەغـداوە، پردێكيـان لەسـەر رووبارەكـە دروسـت كرد،و بەمەيش توانى گەمارۆى بەغدا بدات، لەهەموو لايەكەوە،و خۆراكى لێبرِين و خواردنەكان تيايدا، تادەهات گرانتر دەبوون.

ئەحمە پاشا فرمانى بەدانيشتوانى كـەرخ دا، خانووەكانيان بـەجێ بهـێڵن و بيگوێزنـەوە بۆرەسـافە، بۆئـەوەى پارێزگـاريى لەديوارەكـەى دەوروبەرى بكەن،و ئەمەيش هەڵەيەكى گەورەبوو، چونكە بارى سەرشانى دانيشتوانە ئابلۆقەدراوەكانى قورستر كرد،و بەرواڵـەت ئەو بەهيواى ئەوە بـوو، يارمەتييـەكانى سـوڵتان بۆرزگـار كردنـى بەغـدا، بـەزووترين كـات بەدەسـتى بگـات. هەرچـۆنێك بێـت، گواسـتنەوەى جـەماوەرێكى زۆر لـەو بەرەوە بۆئەم بەر بەسەر ديجلەدا، كارێكى قورس و مەترسيدار بوو، چونكە ئەو سەردەمە، تەنيا يەك پردى لەسەربوو، ئەويش پردێكى سەرەتايى بوو لەسـەر كەشـتى دروسـت كرابـوو،و خـەڵكى سـووديان لەبەلـەم و كەڵـەك وەرگـرت،و مـاوەى پەرِينـەوە سـێ رۆژى خايانـد،و خـەڵكى بەدەسـتييەوە ناڵانـديان،و دەسـتدرێژيى كرايـە سـەر ژنـان و، هـەر لـەپيرو منـداڵ و پەككەوتەوە، خەڵكێكى زۆر تياچوون.[143]

[143] رەسووڵ كەركووكلى(سەرچاوەى پێشوو) ل30. وعەبباس عەزاوى(سەرچاوەى پێشوو) ب5 ل238.

نادر قولی زانی ناتوانێت بەغدا داگیر بکات، لەرێگەی پەلاماری راستەوخۆوە، بەهۆی لاوازیی تۆپەکانی، لەبەراورد لەگەڵ تۆپە عوسمانییەکان، لەلایەك و بەهۆی تۆکمەیی دیوارەکانی بەغداو خۆڕاگریی بەرگرییکەران، لەلایەکی دیکەوە، بۆیە پەنای بردە بەر گەمارۆی درێژخایەن و برسیکردنەوە. و لەراستیدا توانی لەوەدا تارادەیەك سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، گرانی بەجۆرێ لەبەغدادا بڵاوبووەوە، کەخەڵکی کەوتنە خواردنی سەگ و پشیلە، و خوێنەکانیان دەمژی و پێستەکانیان دەجوی. و شێخ عەبدورەحمانی سویدی بەچاوی خۆی بینیویەتی، کەتاقمێك لەکۆڵانەکاندا، خەریکی راوە سەگ بوونەو خواردویانە، و رۆژێکیان هەندێ کەس پەلاماری خواردنی والییان داوە، لەکاتی گواستنەوەیداو بردوویانە، و ئەمەیش وای لەوالی کردووە، بۆحاڵیان بگری.

سویدی دەگێڕێتەوە، کاتێ لەمزگەوتی شێخ عەبدولقادر، دوای نوێژی هەینی ، بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتەوە، لەرێگەدا ژنێکی جوان دەبینێت خۆی بەسەر لاکی گوێ درێژێکدا داوەو بەچەقۆ لەگۆشتەکەی دەکاتەوەو دەیخاتە کۆشییەوە، و کاتێ پرسیاری هۆکەی لێکرد، گوتبووی ماوەی پێنج رۆژە، لەئاو زیاتر هیچی نەخواردووە.[144]

گرانیی گەیشتە رادەیەك کەهەندێ لەکچان لەشی خۆیان لەپێناوی کولێرەیەکی جۆدا بفرۆشن،[145] وخەڵکی ناچاربوون دڕك و ناوکی لۆکە بخۆن، و بەمەیش نەخۆشی لەنێوانیاندا بڵاوبووەوەو مەرگومیر زۆر بوو.

[144] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل30–31.

[145] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 30.



رێگە نەبوو یەك، دوان، یان سێ مردووی لێنەکەوتبێت).[146] دەڵێن ژمارەی مردووەکان، تاکۆتایی گەمارۆکە گەیشتە سەد هەزار، و لاشەی هەزارانیان فڕێ درایە ناو رووبارەوە، و بۆنی لاشەی ئەوانی دیکە ئەو ناوەی گرتبووەوە.[147]

لەکاتێکدا، دانیشتوانی بەغدا بەدەستی برسێتی و گرانییەوە دەیانناڵاند، سەربازانی سوپای ئێرانی لەخۆشگوزەرانیدا بوون، بەهۆی ئەوەی رێگەی خواردنیان لەهەموو ناوچەکانی عیراقەوە، بۆئاوەڵا کرا، و بازاڕی ئۆردوگاکەیان پڕبوو لەکاڵای جۆراوجۆری هەرزان، و نادر قولی فرمانی دا خانووەکانی کەرخ بڕوخێنن، تاوەکو لەدارو تەختەو دەرگاکانی بۆدروستکردنی شوێنی ئەفسەرەکانی سوود وەربگرن، و ئەوانیش ژن و منداڵی خۆیانیان هێنابوو، لەگەڵ خۆیاندا. کاتێ رۆژی نەورۆز هات–21ی ئازاری ساڵی 1733– سوپای ئێرانی ئاهەنگێکی گەورەیان گێڕا.[148]

## ئاکامی دان بەخۆداگرتنەکە:

[146] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل241.

[147] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل142.

[148] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 137.

ئابڵۆقەکە ماوەی حەوت مانگی خایاند، و ئەحمەد پاشا بەرگرییەکی سەرسووڕهێنەری ئەنجام دا، و ئەگەر ئەو نەبوایە، هەر زوو بەغدا خۆی بەدەستەوە دەدا، و ئەحمەد پاشا هەموو رەوشێکی دەگرتە بەر بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکان، و بۆخۆی بەناویاندا دەگەڕاو هانی دەدان، و بەنهێنی کەسانی جێی متمانەی خۆی رادەسپارد، تاوەکو بێن بۆبەغدا، لەدەرەوەو بەدیوارەکانی بەغدادا هەڵبگەڕێن و مژدەی ئەوە بەدانیشتوان بدەن کەیارمەتی و خۆراك خەریکە دەگات.

رۆژێکیان نادر قولی شاندێکی لەزانایان بۆناو بەغدا نارد، بەبیانووی باسوخواس لەگەڵ زاناکانیدا، ولەراستیدا بۆئەوە ناردنی، تاوەکو لەدۆخی برسێتی و گرانییەکە ئاگاداربێت. ئەحمەد پاشایش لەرازی هاتنەکەیان بەئاگابوو، و ویستی لەو هاتنە سوود وەربگرێت، و چەندین کیسەی پڕ لەکولێرەی لەسەر رێگەیاندا دانا و داوای لەفرۆشیارەکان کرد هاوار بکەن کولێرەیەك بەچوار فلس، و دواتر خواردنێکی چەوری بۆدروست کردن، ئیتر گەیشتنە ئەو بڕوایەی کەگرانی و برسێتی بەغدای نەگرتووەتەوە.[149]

دواتر سوپای فریاگوزاری بەسەرکردایەتیی عوسمان پاشا(شەل) گەیشت، و ئەم سەرکردەیە پاڵەوانێکی ناودارو پیاوێکی قۆز بوو، و رەوتەکەی لەئەستەنبوڵەوە نزیکەی شەش مانگی خایاند، و لەنزیکی شارۆچکەی بەلەد رووبەرووی سوپای نادر بووەوە، و شەڕێکی چارەنووسساز لەنێوانیاندا رووی دا، لەبەرەبەیانی 19ی تەممووزدا، و نۆ

[149] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل32.



سەعاتی خایاند، کەشەڕێکی قورس و خوێناوی بوو. شەڕی نێوان دوو قارەمانی شەڕ بوو، عوسمان پاشا ئەگەرچی دەشەلی، بەڵام بەسواری ئەسپەکەیەوە سەرکردایەتی سوپاکەی دەکرد، و نادر قولیش هەمان کاری ئەنجام دەدا، تائەوەی پەرچەمدارەکەی خۆی لەدەست داوو دوو ئەسپ لەژێریدا کوژران، و شەڕەکە بەسەرکەوتنی شەلە و شکستی نادر کۆتایی هات.

لەراستیدا، زیانی سوپای ئێرانی لەو شەڕەدا یەکجار زۆر بوو، سی هەزاری لێکوژراو سیٚ هەزار دیلی لێگیرا، و هەروەها هەموو تۆپەکانی وهەموو چادرو کەرەستەو تفاق و ئاژەڵ و خۆراکی لەدەست دا. بەهەڵەداوان لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی بۆی هەڵهات، و سنووری تێپەڕ کرد بەرەو ئێران. بەڵام عوسمان پاشا بەرەو ئەعزەمییە رۆیشت، و خەڵکی بەغدا لەهەموو چینێك، لەپیرو گەنج سەردانیان کرد، و قاچیان ماچ کردو لەگەردوتۆزی شەڕ پاکیان کردەوە.[150]

## گەڕانەوەی شکست خواردوو:

زۆرکەس پێیان وابوو، دوای ئەو شکستە، ئیتر ناوی نادر قولی لەئارادا نامێنێت، بەڵام ئەو پیاوێکی نائاسایی بوو، توانی پاشماوەی

[150] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل141–142.

سوپاکەی خۆی لەهەمەدان کۆبکاتەوە، و دووبارە وورەیان بەرز بکاتەوە. هێشتا سێ مانگ یان کەمتر، بەسەر شکستەکەیدا رەت نەبووبوو، کەجارێکی دیکە سنووری عیراقی بەزاند.

ئەمجارەیان، تەنیا مشووری ئەوەی دەخوارد، تۆڵە لەدوژمنە شەلەکەی بسێنێت و لەناوی ببات، و لەوە گەیشت کە تائەو شەلە(بەخۆیە) لەعیراقدا بێت، ناتوانێت بەغدا داگیر بکات. بۆیە رووی لەکەرکوک کرد، کەدوژمنەکەی لەوێدا هەواری هەڵدابوو. لە26ی تشرینی یەکەمی 1733دا، شەڕ لەنێوانیاندا بەرپا بوو، و بەلام بەخێرایی کۆتایی هات، چونکە عوسمان پاشا لەسەر پشتی ئەسپەکەی گلاو مردو شیرازەی سوپاکەی پچڕا. کاتێ تەرمەکەیان هێنایە بەردەمی نادر قولی، ماوەیەك بەبێ دەنگ بەرێزەوە پێیداڕوانی، و دواتر فرمانی دا بەرێزەوە بیبەن بۆبەغدا.

کاتێ هەواڵی کوشتنی عوسمان پاشا گەیشتە بەغدا، ترس بەغدای داگرت و نرخی خۆراك بەرزبووەوە، و ئەحمەد پاشا ویستی دووبارە هەڵەی بەسەردا تێپەڕ نەکات، جاڕچی نارد لەبازاڕو شەقامەکاندا، داوایان کرد ئەوەی ناتوانێت لەشاردا بمێنێتەوە، دەتوانێت شار چۆڵ بکات، و بەمەیش خەڵکێکی زۆر شاریان بەجێهێشت.

نادر قولی بەسوپاکەیەوە گەیشتە دەوروبەری بەغدا، بەلام ئابلۆقەکە، ئەمجارە زۆری نەخایاند، چونکە هەواڵ لەئێرانەوە گەیشت کەشۆڕش تیایدا، بەسوودی بنەماڵەی سەفەوی هەڵگیرساوە. نادر قولی دەستپێشخەریی کردو داوای ئاشتی لەئەحمەد پاشا کرد، و ئەمیش هەستی بەوە کرد، هەروەکو بڵێی ئاشتی لەئاسمانەوە بۆباریبێت، و



رەزامەندیی لەسەری دەربڕی. دوای ئەوەی نادر زیارەتی مەزارە پیرۆزەکانی کرد، بۆئێران گەڕایەوە.

## تەمێکردنی خێڵەکان:

کاتێ ئەحمەد پاشا دوای شەڕەکە پشووی داو دڵنیابوو لەوەی نادر قولی لەبەغدا دوور کەوتۆتەوە، ویستی خێڵەکانی عیراق تەمێ بکات، کەچوبوونە ریزی دوژمنەوەو لەماوەی رابردوودا ئاژاوەیان نابووەوە. دیارە هەندێ لەوخێڵانە دەرفەتی سەرقاڵبوونی حکومەتیان لەو ماوەیەدا، قۆستبووەوە، و بەهەوەسی خۆیان ئاژاوەگێڕییان کردبوو لەوڵاتدا، و هۆزی شەمەر–بەتایبەتی–یارمەتیی زۆری نادر قولییان دابوو، و هەندێکیان بووبوون بەرێنماو سیخوڕی، و رۆژانە هەواڵیان بۆدەبرد، و لەهەموو شتێك ئاگاداریان دەکردەوە.

سەرەتا ئەحمەد پاشا دەستی کرد بەتەمێ کردنی هۆزی شەمەر، و دواتر هۆزی قەشعەم و زوبەید، و کاتێ سەرۆکەکانیان هێنایە بەردەمی، پەشیمانییان راگەیاندو بەڵێنیان دا ملکەچی بن، ئەویش بەرەڵای کردن.[151]

ملکەچیی خێڵەکان درێژەی نەخایاند، لەساڵی دواتردا دەوڵەتی عوسمانی ویستی ئەحمەد پاشا بگوێزێتەوە بۆویلایەتی ئۆرفە، و هێشتا

[151] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل35.

ئەم والییە بەغدای جێنەهێشتبوو، خێڵەکان گەڕانەوە سەر خووە کۆنەکەی خۆیان. تەنیا خێڵەکان نەبوون، بەڵکو ئینکشارییەکانیش دەستیاندایە ئاژاوەگێڕیو کوشتو کوشتارو لەبەغدادا. ئەوسا دەوڵەت زانی کە عیراق جیاوازیی هەیە لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەی عوسمانیدا، بەهۆی زۆریی خێڵەکانیەوە، و ئەوەی کەپێویستی بەفەرمانرەوایەکی بەهێز هەیە، بۆسەرکوتکردنیان، بۆیە ئەحمەد پاشایان بۆ بەغدا گێڕایەوە.

کاتێ ئەحمد پاشا، لەسالی 1736دا گەڕایەوە بۆبەغدا، خەڵکەکە بەشادییەوە پێشوازییان لێکرد، و ئیسماعیل رۆژنامەچی بەشیعرێکی تورکی، وەکو ئەوانی دیکە ستایشی کرد.[152] ئەحمەد پاشا کەوتە تەمێ کردنی ئینکشارییەکان، هەندێ لەسەرکردەکانی کوشتو هەندێکی دیکەی لێ دوورخستنەوە، و دواتر رووی کردە بنەماڵەی لامو شکاندنیو سامانیانی بەتالان برد.

## شۆڕشی سەعدوون:

لەساڵی 1738دا، میر سەعدوون شێخی مونتەفیق لەگەڵ دەهەزار جەنگاوەردا، شۆڕشیان کرد، و لەناوچەیەکی نێوان نەجەفو کوفەدا،

[152] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل250.



دەسەڵاتی خەڵکی بەرێوەدەبردو دەیگوت:(من سوڵتانی ئەم قەڵەمڕەوەم. ئەحمەد پاشا کێیەو سوڵتان چییە؟ من ئەگەر خودا یارمەتیم بدات، بەغدا دەگرمەوەو بەدادپەروەریی فەرمانرەوایی دەکەم). دواتر هێزێکی نارد بۆئابلۆقەدانی حیللە، و سوپایەکی دیکە بۆگەمارۆدانی بەسرە، و گوتی بەسرە موڵکی خۆیانەو ساڵانە باجیان وەرگرتووە، و رۆمەکان– واتە تورکەکان– هیچ مافێکیان تیایدا نییە.[153]

سەعدوون ماوەی چوار ساڵ درێژەی بەشۆڕشەکەی دا، و توانی ناوچەیەکی زۆر لەفوراتی خوارووو ناوەڕاست کۆنترۆڵ بکات، و باج لەگەشتیاران وەربگرێت، و تەنانەت باجی لەبریکارانی کۆمپانیا ئینگلیزیو فەرەنسییەکانیش لەبەسرە وەردەگرت،[154] بەڵام شۆڕشەکەی لەساڵی 1741دا، بەکوشتنی بەهۆی شەڕێك لەگەڵ سوپای حکومەتدا کۆتایی هات. کاتێ هەواڵی کوشتنی بەئەحمەد پاشا گەیشت، مژدانەی بە هەواڵهێنەرو خەڵاتی بکوژەکەی کرد، دوایی فرمانی دا کەللەسەری پڕبکەن لەکاو رەوانەی ئەستەنبوڵی کرد.[155]

# بەشی پێنجەم

# نادر قولیو پرۆسەی مەزهەبی پێنجەم

[153] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی5 ل 256.
[154] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەچاوەی پێشوو) ل154.
[155] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل258.

لەبەشی پێنجەمدا، شتێکمان لەسەر ژیانی نادر قولی و ئابڵۆقەدانی بەغدا باس کرد، و لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین، هەندێ لەسەر ئەو کارانەی بدوێین، کەبەدوای ئابڵۆقەدانەکەدا هات، بەتایبەتی سەبارەت بەپرۆسەکەی بۆ لەیەکنزیکبوونەوەی مەزهەبی، کە لەدواسەردەمی خۆیدا، هەوڵی زۆری بۆدا. دیارە تاوتوێکردنی ئەم خاڵە، تیشك دەخاتە سەر هەندێ لایەنی تەمومژاوی لەمێژووی کۆمەڵگەی عیراقی.

## سەرەتای هەوڵەکە:

دوای کشانەوەی لەبەغدا، نادر قولی ماوەی سێ ساڵی بەهێرشی سەرکەوتوانە بۆناوچەکانی ئازەربایجان و قەوقاسیای بەسەر برد، و توانی لەو ناوچانەدا، بەسەر سوپای روسی وعوسمانیدا سەربکەوێت، و چەندین شاری گرنگی وەکو تەفلیس و گەنجا و باکۆو گیلان و دەربەند و رەشت داگیر بکات. بەمەیش توانی ئابڕووی خۆی بەدەست بهێنێتەوە، دوای ئەوەی لەداگیرکردنی بەغدادا، لەکەدار بووبوو.

دوای ئەو سەرکەوتنە مەزنانە، لەباخەکانی موغانی نزیك بەئەردەبیلدا، بەمەبەستی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی نەورۆزەوە وەستا، و ئەوەیش لە21ی ئازاری 1736دا بوو، لەوێدا بانگێشتی پیاوماقووڵانی ئێرانی و سەرکردەی لەشکرەکانی کرد، بۆئاهەنگێکی گەورە، و مردنی پاشا بچکۆلەی پێ راگەیاندن کەئەو سەرپەرشتیاری بوو، و داوای لێکردن پاشایەکی نوێ هەڵبژێرن.



چاوەڕوانی ئەوە دەکرا، لەو بارودۆخەدا ئامادەبوان بەدەنگی بەرز ئەو بەپاشا هەڵبژێرن، و هەروایش بوو، کەچی خۆی رازی نەبوو. دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە، نادر قولی هەر سوور بوو لەسەر رای خۆی، بۆماوەی مانگێك، و هەرجارێ زیاتر پێیان دادەگرت، ئەویش زیاتر لەسەر رای خۆی سوور دەبوو.

دیارە نیازی شتێکی لەدڵی خۆیدا حەشار دابوو، و ئەو نیازەی کاتێ ئاشکرا بوو کەدواجار رەزامەندیی دەربڕی بۆئەوەی لەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشێت، و ئەوسا چەندین مەرجی بۆدانا، کەبووە مایەی سەرسووڕمانی خەڵکی، و گرنگترینی ئەو مەرجانە ئەوەبوو کەئێرانییەکان واز لەسووکایەتی کردن بەجێنشینەکان و گرتنی ماتەمینی و هەموو ئەوکارانە بهێنن کەدەبنە هۆی جیاوازیی لەنێوان شیعەو سوننیدا. دەگێڕنەوە سەرۆکی زانایان لەوێدا ئامادە دەبێت و ئەم مەرجە پەسەند ناکات، و نادر قولی ئامۆژگاری دەکات کەهەوڵەکانی خۆی لەکاروبارەکانی دونیادا چڕ بکاتەوە و کاروباری ئاییني بۆپسپۆران لەو بوارەدا بەجێ بهێڵێت، بەڵام مەرگی ناگەهان وای لێکرد کەنەتوانێت ئەوانی دیکە والێبکات دژی ئەو مەرجە بوەستنەوە، و کۆبوونەوەکە بەپەسەند کردنی مەرجەکان کۆتایی هات.[156] دواتر تاج لەسەرنانی نادر قولی، لەئاهەنگێکی گەورەدا بەڕێوەچوو–لەو کاتەی ئەستێرەناسان دیارییان کرد–و ئیتر لەو کاتەوە بوو بە(نادر شا).

هەندێ لەمێژووناسان ئەو مەرجەی کەنادر قولی داینا، بۆوەرگرتنی تەخت، بۆدوو هۆکاری شیمانەکراو دەگێڕنەوە: یەکەمیان ویستوویەتی بنەماڵەی سەفەوی لەبیری ئێرانییەکان بباتەوە، بەوەی ئەم بنەماڵەیە

156-Percy Sykes(A History of Persia)-London 1958-vol. 2, P.254-255.

سووکایەتیکردنو ماتەمینی دامەزراندو بەئێراندا بڵاویان کردەوە،و هۆکاری دووەم ئەوەبوو، کەنادر قولی خەونی بەوەوە دەبینی کەدەوڵەتی عوسمانی لەناو ببات و لەشوێنیدا، دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامی پێکبهێنێت، هەموو موسڵمانان بەشیعەو سوننەوە بگرێتەوە.[157]

لێرەدا، دەتوانین هۆکارێکی دیکە بخەینە سەر ئەو دوو هۆکارە، ئەویش ئەوەیە کەنادر قولی بۆخۆی لایەنگریی لەیەکێك لەو دوو تاقمە دژ بەیەکدییە نەدەکرد،و رەنگە راست بێت ئەگەر بڵێین ئەو بایەخیبەو کەسایەتییە دەدا، کە لەکۆمەڵزانیدا پێی دەگوترێت( کەسایەتیی حەددی). چونکە لەژینگەیەکی سوننیدا پەروەردە بووبوو-کەهۆزی ئەفشاری تورکمانی بوو-دواتر تێکەڵیی شیعەی کردبوو،و ئەوسا سەرکردایەتی کردبوون لەشەڕەکاندا. هەندێ نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەهەوڵی ئەوەی داوە خۆی بە ئەکبەر شای مەغۆلیی هیندی بشوبهێنێت، کەئاینێکی نوێی داهێنا، بەمەبەستی یەکخستنی هیند لەیەك بیروباوەڕدا،[158] رەنگە نادر قولی ویستبێتی لەئێرانو عیراقدا، هەمان ئەو کارە ئەنجام بدات.

## مەزهەبی پێنجەم:

نەخشەی نادر قولی ئەوەبوو، شیعە بکات بەمەزهەبی پێنجەم، لەپاڵ چوار مەزهەبەکەی دیکەی ناو سوننییەکان،و ناوی نا(مەزهەبی جەعفەری)و بەمە گێڕایەوە بۆ ئیمام جەعفەر کوڕی محەممەد سادق.

دیارە نادر قولی یەکەم کەس نەبوو، کەئەم بیرۆکەیەی داهێنابێت،و گومانی ئەوە دەکرێت شەریفی مورتەزا، کە لەسەردەمی بوەیهییەکان، لەبەغدادا ژیاوە، پێشتر ئەو بیرۆکەیەی داهێنابێت. نووسەری کتێبی(روضات الجنات) دەگێڕێتەوە کەشەریفی مورتەزا، لەگەڵ قادر بیللای جێنشینی عەبباسیدا، لەسەر ئەوە رێککەوتبوو، کەسەد هەزار دینار لەشیعە وەربگرێت، بۆئەوەی بیانخاتە ریزی مەزهەبە سوننییەکانەوە، ئەویش داوای لەشیعەکان کرد نیوەی پارەکە کۆبکەنەوەو ئەویش نیوەکەی دیکەی دابین بکات، بەڵام لەو کارەدا سەرنەکەوتن.[159]

پێموایە، هۆی سەرنەکەوتنی شەریف مورتەزا لەنەخشەکەیدا-بەگریمانی روودانی- دەگەڕێتەوە بۆئەوەی جیاوازیی نێوان شیعەو سوننی، تەنیا لەفیقهدا نەبوو، بەڵکو چەندین نیاری قووڵتری دەگرتەوە، پەیوەندییان بەبنەماکانی ئایینەوە هەبوو، بنەماکانی ئایین بەلای سوننیەکانەوە، سیانن: یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو رۆژی قیامەت، لەکاتێکدا بەلای شیعەکانەوە پێنجن، کەدادپەروەریو ئیمامەتیشی دەخەنە سەر.

157-Gbid, vol. 2, P.255.
158-Edward Browne(A Literary History of Percia)-Cambridge 1958-vol. 4, P.137.

159 محەممەد باقر خوونساری(روضات الجنات في أحوال العلماء والسادات)-تاران 1367هـ-ل378.

سەرەرای ئەوەی شیعە بڕوایان وایە کەدوانزە ئیمامەکە هەر هەموویان سەرچاوەی بیروباوەڕو فیقهن، و جیاوازیی لەنێوانیاندا نییە، چونکە هەموویان وەکو یەك پیرۆزن، و بەو مانایەی شیعەکان پێیان باشە ناوی(ئیمامیە) یان(دوانزەئیمامی) بخرێتە شوێن ناوی(جەعفەرییە).

هەرچۆن بێت، نادر قولی سووربوو لەسەر ئەوەی نەخشەکەی پیادە بکات، سەرەرای ئەو ئەستەنگانە، و بێ وچان هەوڵو پارەی زۆری لەپێناویدا خەرج دەکرد. دیارە لەئیمام جەعفەردا، ئەو کەسایەتییەی دەبینییەوە، کەببێتە سومبلی نزیککردنەوەی نێوان شیعەو سوننی، ئەو ئیمامە لەسەردەمی مالیكو ئەبو حەنیفەدا ژیاوە، و ئەودوانەیش لەگەورە ئیمامانی سوننین، و هەردووکیان رێزی تایبەتیان بۆی هەبوو، و جگە لەوەی جەعفەر بەرەچەڵەك دەگەڕایەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لەسەری باوکییەوو، بۆئەبوبەکری سدیق، لەسەری دایکیو نەنکییەوە، و ئەوەی سەرنج راکێشە، هەردەم لەناو خەڵکیدا دەیگوت(ئەبوبەکر دووجار بەدونیای هێناوم)بۆ ئەوەی رێگە لەوانە بگرێت سووکایەتی بەئەبو بەکرو هاوڕێکەی عومەر دەکەن.

## نادر قولی هیند داگیر دەکات:



نادر قولیش وەکو ناپلیۆنو گەورە داگیرکەران، کە لەسەر بنەمایەك پەروەردەبوون، لەداگیرکاریدا تێرخواردنیان نەبوو، و تاقەڵەمڕەوی داگیرکارییان فراوانتر بوایە، منەی داگیرکردنی شوێنی زیاتریان دەکرد.

دوای ئەوەی تاجی لەسەر نرا، نادر قولی بەرەو رۆژهەڵات پێشڕەویی کرد–با لەمەودوا بەنادر شا ناوی بهێنین–، قەندەهارو غەزنەو کابوڵی گرت، و دواتر دەربەندی خەیبەری بڕی بەمەبەستی هیند. ئەو سەردەمە هیند لەژێر دەسەڵاتی محەممەد شا لەبنەماڵەی ئەکبەر شادا بوو، و ئەویش پیاوێکی تەمەڵو خۆشگوزەران بوو، و دڵی ئۆقرەی نەدەگرت، ئەگەر کیژۆڵەیەك لەباوەشی نەبوایەو پێکی بەدەستەوە نەبوایە،[160] واتە بەپێچەوانەی نادر شاوەبوو، کەدڵی ئۆقرەی نەدەگرت، ئەگەر بەسەر ئەسپەکەیەوە نەبوایە، لەکاتی شەڕکردندا، یان بەرەو شەڕ نەچوایە. ئەمەیە جیاوازییەکە– بەپێی تیۆری ئیبن خەلدوون–لەنێوان ئەوەی شکۆمەندیی خۆی بەدەستی خۆی بونیات بنێتو ئەوەی بەمیرات لەباوو باپیرانیەوە بۆی بمێنێتەوە.

لەساڵی 1738دا، شەڕی یەکالاکەرەوە، لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا، لەدووری شەست میل لەدەلهییەوە، رووی دا، و سوپای هیند، ئەگەرچی لەژمارەو تفاقدا گەورەتر بوو، بەڵام خراپ تێکشکا، و محەممەد شا بەدیل گیرا، بەڵام نادر شا لێیخۆشبووو تەختی بۆگێڕایەوە. محەممەد شایش لەبەرامبەردا، گەنجینەی پێشینە مەزنەکانی خۆی پێشکەش کرد، لەوانە

160-Percy Sykes(op. cit.) vol. 2, P.258.

تەختی تاووسی بەناوبانگ، کە تائێستایش لەتاراندا ماوە، و ئەڵماسی ناوداری(کوهینوور) کەئێستا بەتاجی بەریتانیاوەیە.

دەستکەوتەکانی نادر شا لەو هێرشەی بۆسەر هیند، هێندە زۆرە بەئاسانی مەزەندە ناکرێت، لەشمەکی ئەنتیکەو سەنگی گرانبەها، و هانۆی بەهەشتا وپێنج ملیۆن پاوەن مەزەنەی کردووە، و هەندێك بەزیاتر یان کەمتر مەزەنەیان کردووە. دیارە نادر شا دەستکەوتەکانی هیند تێریان نەکرد، و ویستی بەخوێنیشیان خۆی تێر بکات، هێشتا چەند رۆژێك بەسەر داگیر کردنی دەلهیدا تێنەپەڕیبوو، تافرمانی دا خەڵکەکەی قەتڵوعام بکەن، و ئەو قەتڵوعامەیش بەهۆی ئاژاوەیەکەوە بوو لەشاردا، چەند سەربازێکی کوژران، و ئەو قەسابخانەیە لەسەعات هەشتی بەیانییەوە دەستی پێکرد، بۆماوەی حەوت سەعات، و نزیکەی سەد هەزار کەس لەدانیشتوانی شارەکە کوژران، و دەڵێن لەوکاتەدا لەسەر سەکۆیەك دانیشتبوو، لەسەر سەربانی مزگەوتی(رەوشەن ئەلدەولە) و لەسێ لاوە تەماشای ئەو کارەساتەی دەکرد. تائێستایش دەستەواژەی(نادر شاهی) لەبازاڕەکانی دەلهیدا، بەمانی قەتڵوعامە.[161]

دوای ئەوەی نادر شا لەتالان و خوێنڕشتن بووەوە، ویستی ژنخوازی لەگەڵ بنەماڵەی مەغۆلیی دەسەڵاتدار لەهیندا بکات، کچەکەی محەممەد شای لەکوڕی دووەمی خۆی نەسروڵڵا مارە بڕی. دەگێڕنەوە، داوا لەزاوا کرا–وەکو دابونەریتیان لەشانازیکردن بەپێشینانەوە– حەوت پشتی خۆی هەڵبدات، ئەویش وەڵامی دانەوە:(کەکوڕی نادر شای کوڕی شمشێری کوڕەزای شمشێرە، بەم شێوەیە لەجیاتی حەوت، حەفتا پشتی خۆی هەڵدا).

161-Gbid, vol. 2, P. 262.



دوای گەڕانەوەی نادر شا لەهیند، بەلخ و بوخارایشی گرت، و نازناوی(شاهەنشا)–واتە شای شایان–ی لەخۆی نا و فرمانی دا تەنیا بەوناوە بانگ بکرێت، و هەڕەشەی سزادانی لەو کەسە کرد کەبەناوێکی دیکە بانگی بکات.[162] ئەوەی تێبینی دەکرێت، تائەمڕۆیش لەناو شاکانی ئێراندا بەکار دەبرێت.

## گەڕانەوە بۆپرۆسەی لێکنزیککردنەوە:

دوای ئەوەی نادر شا خۆی وەکو(شاهەنشا) ناساند، ویستی بەجیددی بگەڕێتەوە بۆسەر پرۆسەی لێکنزیککردنەوەی مەزهەبی، و رەنگە یەکێك لەو هۆیانەی پاڵی پێوەنا بۆئەو کارە، ئەوەبوو سوپاکەی لەشیعەو سوننی پێکهاتبوو، ئەفغان و ئۆزبەك و تورکمانی تیادا بوو، سەرەرای ئێرانییەکان، و هەروەکو بڵێی لەوە گەیشتبوو کەلێکنزیککردنەوەی مەزهەبی، لەکۆتاییدا، گرژی و ئاڵۆزیی ناو سەربازەکانی دەڕەوێنێتەوە.

نادر شا زۆری لەئێرانییەکان دەکرد دەست لەو داب و نەریت و سرووتانە هەڵبگرن کەسەفەوییەکان دایانهێنابوو، و کاتێ بینی هەندێ لەزانایانی شیعە بەرنگاریی دەکەن، گوشاری خستەسەریان و سزای نەختینەی لەسەردانان، و دواتر ئەوموڵکانەی بەدەستییانەوە بوو دەستی بەسەر هەموویدا گرت. دەگێڕنەوە رۆژێکیان بانگهێشتی زانایانی شیعەی کرد بۆکۆبوونەوەیەك، و داوای لێکردن هەریەکەیان لەپارچە کاغەزێکدا،

[162] عەبدوڵڵا سویدی(الحجج القطعیة لاتفاق الفرق الاسلامیة)–قاهیرە 1324ھ–ل4.

پێویستیی خۆی لەپارە بنووسێت، بەڵام لەبری ئەوەی ئەو برە پارەیەیان بداتێ کەداوایان کردبوو، فرمانی دا ئەو پارەیەیان بەزۆر لێ بسەنرێت،و هەموویانی خستە پەرواییەکەوە، کەهەندێکیان ناچار بوون، لەبازارەکاندا، شتومەکو کتێبەکانیان بفرۆشن.[163]

لەساڵی 1740دا، نادر شا شمەکی ئەنتیکەو دیاری بۆمەزاری ئەبو حەنیفەو مەزاری ئیمامان لەکازمییەو کەربەلاو نەجەف نارد،و ئەو شمەکانەی بۆ مەزاری عەلی لەنەجەف ناردبوو، هێندە زۆر بوو کە تائێستایش لەگەنجینەی ئەو مەزارەدا پارێزراوە،و رەنگە لەو دەستکەوتانەبن کە لەهیند هێنای.

نادر شا پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بتەو کرد،و یانزە فیلو سێ هەزار کۆیلەی پێشکەش کرد،و ئەم دیارییانە لەرێگەی بەغداوە رەوانەی ئەستەنبوڵ کرا، بەچاودێریی هەزارو پێنج سەد سوار،و لەنێوانی ئەو دیارییانە، فیلێکو دیارییەکی گرانبەها بۆئەحمەد پاشای والی بەغدا بوو. والی پێشوازیی لەدیارییەکان کردو بۆحەوانەوە، سەرۆکی سوارەکانی لەکۆشکێکی گەورە کە لەوبەر لە کەرخ دروست کرابوو، لەوشوێنەی کەئێستا پێی دەڵێن(بستان المتولية) مایەوە.[164]

## زاخاودانی مەزارەکە بەزێڕ:

[163] رەسووڵ کەرکووکلی(دوحة الوزراء)وەرگێڕانی موسا کازم نەورەس-بەیرووت-ل47.

[164] عەبباس عەزاوی(تاريخ العراق بين احتلالين)-بەغدا1953-ب5 ل262-263.



## اری عەلی بەزێڕ:

نادر شا پارەیەکی زۆری نارد بۆ زاخاودانی گومەزی مەزاری عەلی بەزێڕ لەنەجەف، هەروەها دوو منارەکەیو هەیوانەکەی،و لەساڵی 1742 دا دەست بەکار بوون، نزیکەی دووسەد زەرنگەرو پیشەسازی دەست رەنگینی، لەسەرانسەری جیهاندا بۆکۆکردەوە، هەر لەسینییەوە تا هیندیو تورکیو فارسی تا عەرەبی،و کرێکەیان بەرامبەر بەپەنجا هەزار تومان دەبوو،و ئەمەیش برە پارەیەکی زۆر بووە لەو سەردەمەدا، تەنانەت بەنموونە هێناویانەتەوە،و گوتویانە(دەست بڵاویەکەی نادر لەنەجەفدا).[165]

زاخاودانی مەزاری عەلی بەزێڕ، یەکەم کاری لەو جۆرەبوو لەعیراقدا- ورەنگە دووەم کار بووبێت لەوڵاتە ئیسلامییەکاندا، چونکە بەر لەو، گومەزی مەزاری رەزا لەخۆراساندا، هەر بەو شێوەیەی لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد، بەزێڕ زاخاو درا- لەراستیدا، زاخاودانی مەزارەکە لەنەجەف کاریگەرییەکی دەروونیو کۆمەڵایەتیی گەورەی هەبوو. هەروەکو ئاشکرایە نەجەف کەوتۆتە بەرزاییەکەوە،و کاتێ گومەزەکەی لەسەر دروستکرا، لەژێر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە-لەماوەی گەلێ دوورەوە لەگوندە دوورو بیابانەوە دەبینراو هێندە دڵفرێن بوو، کەخەڵکی بۆلای خۆی رادەکێشا، جگە لەمەزنیی ئەو پیاوەی لەژێریدا بەخاک

[165] جەعفەر مەحبووبە(ماضي النجف وحاضرها)-نەجەف1958-ب1 ل64.

سپێردرابوو، کەچەندە پیرۆزبوو، و شیعەو سوننە هەردوولا ڕێزی لێدەگرن. من پێموایە نادر شا بۆیە فرمانی زاخاودانی مەزاری عەلیبەزێڕ دا، لەپێناوی ئەو ئامانجەدا بوو کەهەوڵی بۆدەدا، ئەویش نزیککردنەوەی ئەودوو لایەنە نەیار بەیەکە بوو، و ڕەنگە ویستبێتی ئیمام عەلی بکات بەدروشمێکی نوێ بۆپرۆسەکەی، و هەروەکو چۆن پێشتر ئیمام جەعفەری سادقی دانابوو.

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی نادر شا ئەوەبوو کە–هەروەکو پێشتر بینیمان–لەعیراقدا بەدەست بڵاوو لەهیندداا بەخوێنڕێژ ناوی دەرکردبوو، و من پێموایە ئەم دوو خەسڵەتە، یەك مانا دەگەیەنن، چونکە نادر شا پارەی تەخشانو پەخشان دەکردو خوێنی دەڕشت، لەپێناوی ئامانجێکی گەورەدا کەخولیای بوو، ئەویش ئەوەبوو کەنازناوی(شاهەنشا) بۆخۆیو بۆبنەماڵەکەی لەدوای خۆی بمێنێتەوە.

## نسکۆی نادر شا :



پاوانخوازیی لەرادە بەدەری نادر شا وایلێکرد ، بەرەو ناوچەی داغستان لەقەوقاسیا پێشڕەویی بکات، بۆشەڕکردن لەگەڵهۆزەکانی لزگی، و لەوێ شکستێکی گەورەی هێنا، تەنانەت چەندین کەس لەو هۆزانە[166] توانییان دزە بکەنە ناو ئۆردوگاکەیەوە، و بگەن بەخێوەتە تایبەتەکەیو چەند ژنو خشڵی بەهاداریان ڕفاند.

نادر شا تووشی بەڵایەکی دیکە بوو، دوای گەڕانەوەی لەشەڕی لزگییە، کەدووپیاوی ئەفغانی پەلاماریان دا، بەمەبەستی کوشتنی، و بریندداریان کرد، و دواتر هەڵهاتن، بەبێ ئەوەی کەس بتوانێت دەستگیریان بکات، و نادر شا گومانی ئەوەی هەبوو، کەکوڕەکەی ڕەزا قولی میرزا دەستی لەو پیلانەدا بووبێت، بۆیە فرمانی دا چاوی هەڵبکۆڵن، بەڵام دوایی زۆر پەشیمان بوو لەو کارەی خۆی، و فرمانی دا هەموو ئەو پیاوانە بکوژن، کەئامادەی چاو هەڵکۆڵینەکە بوون، بەپاساوی ئەوەی کەئەرکی سەرشانیان بوو، ئەوسا گیانی خۆیانی بکەن بەقوربانی ئەو، لەپێناوی ڕزگار کردنی چاوی ئەمیر، کەنوێنەرایەتیی شکۆمەندیی ئێرانی دەکرد.

لەدوای ئەوە، سێ شۆڕشی بەرودو لەئێراندا روویان دا، دژی نادر شا. یەکەمیان پیاوێك پێی هەستا گوایا کوڕی حوسێن سەفەوی بوو، لەئازەربایجان، و هۆزەکانی لزگیو سوڵتانی عوسمانی یارمەتییان

[166] هۆزەکانی لزگی گەلێ شەڕئەنگێزبوون، و بەدەگمەن سوپایەك بیتوانیایە شکستیان پێبدات. لەقسەیەکی پێشینانی ئێرانییەکاندا دەگێڕنەوە کەئەگەر پاشای ئێران گێل بوو بینێرن بۆشەڕ کردن لەگەڵ لزگییەکاندا. دیارە ناوبانگی ئەم هۆزانە گەیشتبووە بەغدادیش، و تائیستایش وشەی(لزگی) باوە لەناویاندا، کەبەمانای پیاوی هاروهاجە.

پێشکەش کرد،و نادر شا توانی دوای شەڕێکی خوێناوی سەرکەوێت بەسەریدا،و کاتی ئەو پیاوەیان بەدیلی هێنایە بەردەم نادر شا، فرمانی دا چاوێکی هەڵبکۆڵن، دواتر نامەی بۆسوڵتان نووسی، تیایدا هاتبوو: نادر شا بێزی لەوە دێتەوە وەها بوونەوەرێکی هیچ و پووچ بکوژێت، ئەگەرچی لەلایەن جەنابی سوڵتانەوە پشتگیری دەکرێت.

شۆڕشی دووەم لەلایەن تەقی خان حاکمی ناوچەی فارس(کرمان)ەوە بوو،و کاتیٚ نادر شا سەرکەوت بەسەریدا، هەمان کاری بەسەردا هێنا، وفرمانی دا چاوێکی هەڵبکۆڵن، جگە لەوەی فرمانی دا، هەموو کەسوکارەکەیشی بکوژن. بەڵام شۆڕشی سێیەم لەلایەن محەممەد حوسێن قاجارییەوە بوو لەناوچەی ئەستەر ئاوا،و نادر شا توانی بەئاسانی لەناوی ببات، بەڵام وێرانی و کوشتاری لەو ناوچەیەدا خستەوە، لەسزای ئەو شۆڕشەدا،و فرمانی دا دوو قوچەك لەکەللەسەری کوژراوەکان دروست بکەن.[167]

دیارە نادر شا دەیویست وەکو چەنگیز خان و تەیمور لەنگ بکات، لەخوێنڕێژی، یان لەدروست کردنی قوچەك لەکەللەسەری کوژراوەکان،و نموونەی مێژوویيمان هەیە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکەن، لەکۆنگرەی نەجەف کەدواتر دێینە سەری، وتاربێژ لەمینبەردا وەستا و نزاو تکای بۆکرد،و گوتی:( خودایە دەوڵەتی ئەو کەسە بەرقەرار بکە کەدرەختی تورکمانی رووناك کردەوە، تاجی سەرکردایەتی و چەنگیزی سیاسەت).[168] دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی گشتی، نادر شا هیچ جیاوازیی

167-Percy Sykes(op. cit.)vol. 2, P. 266-277.

[168] عەبدوڵلا سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ل27.



لەگەڵ ئەو دیکتاتۆرانەدا نەبوو، کەرەوتی مێژوویان گۆڕی، لەو رووەوە کەتینووی خوێن بوو، یان ئەوەی کەتووشی نەخۆشیی سادیزم بووبوو.

## داگیرکردنی عیراق-بۆجاری سێیەم:

لەساڵی 1743دا، نادر شا نامەی بۆسوڵتانی عوسمانی نووسی و داوای لێکرد، بەرەسمی دان بەمەزهەبی جەعفەریدا بنێت، سوڵتان زانایانی ئەستەنبوڵی کۆکردەوە، بەمەبەستی وەرگرتنی راوبۆچوونیان، لەو بارەوە، وەڵامی ئەوان ئەوەبوو، کە شیعە لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە،و کوشتنیان و بەدیل گرتنیان رەوایە. و کاتیٚ وەڵامی نامەکە بەدەستی نادر شا گەیشت، ئەوەی کرد بەبیانوویەك بۆراگەیاندنی شەڕ بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی،و خێرا سوپای رەوانەی عیراق کرد،و لەنزیکی مەندەلییەوە سنووری بەزاند.

ئەوەی سەرنج رادەکێشیٚ، ئەوەیە کەنادر شا بۆیەکەم جار عیراقی داگیر کرد، خۆی نەلەقەرەی بەغداو نە لەقەرەی ئەحمەد پاشا دا،و ئەحمەد پاشا رێگەی پێدا، دەست بەسەر هەموو کێڵگەکانی دەوروبەری بەغدادا بگرێت-وکاتی دروێنەی بەروبوومی کشتوکاڵی بوو- بۆئەوەی خۆراکی سوپا داگیرکەرەکەی دابین بکات.

ئەمە دیاردەیەکی سەیرە، پرسیار دەوروژێنێت،و لەوەیش سەیرتر ئەوەیە، کەمێژوونووسان بایەخی تەواویان پیٚ نەداوە،و هەوڵی ئەوەیان نەداوە راڤەکردنی لەسەر بکەن. مێژوونووس رەسووڵ کەرکووکلی، لەروونکردنەوەی ئەم دیاردەیەدا دەڵێت: ئەحمەد پاشا رەزامەندیی دەربڕی لەسەر رەتبوونی نادر شا و مانەوەی و بەمیوانی دانا و

زمانحاڵەکەی دەڵێت( ئەگەر نانخۆری بەخێربێیت)[169] مێژوونووسێکی دیکە دەڵێت: ئەحمەد پاشا، نادر شای لەخشتە برد، کەپێی ڕاگەیاند، سەرەتا بچێت مووسڵ بگرێت و لەکاتی گەڕانەوەیدا، ئەوا بەغدا لەنێوان هەردوو دەستی خۆیدا دەبینێت، و فێڵەکەی ئەحمەد پاشا سەری گرت(شەڕ فرتوفێڵە).[170]

پێموایە موویەك لەم ماستەدا بووبێت و ڕۆژگار نەیدۆزیبێتەوە، و ڕەنگە نەخشەیەك بووبێت، لەپشتی دەوڵەتی عوسمانییەوە، نادر شا و ئەحمەد پاشا لەسەری ڕێككەوتبن، یان لەپێناوی دابەشكردنی بەرژەوەندیی هەردووکیان لەسەر حیسابی ئەو دەوڵەتە. هەرچۆنێك بێت، ئەوەی ئاشکرایە نادر شا گەلیٚ شەیدای ئەحمەد پاشا بوو، جارێکیان بەم شێوەیە وەسفی دەکات: پیاوێکی یەکجار ژیرو هۆشیارە، منی لەحکومەتەکی دەترساند، هەروەکو چۆن حکومەتەکی بەمن دەترساند، و بەم شێوەیە کاتی حەوانەوەی بەسەر دەبرد.[171] هەرکەسیٚ لەم وتەیە ورد ببێتەوە، هەست بەوە دەکات لەپشتی ئەو ستایشکردنەوەوە، شتێك هەیە.

## گەمارۆی مووسڵ:

[169] ڕەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل5

[170] سولەیمان سائیغ مووسڵی(تأریخ الموصل)–قاهیرە1923– ب1 ل278.

[171] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب5 ل282.



نادر شا کەرکوك و هەولێری بڕی، و لەدوا ڕۆژەکانی ئەیلوولدا گەیشتە نزیکی موسڵ، و دواتر ئابلۆقەی دا. لەراستیدا ئابلۆقەی موسڵ جیاوازیی هەبوو، لەگەڵ یەکەم ئابلۆقەی بەغدادا، کە لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد، بینیمان لەئابلۆقەی بەغدادا، کەچۆن نادر شا تەنیا پەنای بردە بەر گەمارۆدان و ڕێگەگرتن لەگەیشتنی خۆراك بەمەبەستی برسی کردنی خەڵکەکە، بەڵام لەگەمارۆدانی موسڵدا، بەپلەی یەکەم پشتی بەپەلاماردان و تۆپباران بەست، و دەڵێن نزیکەی دوو سەد تۆپ، بەشەو بەرۆژ تۆپبارانی موسڵیان دەکرد، ئەوانەی بینیبویان، بەزێدەڕەوییەوە گێڕاویانەتەوە: پارچەی تۆپەکان بەرۆژ ئاسمانی تاریك دەکرد، و بەشەو ڕووناکیان دەکرد.[172]

ئابلۆقەکە ماوەی چل و دوو ڕۆژی خایاند، نزیکەی چل هەزار تۆپی نابەشارەکەوەو پێنج جار هێرشی بۆبرد. خەڵکی موسڵ قارەمانانە بەرگرییان لەشارەکەیان کرد، و سوێندیان خواردبوو، ئەگەر دوژمن هاتە ناویانەوە، بەدەستی خۆیان ژنەکانیان بکوژن، نەبادا بکەونە دەستی ئێرانییەکان، حاجی حوسێن پاشا جەلیلی، لەکاتی گەمارۆدانەکەدا گەلیٚ خۆی ماندوو کرد، هەروەها کوڕەکانی و کەسوکارەکەی، بەمەبەستی هاندانیان هاوکاریی خەڵکیان لەگواستنەوەی خۆڵدا دەکرد.[173]

دواجار نادر شا ناچار بوو، داوای ئاشتی بکات لەگەڵ خەڵکی موسڵدا، ئەوەبوو حاجی حوسێنی بەسەرۆکایەتی شاندێکی سیٚ کەسی

[172] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)–وەرگێڕانی جەعفەر خەیات–بەغدا1962–ل 148.

[173] سولەیمان سائیغ مووسڵی(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل282–288.

نارد، بەمەبەستی دانوستان، کەبریتی بوون لە: دادوەری موسڵ، عەلی ئەفەندی غوڵامی، موفتی شافعییەکان،و قەرە مستەفا بەگ. کاتێ شاندەکە گەیشتە فەستات، نادر شا بەگەرمی پێشوازیی لێکردن و رووخۆش بوو لەگەڵیاندا،و ستایشی ئازایەتیی خەڵکی موسڵی کرد،و پێی راگەیاندن:( لەراستیدا، من هیچ کێشەیەکم لەگەڵ خەڵکی موسڵدا نەبوو، تەنیا مەبەستی من ئەوەبوو، بیروبڕوای خۆم راست بکەمەوە،و لایەنی راستی مەزهەبی سوننی و شیعە دەربخەم...). دواتر هەردوولا لەسەر مەرجەکانی ئاشتی رێککەوتن و دیارییان ئاڵوگۆڕ کرد،و دیاریی حاجی حوسێن جەلیلی بۆنادر شا هەشت ئەسپی رەسەن بوو.[174]

هەروەها قەشە سولەیمان سائیغی موسڵی دەگێڕێتەوە: خەڵکی موسڵ سەرکەوتنەکەیان بۆ پاڕانەوەی مەریەمی عەزراو پیاوچاکان دەگێڕنەوە، کەنادر شا پەیکەرو پەرستگەکانیانی رووخاند،و لەسەر سەربانی کەنیسەی عەزرادا، مۆتەکە دەبینران بەرگرییان لەشار دەکردو تۆپەکانیان دەگێرایەوە بۆناو دوژمن،و بۆیە حاجی حوسێن جەلیلی هەوڵی دا کەنیسەی عەزرا چاکسازیی بکات، کەبەهۆی شەڕەکەوە وێران بووو هەروەها کەنیسەکانی دیکەیشی چاکسازیی کرد.[175]

## رۆیشتنی نادر بۆ نەجەف:

[174] محەممەد ئەمین عومەری(منهل الأولياء) –مووسڵ 1967–ب1 ل160–161.
[175] سولەیمان سائیغ مووسڵی(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل288–289.



دوای ئەوەی نادر شا، لەگەڵ خەڵکی موسڵدا، پەیمانی ئاشتی بەست، رووی سوپاکەی کردە بەغداو ترس و دڵەراوکێی خستە ناو خەڵکەکەیەوە،و خۆیان بۆئابڵۆقە ئامادە کرد، بەڵام لەگەڵ گەیشتنی بۆکازمییە، نامەی بۆئەحمەد پاشا ناردو دڵنیای کردەوە، کەخوازیاری ئاشتییە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا. دواتر دانوستان لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا ئەنجام درا،و هیچ لەو دانوستانە لەبەردەستدا نییە، شێخ عەبدوڵڵا سویدی – یەکێك بوو لەوانەی گەلێ لەئەحمەد پاشاوە نزیك بوو– دوای ئەوەی ئاماژە بەهاتنی نادر شا بۆموسڵ دەکات، دەڵێت:(...لەهەواری گەورەمان موسا کوڕی جەعفەر دابەزی،و زیارەتی کرد، هەروەها زیارەتی محەممەد جوادی کرد، پاشان رووباری دیجلەی بڕی لەبەلەمێکدا،و زیارەتی ئەبو حەنیفەی کردو هێشتا لەگەڵ ئەحمەد پاشا لەسەر ئەوە رێکنەکەوتن کەدان بەراستیی مەزهەبی شیعەدا بنرێت،و بەمەزهەبی جەعفەر سادق ناوببرێت، دواتر رۆیشت بۆنەجەف، بەمەبەستی زیارەتی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب، بۆئەوەی ئەو گومەزە ببینێت کەفرمانی دابوو، بەزێڕ زاخاو بدرێت...).[176]

لەو داستانە باوانەی خەڵکی، دەماودەم دەیگێڕنەوە، سەبارەت بەنادر شا، ئەوەیە کاتێ لەدیواری ئەو سەردەمەی نەجەف نزیك دەبێتەوە، زنجیرێکی زێڕ دەخاتە ملی خۆی، هەروەکو بڵێی ئاماژە بەوە بکات

[176] عەبدوڵڵا سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ل5.

کەکۆیلەی ئیمامی عەلییە،و کاتیٚ دەگاتە سەر مەزارەکەی دەیلێسێتەوەو زنجیرەکەی بەدەروازەی مەزارەکەدا هەڵدەواسێت. دواتر هاوەڵەکەی، میرزا زەکی دێتە پێشەوەو دوو دێڕ لەشیعر دەخوێنێتەوە، شیعرەکە ئەم مانایە دەگەیەنێت:( بەدڵنیاییەوە، لەخاکی نەجەفدا بنوو،و پرسیار مەکە لەوەی رۆژی قیامەت چی روودەدات، چونکە زەوی کەمەی تیایدا دەگەڕێتەوەو دەبێت بەسرکە، هەر دەبیٚ خراپەکارییەکان بەچاکە ببن). شاعیر ئاماژە بەکەراماتێکی بەناوبانگی ئیمام عەلی دەکات، دەماو دەم، نەوە بەنەوە گێڕاویانەتەوە، ئەویش ئەوەیە پیاو خراپێك شووشەیەکی مەی هێناوە بۆنەجەف، مەیەکە بووە بەسرکە.[177]

## کۆنگرەی نەجەف:

[177] سولەیمان سائیغی مووسڵی(سەرچاوەی پێشوو)ب1 ل288–289.



هێشتا نادر شا لەنەجەفدا سەقامگیر نەبووبوو، تابڕیاری ئەوەی دا کۆنگرەیەکی گشتی ببەستێت، زانایانی شیعەو سوننی بەشداریی تیادا بکەن، بۆدانانی بنەماکانی نزیکبوونەوەی ئەودوو لایەنە نەیار بەیەکدییە. لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەمە ، لەوجۆرە، لەمێژووی ئیسلامدا، یەکەمین کۆنگرەبوو،و رەنگە دوا کۆنگرەیش بووبێت!

نادر شا لەگەڵ خۆی لەئێران، حەفتا زانای شیعەی هێنابوو، هەروەها حەوت زانای لەتورکستان،و حەوتیش لەئەفغانستان، دواتر سەید نەسروڵلای حائیری لەکەربەلا بانگێشت کرد، کە لەو سەردەمەدا، زانایەکی گەورەی شیعەبوو لەعیراقدا. داوای لەئەحمەد پاشایش کرد زانایەك بنێرێت، وەکو نوێنەری سوننییە عیراقییەکان،و ئەحمەد پاشایش شێخ عەبدوڵلا سویدی نارد.

سویدی لەبیرەوەرییەکانیدا، کە دواتر سەبارەت بەسەردانەکەی بۆنەجەف نووسی،و کورتەکەی ئەمەیە دەڵێت: کاتیٚ بەر لەخۆرئاوا، لەماڵەوە دانیشتبوو، لەلایەن ئەحمەد پاشاوە، پەیکێك سەردانی کردو داوای لێکرد بڕوات بۆنەجەف، بەمەبەستی باسوخواس لەگەڵ زانایانی شیعە، سەبارەت بەمەزهەبەکەیان،و سویدی خەریك بوو ئەو سەردانە رەت بکاتەوە، بەهۆی قورسی کارەکەوە، بەڵام ئەحمەد پاشا زۆری لێکرد،و دواتر پێی گوت:(داواکارم لەخودا، کەبەڵگەکانت بەهێز بکاتو زمانت بۆگوتنی راستی زوڵاڵ بکات، بەڵام تۆ سەرپشك بە لەوەی باسوخواسیان لەگەڵدا بکەیت، یان نەیکەیت. تەنیا ئەوەندە نەبێت، بەیەکجاری باسوخواسەکە رەت مەکەرەوە، بەڵکو لەو بارەوە هەندیٚ باسوخواس

بهێنـەرەوە، تاعەجەمـەکان بـزانن کـەتۆ زانیاریـت هەیـە. ئەگـەر بینیـت لەراسـتی لانـادەن، ئـەوا باسوخواسـیان لەگەڵـدا بکـەو خـۆت بەدەسـتەوە مـەدە. شـا لەنەجەفـەو داوات لێدەکـەم رۆژی چوارشـەممە لای ئـەو ئامادەبیـت). جلوبـەرگی نایـابو ئـاژەڵو خزمـەتکاری بۆئامـادە کـرد، و چـەندین خزمـەتکاری تایبـەت بـەخۆی لەگەڵـدا نـارد، دواتـر رووبـەرووی کردەوە لەگەڵ ئەو عەجەمانەی نادر شا ناردبوونی بۆ ئەوەی هاوگەشتی بن بۆنەجەف.

لـەرۆژی 22ی شـەوالی سـاڵی 1156ی کۆچـی–بەرامبـەر بـە11ی کـانونی یەکـەمی سـاڵی 1743ی زاییـنـدا– سـویدی لەگـەڵ یاوەرەکانیـدا گەشـتی نەجـەڤ کـرد، و بەدرێـژایی رێگـا، بـیری لەوبەڵگانـە دەکـردەوە کەبۆرووبەروبوونەوە، لەگـەڵ شیعەکاندا سوودیان لێوەردەگرێت، و چۆن وەڵامیـان بداتـەوە، و زیـاتر لەسـەد بەڵگـەی بـەلاوە گەڵاڵـەبوو، و بۆهـەر بەڵگەیـەکیش وەڵامێـك، دوو، یـان سـێ وەڵامـی هـەبوو. کـاتێ گەیشـتە نەجەف، رەوانەی لای نادر شا کرا، لەکۆشکە گەورەکەی، شا پێشوازیی لێکـردو هـەواڵی تەندروسـتیی ئەحمـەد خـانی پرسـی، دواتـر باسـی هـۆی بەسـتنی ئـەو کۆنگرەیـەی بـۆروون کـردەوە:(لەمەملەکەتەکـەی منـدا، دوو گـرووپ هەیـە–تـورکو ئـەفغانی– بەئێرانییـەکان دەڵـێن ئێـوە خوانەناسـن، خوانەناسـی شـتێکی قێزەونـە، یەکـدی تاوانبـار کـردن بەخوانەناسـی، شایسـتەی مەملەکەتەکـەی مـن نییـە. گـوتی ئێسـتا تـۆ لەلایـەن منـەوە سەرپشـکی، هـەموو ئـەو خوانەناسـییانە لاببـەیت، و ئاگـاداری ئـەوە بیـت گـرووپـی سـێهەم بەچـی پابەنـد دەبـن، و هەرشـتێکت بـینی یـان بیسـتت



ئاگاداری منو ئەحمەد خان دەکەیتەوە). دواتر رێگەی پێ دا کۆشك بەجێ بهێڵێتو فرمانی دا میوانی (ئیعتمادودەولە) بێت.

دوای نان خواردن، سویدی بەرەو خێوەتەکەی شێخ عەلی ئەکبەر رۆیشت، کە لەپۆستی سەرۆکی زانایانی ئاییینی(مەلا باشی) ئێراندا بوو، مشتومڕ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد. مەلا باشی سێ بەڵگەی هێنایەوە، کەجێنشـینیی دوای پێغەمبـەری دەسـەلماند، کەئەمانـەن: ئایـەتی موباهەلـە، و ئایـەتی دانـی زەکـات لـەکاتی رکـوع، و حەدیسـی مەنزیلـەو سـویدییش هـەوڵی دەدا هـەر سـێ بەڵگەکـە، یـەك لـەدوای یـەك رەت بکاتەوە.[178]

## بڕیارەکانی کۆنگرە:

[178] بۆئاگاداری لەرووداوەکانی ئەم کۆنگرەیە، بڕوانە کتێبی شێخ عەبدوڵڵای سویدی(الحجج القطعیة لاتفاق الفرق الاسلامیة) کە لەساڵی 1324ی کۆچی لەقاهیرە چاپ کراو، بۆجاری دووەم هەر لەقاهیرە، لەساڵی 1324ی کۆچیدا ، لەژێر ناوی(مؤتمر النجف)، لەگەڵ پێشەکییەكو راوبۆچوونی موحیبەدینی خەتیب چاپ کرایەوە.

دوای مشتومڕێکی دوورو درێژ، کەلێرەدا بواری ئاماژە پێکردنیان نییە، لەسەر چەند بڕیارێکی دیاریکراو ڕێککەوتن، دواتر زانایانی هەردوولا ، لەناو خانوویەك لەپشتی مەزاری ئیمام کۆبوونەوە،و کۆنووسێکیان نووسی کەلەم پێنج ماددەیە پێکهاتبوو:

یەکەم: لەبەر ئەوەی خەڵکی ئێران دەستیان لەوبۆچوونە کۆنانەی خۆیان هەڵگرت،و وازیان لەرەتکردنەوەو جنێودان هێنا،ومەزهەبی جەعفەرییان پەسەند کرد، کەیەکێکە لەمەزهەبە ڕەواکان، بۆیە ئومێدی ئەوە لەزانایان‌و دادوەران‌و ڕۆشنبیرانی ڕێزدار دەکرێت دان بەوەدا بنرێت‌و بەپێنجەم مەزهەب هەژماری بکەن.

دووەم: چوار روکنەکەی کەعبە تایبەتن بەچوار مەزهەبەکە، دوای ئەوەی ئیمام تەواویان دەکات، مەزهەبی جەعفەریش بەشدارییان دەکات لەروکنی شامیدا–لەسەر شێوازی خۆیان لەدوای ئیمامەکەیانەوە نوێژ دەکەن.

سێیەم: ساڵانە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە، ئەمیرێك دەستنیشان دەکرێت بۆحاجییە ئێرانییەکان،و پێگەی لەدەوڵەتی عوسمانیدا، پێگەی بەرزتر دەبێت لەپێگەی ئەمیری میسرو شام.

چوارەم:دیلەکانی هەردوولا بەربدرێن‌و سووکایەتییان پێنەکرێت.

پێنجەم: دوو نوێنەر لەهەردوو دەوڵەت دیاری بکرێن، لەپایتەختی هەردوولادا، بۆبەڕێوەبردنی بەرژەوەندییەکانیان، بەمەیش ناکۆکییە رواڵەتی‌و مەعنەوییەکان، لەنێوان ئۆمەتی پێغەمبەردا نامێنێت.

دواتر لەکۆنووسەکەدا، پوختەی ئەوەی لەسەری ڕێککەوتن تۆمار کرا، کەئەویش داننان بەچوار جێنشینەکەدا بوو بەدوای یەکدیدا،و ئەوەی کەجەعفەری سادق وەچەی پێغەمبەرە،و مایەی ڕێزلێنانی هەموو



موسڵمانانە،و لەلایەن پێشەوایانی هەموو مەزهەبەکانەوە پەسەندە، هەرکەسێ دوژمنایەتیی بکات، ئەوا لەئایین بێ بەرییە. دواتر بەم شێوەیە ئیمزای سونییەکانی لەسەر کرا،:

(ئێمە زانایانی ئیسلام، لەبوخاراو بەلخ دان بەوەدا دەنێین کەبیروباوەڕی ئیسلامیی ئێرانییەکان راستە، بەو شێوەیەی زاناکان پێشتر ئاماژەیان پێکرد،و ئەم گرووپەیش بەشێکن لەئیسلام،و ئۆمەتی پێغەمبەرن،و هەرکەسێ دوژمنایەتیی ئەم گرووپە بکات، ئەوا لەئایین دەرچووە،و لەشەفاعەتی پێغەمبەر بێ بەری دەبێت لەم دونیادا، ئەو بەرپرسە بەلای سوڵتانی ئاسۆکانەوە،و لەو دونیادا بەلای سوڵتانی سوڵتانەکانەوە. جیاوازیی لەگەڵ هەڵگرانی ئەم بیروباوەڕەدا، لەهەندێ لقدا، بەپێچەوانەی ئیسلامەوە نییە،و هەڵگرانی ئەو باوەڕە موسڵمانن،و ئەودوو گرووپەی ئۆمەتی پێغەمبەر، بۆیان نییە لەیەکدی بکوژن،و یەکدی تالان بکەن‌و یەکدی بەدیل بگرن،و برای ئایینیی یەکدین).[179]

شێخ عەبدوڵڵا سویدی دەڵێت: لەو کاتەدا کەزانایان کۆنووسەکەیان مۆر کرد، سونییەکان خۆشحاڵ بوون، بەجۆرێ کەخۆشیی لەوجۆرەیان بەخۆوە نەبینیبوو، لەسەردەمە پێشووەکان، کە لەشادیی ژنهێنان‌و جەژنەکان خۆشتر بوو، ڕۆژێکی تایبەت بوو، سوپاس بۆخودا..دواتر نادر شا شیرینی لەسەر سینیی زیونارد، لەگەڵ شەمعدانی زێڕین، کەبە شمڵ‌و سەنگی گرانبەها نەخشێنرابوو، دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە، شا ئەوشتانەی بەمەزارەکە بەخشی،و ئیتر لەوە بەدواوە، لەهەموو خێوەت‌و چادرێکی سەربازاندا،و لەسەر زاری هەموو عەجەمێك، باسی باشەی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان دەکرا، کە لەئایاتی قورئان‌و وتەکانی پێغەمبەر وەریان دەگرت، بەجۆرێ تەنانەت سونییەکانیش بەوجۆرەیان

[179] جەعفەر مەحبووبە(سەرچاوەی پێشوو)ب1 ل225.

نەدەکرد، و ئیتر رەخنەیان لەرای شا ئیسماعیل، لەمەڕ جنێودان بەجێنشینەکان دەگرت.[180]

## تێبینییەکی کۆمەڵایەتی:

لەراستیدا، ئەو دەرئەنجامەی کۆنگرەی نەجەف بەدەستی هێنا، شایستەی رێزلێنانە، و چارەسەرێکی مامناوەندیی بۆکێشە گەورەکەی نێوان شیعەو سوننی دۆزییەوە، و ئەم دوو گرووپە نەیاندەتوانی بەچارەسەرێکی کۆتایی لێکچووی کۆنگرەکە بگەن، بەڵام لێرەدا پرسیارێکی گرنگ لەرووی کۆمەڵایەتییەوە دەکەین: چۆن ئەندامانی کۆنگرە توانییان بەو دەرئەنجامە سەرکەوتووە بگەن؟!

بۆئەوەی لەگرنگیی ئەم پرسیارە بگەین، دەبێ ئەوە فەرامۆش نەکەین کەئەندامانی کۆنگرە، کاتێ مشتومڕیان بوو، مشتومڕەکەیان لەسەر بنەمای مشتومڕی لۆژیکیی کۆن بوو، و شێوازی گوتت و گوتم بوو، و ئەم شێوازە بەدەرئەنجامێکی سەرکەوتوو ناگات، کەهەردوو گرووپەکە لەسەری رێکبکەون، هەرچەندە ئەو مشتومڕە درێژە بکێشێت. ئەم نیارە لەهەموو مشتومڕە زارەکییەکاندا تێبینی کراوە، کەلەدێر زەمانەوە تائەمڕۆ، لەنێوان خەڵکیدا بەرپابووە[181] بەدەگمەن نەبێت، رووی داوە

[180] عەبدوڵڵا سویدی(سەرچاوەی پێشوو)ل24-26.

[181] بۆتێگەیشتن لەرەخنەی لۆژیکیی کۆن، و سروشتی مشتومڕەکانی ئەو شێوازە، بڕوانە کتێبی(منطق ابن خلدون في حضارته وشخصيته)ی نووسەر-قاهیرە 1962-بەشی یەکەم.



کەدوو گرووپ مشتومڕیان بێت، و دواتر یەکێکیان توانیبێتی راستیی بۆچوونەکەی خۆی بۆگرووپی دووەم بسەلمێنێت، یان چاوپۆشیی کردبێت لەبۆچوونەکەی خۆی، و رەنگە ئەوە راست بێت کەتامشتومڕەکە زیاتر درێژەی کێشابێت، بۆشایی نێوانیان زیاتر بووەو دوژمنایەتییەکە توندتر بووە.

سروشتی ئەم مشتومڕانە وایە، کەئەگەر یەکێك لەدوو گرووپەکە، بتوانێت بەڵگەیەك بهێنێتەوە، گرووپی دووەم دەتوانێت بەڵگەیەك بهێنێتەوە، بۆپووچەڵکردنەوەی ئەوەی دیکە، ئەمەیە کەجاران پێی دەگوترا(هاوشانیی بەڵگەکان). ئەم سەرکەوتنە لەمشتومڕدا، پشت بەتوانایی وتەبێژ ولێهاتوویی و پێشینەی زانیاریی دەبەستێت، زیاتر لەراستیی بۆچوونەکەی، و ئەگەر هاتو دوو وتەبێژەکە هاوشان بوون لەتوانایی و لێهاتووییدا، ئەوا مشتومڕی نێوانیان، تاخوا بیەوێت درێژە دەکێشێت، بەبێ ئەوەی کەسیان بتوانێت بۆچوونی خۆی بۆئەوی دیکە بسەلمێنێت. هەر بەڵگەیەك چەندە بەرواڵەت بەهێز بێت، دەکرێ بەرپەرچ بدرێتەوە، و رەنگە وەڵامەکەیش، وەڵام بدرێتەوە، و بەم شێوەیە بۆهەتا هەتایە. کاتێ مشتومڕەکە، بەهەر هۆیەك کۆتایی بێت، هەر یەکێك لەدوو گرووپەکە پێیوایە خۆی سەرکەوتووەو دوژمنەکەی دۆڕاوە.

مشتومڕە مەزهەبییەکان لەئیسلامدا، هەر لەسەرەتاوە، بەم جۆرە بووە و ئەگەر کەسێکئەو مشتومڕانە تاوتوێ بکات کە لەبەغدادا ئەنجام دەدران، لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا، یان ئەوەی لەنێوان زانا حیللی و ئیبن تەیمیە، لەسەدەی حەوتەمدا رووی دا، یان ئەوەی لەگەڵ سەرهەڵدانی

دەوڵەتی سەفەوی، لەسەدەی دەیەمدا رووی دا، ئەوەی بەلاوە روون دەبێتەوە، کەهەر هەموویان لەسەر یەك رەوش بوون، ئەویش ئەوەیە کە لەسەر پرەنسیپی(هاوشانیی بەڵگەکان) بووە. ئەوەی سەرنج راکێشە، ئەوەیە کەشێخ عەبدوڵڵا سویدی خۆی کرۆکی کۆنگرەی نەجەف بوو،و لەمشتومڕێکی لەو جۆرەدا بەشداریی کرد لەبەغدا، لەگەڵ زانایەکی شیعەدا، لەساڵی 1718- واتە بیست و پێنج ساڵ بەر لەبەستنی کۆنگرەکە[182]-گومانی ئەوە دەکرێت کەمشتومڕەکە کۆتایی هاتبێت، هەروەکو چۆن هەر مشتومڕێکی لەو جۆرە کۆتایی دێت، کەهەر گرووپێك پێی وابوو توانیویەتی، لەرێگەی بەڵگەی هزری و راگەیەنراوەوە، بەسەر دوژمنەکەیدا سەربکەوێت.

## ویستی دەسەڵاتدار:

رەنگە فاکتەری بنەڕەتیی لەسەرکەوتنی کۆنگرەی نەجەف، سەرەرای بەبن بەست گەیشتنی مشتومڕەکانی، ئەوەبێت کەپێی

[182] عەبدورەحمان سویدی(حديقة الزوراء في سيرة الوزراء) -بەغدا 1962-ب1 ل75-79.



دەڵێین(ویستی دەسەڵاتدار)و مەبەستمان ویستی نادر شایە. ئەو پیاوە دەیویست بەهەر شێوەیەك بێت، ئەو کۆنگرەیە سەرکەوتوو بێت، دیارە- بەر لەبەستنی کۆنگرەکە- ئاگاداری مەلا باشی و زاناکانی دیکەی شیعەی کردبوو، کەهێندە لەمشتومڕەکەدا، لەگەڵ سویدی توند نەبن.

سویدی لەبیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: ئەو لەوە ترساوە، نەبادا عەجەمەکان لەمشتومڕەکانیان لەگەڵیدا، بێ بەزەیی بن،و ئەوەی بۆ موفتیی ئەفغان، مەلا حەمزەی قلنجانی گێڕاوەتەوە،و مەلا حەمزەیش دڵنیای کردۆتەوە،و پێی گوتووە:(لەوە دڵنیا بە، چونکە شا چاودێری لەسەر ئەم کۆنگرەیە داناوە،و لەسەر چاودێرەکە چاودێرێکی دیکەی داناوە،و بەم جۆرە،و هەر یەکەیان ئاگاداری ئەو کەسە نییە کەبەسەریەوە چاودێرە، ئیتر ناتوانێت پێچەوانەی راستییەکانی بۆبگێڕێتەوە).[183] ئەمەیش دەلالەت لەوە دەکات کەسایەتیی شا بەشێوەیەکی کاریگەر، زاڵ بووە بەسەر کۆنگرەکەدا، هەر یەکێك لەئەندامانی کۆنگرە هەستی بەوە دەکرد کە لەلایەن شاوە چاودێری دەکرێت،و ئەوەی دەزانی کە هەر دەستپێشخەرییەك بۆچەن و چوونی زیاتر لەگەڵ سویدی، یان هەر دەنگە دەنگێك لەکاتی مشتومڕەکەدا، توڕەبوونی شای لێدەکەوێتەوە.

بەکورتی، ئەگەر کۆنگرەکە لەسەر رەوتی خۆی بڕۆیشتایە، بەبێ ئەوەی نادر شا سەرپەرشتی بکات، ئەوا بەو دەرئەنجامەی خۆی

[183] عەبدوڵڵا سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ل12.

نەدەگەیشت،و رەنگە دەرئەنجامی ئەوەی لێبکەوتایەتەوە، کەدوژمنایەتیی نێوان دوو گرووپەکە توندتر بکات.

ئەوەی لەم بارەوە، شایانی ئاماژە پێکردنە، ئەوەیە کەسویدی کاتێ لەبیرەوەرییەکانیدا، ئاماژە بەرۆڵی خۆی لەکۆنگرەکەدا دەکات، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کەئەو باڵادەست بووە لەمشتومڕەکانداو مەلا باشی بێ دەنگ کردووە، بەهێزی بەڵگەکانی و ناچاری کردووە مل بەراوبۆچوونەکەی بدات، بەڵام کاتێ ئەو نووسینانە دەخوێنینەوە کەشیعەکان لەمەڕ کۆنگرەکە نووسیویانە، جۆرێکی دیکەیە: بەڵگەکانی سویدی ساردو سڕو بێ مانابوون،[184] ورەنگە بێ دەنگیی مەلا باشی لەو سۆنگەیەوە بووبێت کەنەرمی بنوێنێت و لەسەر خواستی نادر شا مشتومڕی زۆر لەگەڵ سویدیدا نەکات.[185]

## خۆشحاڵیی نادر شا:

---

[184] جەعفەر مەحبووبە(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل225.

[185] موحسین ئەمین(أعيان الشيعة)–بەیرووت1958–ب41 ل52.



سەرکەوتنی کۆنگرەی نەجەف نادر شای گەلێ خۆشحاڵ کرد،و پێی وابوو کەتیایدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست هێناوە، کە بەر لەو هیچ سوڵتانێکی موسڵمان نەیتوانیوە بەدەستی بهێنێت. دوای کۆنگرەکە شێخ سویدییان بردە لای،و پێی گوت:

(خودا پاداشتی خێرت بدات،و هەروەها پاداشتی ئەحمد خانیش بدات. سوێندبێ بەیەزدان، هیچ کەمتەرخەمیی نەکرد لەبەرقەراری ئاشتی،و دامرکاندنەوەی ئاژاوە،و رشتنی خوێنی موسڵمانان. خودا پشت و پەنای سوڵتانی بنەماڵەی عوسمان بێت،و زیاتر لەوە شکۆمەندی بکات...ئەی عەبدوڵڵا ئەفەندی، وانەزانی کەشاهەنشا شانازیی بەوەوە دەکات، بەڵکو ئەوە خودابوو ئاسانکاریی بۆی کرد،و سەریخستم،و لەسەر دەستی من بوو کەجنێودان بەیارانی پێغەمبەر هەڵگیرا، لەکاتێکدا، بنەماڵەی عوسمان هەر لەسەردەمی سوڵتان سەلیمەوە، تائەمڕۆ–چەندە سەربازیان رێکخست و پارەو پوڵیان خەرج کردو خەڵکیان لەناو دا، بۆئەوەی رێگە لەوجنێودانانە بگرن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. بەندە، سوپاس بۆخودا، بەئاسانی نەمهێشت. ئەم کارە قێزەونە لەئیسماعیلەوە بوو، کەخەڵکی لاهیجان فریویان دا،و تائەمڕۆ بەردەوام بوو... ئەی عەبدوڵڵا ئەفەندی، ئەگەر من شانازییەك بکەم، بەوەوە دەیکەم کە لەم کۆڕەمدا، من سوڵتانی چوار شوێنم: سوڵتانی ئێران، سوڵتانی تورکستان، سوڵتانی هیند،و سوڵتانی ئەفغان. بەڵام ئەم نیارە، لەلایەن خوداوە بووە،

هـەموو موسـڵمانان قـەرزاری مـنن، چـونکە مـن تـوانیم جنێـودان بـەیارانی پێغەمبەر هەڵگرم،و داواکارم شەفاعەتم بۆبکەن...).[186]

لەراسـتیدا، نـادر شـا مـافی خـۆی بـوو شـانازیی بەسـەرکەوتنی کۆنگرەکەوە بکاتو پێی خۆشحاڵ بێت، چونکە گومانی تێدا نییە، ئەوە کـارێکی مـەزن بـوو، بـەڵام نـادر شـا لـەکاتی خۆشـحاڵییەکەیدا، نیـارێکی گرنگـی فـەرامۆش کـرد، ئـەویش ئـەوەبوو کەکۆنگرەکـە ناتوانێـت کاریگەرییەکی هەمیشەیی هەبێت، ئەگەر هاتو میرو زانایانی موسڵمانان هەر هەموویان، هاوکاریی یەکدی نەکەن بۆجێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی،و دواتریش نەوە دوای نەوە، درێژە بەو هاوکارییە نـەدەن، چونکە کێشەیەك کەماوەی زیاتر لەدە سەدە لەنێوان ئەو دوو گرووپەدا درێژەی هەبووبێت، تـەنیا بەنووسـینەوەی کۆنووسـێكو مـۆرکردنی، هـەروا بەئاسـانی لـەناو ناچێت.

## بەڵگەكان لەناخەوە:

[186] عەبدوڵڵا سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ل25.



نادر شا فرمانی دا نوێژی هەینی لەمزگەوتی کوفە بکرێت، کەچەند میلێك لەنەجەفەوە دوورە،و داوای لەسویدی کرد ئامادەی نوێژکردنەکە ببێت، تاوەکو بەگوێی خۆی ستایشکردنی جێنشینان ببیستێت، لەلایەن وتاربێـژانی شـیعەوە. لەبـەیانیی ڕۆژی هەینیـدا، هـەموان روویـان کـردە مزگـەوت،و سـەید نەسـروڵڵا حـائیری سـەرکەوتو وتـارێکی خوێنـدەوەو تیایدا، ستایشی یەکە یەکەی چوار جێنشینەکەی کرد، هەروەها ستایشی جێنشـینەکانی دیکـەو بنەماڵـەی پێغەمبـەری کـرد،و دواتـر ستایشـی سوڵتانی عوسمانیو لەدوای ئەویش نادر شای کرد.

جێگـەی ئامـاژە بۆکردنـە، حـائیری کـاتێ گەیشـتە نـاوی جێنشـینی دووەم عومـەر، بـەپێی ڕێزمـانی عـەرەبی(مکسـور)ی دەکـات، لەکاتێکـدا، نەدەبوا(مکسور)ی بکات، چونکە ناوی عومەر، لەعەرەبیدا سەرف ناکرێت، ئیتر نـازانین حـائیری بەهەڵـە ئـەوەی کرد، یـان بەئەنقەست. سویدی بـەوە گـەلێ بێـزار بـوو،و ئـەو کـارەی حـائیری بـەپلانێ دانـا کەویسـتبێتی سـووکایەتی بەعومـەر بکـات، ڕێـك دەڵێـت:( کەسـرەی لـەژێرپیتی (ر)ی عومەردا دانا، لەکاتێکدا وتاربێژ عەرەبیزانە، بەڵام بەئەنقەست ئەو کارەی کـرد، و تـەنیا پیـاوە گـەورەکان پـەی بـەو پیلانـە دەبـەن، چـونکە عومـەر تەنیا(سەرف) نەکردنی بۆدادو زانیاری بوو، ئەم سەرفکردنە قێزەونەی بەو مەبەستە بوو، کەگوایا عومەر نەدادپەروەر بووەو نەزانا، خوا بیکوژێت بۆچ

وتاربێژێکـه، و سـووکی بکـات، کەشـایانی ئەوەیـە، لـەم دونیـا و لـەو دونیـا سووك بێت...).[187]

ئەمە بەڵگەیە بۆئەوەی ئەو نزیکبوونەوە مەزهەبییە کەلە کۆنگرەی نەجەفدا رووی دا، شتێکی رواڵـەتی بـوو، و نەچووە ناخـەوە، و بـەدگومانی هەر رۆڵـی خـۆی دەگێـڕا، ئەگەرچی بەرواڵـەت خۆشـحاڵییان پیشـان دەدا، و هەربۆیـە سـویدی لەهـەر وشـەیەك ورد دەبـووەوە کەلـەزاری حـائیری دەهاتـە دەرەوە، لەوتارەکەیدا، و بەڵام لەبەر ئەوەی جگـە لەوهەڵـە بچووکە، شتێکی ئەوتۆی بەدینەکرد–کەئەویش(مەکسور–کردنی دوا پیتی عومەر بوو– ئـەو دەرفەتــەی قۆســتەوە و زێــدەڕەوی تیــادا کــرد، و ئــەوەی لێــوە هەڵقۆســت کەپێشتر بۆنی رۆحی دوژمنایەتیی کۆنی لێوەدەهات. دەبوا ئەگەر گومـانی خراپی نەکردایە، ئـەو نیـارەی بەباشـی راڤـە بکردایـە، بـەڵام ئـەوەی نـەکرد، کەئـەوەیش دەلالـەت لـەوە دەکـات، کـە ئـەو ناتەباییـەی چـەندین سـەدە درێژەی هەبوو، لەپڕێکدا لانەدەچوو.

بەڵگەیــەکی دیکــەیش هەیــە، دەکــرێ لێــرەدا ئامــاژەی پێبکــەین، ئەویش ئەوەیـە کەسـویدی کـاتێ ویسـتی دوای کۆتـایی هـاتنی کۆنگرەکـە، نەجەف بەجێ بهێڵێت لەگەڵ مەلا باشیدا مشتومڕی کرد، تیایدا هەوڵی دا، ئەوە بسەلمێنێت کەشیعە لەسەر مەزهەبی جەعفەری سادق نین، و ئەمـەیش وەکــو دیــارە، ناکۆکــە لەگــەڵ ئــەوەی لــەکۆنگرەی نەجــەف لەســەری

[187] سەرچاوەی پێشوو، ل26–27.



رێککــــەوتبوون. لێـــرەدا دەقـــی وتەکـــەی ســـویدی، کـــە لـــەکۆتایی بیرەوەرییەکانیدا هاتووە، بڵاودەکەینەوە:

(ئــەو مەزهەبــەی پــەیڕەویی دەکــەن، ناگەڕێتــەوە بــۆ زانایــەکی ئـاییینی.. و فـڕی بەجەعفـەری سـادقەوە نییـە، و ئێـوە ئاگـاداری مەزهـەبی جەعفەری سـادق نـین، ئەگـەر بڵـێن لەمەزهـەبی جەعفـەری سـادقدا پاراسـتن لەئازار هەیە، ئەوا ئێوە هـیچ لەمەزهـەبی ئـەو نـازانن... چونکە هـەر نیارێك بدرێتە پاڵی، شیمانەی ئەوەی لێدەکرێت پاراستن لەئازار بێت، چونکە هیچ پەیوەندییـەکی جیاکـاری لـەنێوان ئـەوەی پاراسـتن لـەئازارو شـتی دیکـەدا هەبێت، لەئارادا نییە... ئەگەر بڵێن لەمەزهـەبی جەعفـەری سـادقدا پاراسـتن لەئازار هەیە، ئەوا ئەو مەزهەبە مەزهەبێك نییە کەئیوەی لەسەربن).[188]

## چارەنووسی حائیری:

[188] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە/ 29.

کۆنگرەی نەجەف لەکۆتایی مانگی شەوالدا بەسترا، واتە نزیك بوو لەکاتی حەجەوە،و نادر شا ویستی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە. ئەوەبو سەید نەسروڵڵای حائیری نارد بۆمەکەو کۆپییەکی ئەو کۆنووسەی پیادا نارد کە لەکۆنگرەکەدا لەسەری رێککەوتبوون، هەروەها نامەیەکی بۆ شەریف مەسعوود، میری مەکەو موفتی ودادوەری ئەو شارە نارد،و تیایدا گوتبووی کەئیمامی مەزهەبی جەعفەری بۆلایان رەوانە کردووە، بۆجێ بەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەکە.

کاتێ حائیری گەیشتە مەکە، رێگەی پێدرا لەوێ نوێژ بکات ولەگۆشەی شامی لەکەعبەدا، وتار بخوێنێتەوە-هەروەکو لەبڕیارەکانی کۆنگرەدا هاتبوو-و ئێمە نازانین وتارەکەی حائیری لەوێ چۆن بوو،و ئایا لەوێیش(کەسرە)ی خستە ژێر دوا پیتی عومەر، یان نەء، بەڵام ئەوەی کەدەیزانین ئەوەیە خەڵکی مەکە وروژان و هەڵچوون،[189] ئەمەیش وای لەشەریف مەسعوود کرد، بێتە ناو نیارەکەوەو نامەیەك بۆسوڵتان بنووسێت و لەرووداوەکە ئاگاداری بکاتەوە. من پێموایە شێخ سویدی دەستی بوو بێت لەوەدا، چونکە لەکۆتایی بیرەوەرییەکانیدا، سەبارەت بەکۆنگرەکە دەنووسێت:(بۆیە، ئەوەی رووی دا ئەوەبوو بڕیارم دا بچم بۆحەج، خودایە ئاسانکاریم بۆبکە).[190]

فرمانی سوڵتان لەئەستەنبوڵەوە گەیشت،و داوا لەشەریف مەسعوود کرابوو، حائیری دەستگیر بکات و بیدات بەدەستی میری حەج

[189] موحسین ئەمین(سەرچاوەی پێشوو)-بەیرووت 1960-ب49 ل106.

[190] عەبدوڵڵا سویدی(سەرچاوەی پێشوو) ل29.



ئەسعەد پاشا عەزم، بۆئەوەی لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆشام و لەقەڵای دیمەشقدا زیندانیی بکات،و دوای ئەوەی حائیری لەقەڵادا زیندانی کرا، سوڵتان داوای کرد و رەوانەی ئەستەنبوڵ کرا.[191]

بەوردی نازانرێت لەئەستەنبوڵ، چییان بەسەر حائیریدا هێنا، نووسەری(روضات الجنات) دەڵێت:نادر شا داوای لەحائیری کرد، دوای حەج بچێت بۆئەستەنبوڵ، بۆچەند کارێك کەپەیوەندییان بەدەسەڵات و خەڵکییەوە هەبوو، بەڵام حائیری کاتێ گەیشتە ئەستەنبوڵ، لای سوڵتان بۆیان تێچاند، بەوەی مەزهەبی شێواندووە،و چەندین کاری دیکە، بۆیە هێنایانە بەردەمی ولێپێچینەوەی لەگەڵدا کرا...).[192]

دکتۆر مورتەزا نەسروڵڵا-کەلەبنەماڵەی حائیرییە- بۆی گێڕامەوە، کەئەو گێڕانەوەیەی بنەماڵە سەبارەت بە چارەنووسی باپیرەیان، ئەوەیە بەهۆی دانانی زەهر لەناو خواردنەکەیدا مردووە، بەڵام بەرەسمی لەگۆڕێکی شیاو بەخۆی بەخاك سپێردراوە،و تائێستا گۆڕەکەی ماوەو پەنجەرەی لەسەر هەڵبەستراوە،و ژنان زیارەتی دەکەن،و قوربانیی بۆدەکەن.[193]

[191] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب5 ل270.

[192] محەممەد باقر خوونساری(سەرچاوەی پێشوو) ل727.

[193] شایانی ئاماژەپێکردنە، لەم رووەوە لەئەستەنبوڵدا گەڕەکێك هەیە بەناوی(والدة خان)و زۆربەی دانیشتوانیی شیعەن لەتورکەکانی ئازەربایجان،وپێدەچێت، خەڵکی ئەم گەڕەکەبن، کەزیارەتی گۆڕی حائیری دەکەن.

## دوا هەوڵ:

لەساڵی 1745–دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێك بەسەر كۆنگرەی نەجەفدا–دووبارە ، لەنێوان نادر شاو دەوڵەتی عوسمانیدا، لەسەر سنوور لەنزیكی ئەرمینیا شەڕ هەڵگیرسایەوە،و محەممەد پاشا یكن، سەركردایەتیی سوپای عوسمانی دەكرد،و لەعیراقییەكان، حاجی حوسێن پاشا جەلیلی بەشداریی كرد،و نادر شا هەزاران سەربازی، لەپەلامارە چاوەڕواننەكراوەكاندا، لەدەست دا. دواتر شەڕی یەكالاكەرەوە، لەنێوان ئەو دوو تاقمە، لەمانگی ئابی 1745 دا، لەنزیكی ئەریڤان رووی دا،و نادر شا توانی شكستێكی گەورە بەسەر سوپای عوسمانیدا بهێنێت، كەتیایدا سەركردە محەممەد پاشا یكن بەدەستی سەربازەكانی خۆی كوژرا.

دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دا سوپای نوێ ئامادە بكات، لەپێناوی دووبارە هەڵمەت بردنە سەر نادر شا، بەڵام ئارەزووی خۆی بۆئاشتی دەربڕی،و شاندێكی نارد بۆئەستەنبوڵ بۆ دانوستان،و شاندەكە گەیشتە بەغداو چاوی بەئەحمەد پاشا كەوت،و ئەم پیاوە هەوڵێكی زۆری دا، بەمەبەستی بەرقەرار كردنی ئاشتی.

شاندەكە نامەیەكی لەنادر شاوە بۆسوڵتانی عوسمانی هێنابوو، تیایدا هاتبوو:(دڵسۆزیی،و هەزاران سڵاوی پڕ لەخۆشەویستیو وەفاداری خۆمان، بۆهومایۆن دەردەبڕین،و لەسەر داخوازیی هەموان،و بەمەبەستی دەربڕینی رای جەماوەر، لەهەوادارانی ئیمام جەعفەری سادق، خودا لێی رازی بێت، دەڵێین:دوای رووداوی كێشەكەی سەركردە محەممەد پاشا، كەوتینە بیری ئەم شەڕو شۆڕانەی لەنێوان موسڵماناندا روودەدەن، چۆن خۆمانی لێ بپارێزینو لەشوێنی خوێنڕشتن، ئاشتی بەرقەرار بكەین، ئەم شەڕانە كەلەكاتی بەردەوامبوونیدا، تەڕو وشك پێكەوە دەسووتێنن. بۆیە، لەبەر ئەوەی هەموان نیازیان پاكە،و لەبەر ئەوەی هەمووومان لەسەر یەك ئایینین،و لەبەر ئەوەی كاتێ ئێرانییەكان دەچن بۆحەج، نوێژو فەرزەكان لەسەر رێبازی یەكێك لە ئیمامەكانی چوار مەزهەبەكە ئەنجام دەدەن،و ئەمەیش وایان لێدەكات یەك دەست بن،و هیچ جیاوازییەكیان لەنێواندا نەبێت. لەپێناوی ئەم پەیوەندییە ئایینیو برایانەیەدا، داوای لێبووردنو ئاشتیی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە دەكەم، كەتا رۆژی قیامەت ئەم رێكەوتنە بەردەوام بێت،و هیوادارین بەڕێزتان رەزامەندیی لەسەر بكەن،و داواكارییەكەمان رەت نەكەنەوە،و خۆتانو جێنشینیتان هەر پایەدار بێت).

سوڵتان وەڵامی نامەكەی دایەوە،و تیایدا هاتبوو:(...ئێمە نامە بەڕێزەكەی ئێوەمان پێ گەیشت،و ئەوەی زیاتر دڵخۆشی كردین، ئەو هەوڵانەتان بوو، لەوكۆنگرەیەی لەبیابانی موغاندا بەستتان،و تیایدا، بۆچوونی موسڵمانانتان یەكخست،و كینەتان لەنێوانیاندا نەهێشت، كەلەنێوان ئەو دوو تاقمەدا هەبوو،و واتان لێكردن پەیڕەویی لەرێبازی سوننییەكان بكەن،و بیدعەتو كاری قێزەونتان نەهێشت،و هەموو ئەو هۆكارانەتان هەڵگرت، كەپەیوەندیی نێوانمانی تێكدەدا، ئەمەیش بەخۆشحاڵییەوە دەوڵەتی عوسمانی پێشوازی لێكرد. بۆئەوەی ئەم دۆستایەتیو خۆشەویستیو برایەتییە لەنێوان هەردوو دەوڵەتەكەدا،

بەردەوام بێت، ئێمە پابەند دەبین بەپێنج ماددەکەوە، بۆئەوەی ببێتە ئامرازێك بۆتۆکمە کردنی پەیوەندییەکانو بەردەوامبوونیانو نوێکردنەوەیان، بۆئەوەی چیتر شتێکی ئەوتۆ روونەدات، ئەم پەیوەندییە برایانە تێك بدات، یان ببێتە مایەی راڤەکردنو دوژمنایەتی...و سنوورەکان دەگێڕینەوە بۆئەوەی لەسەردەمی خاقان سوڵتان موراد خانی چوارەمدا بەرقەرار بوو... جگە لەمە، پێویستە ئێرانییەکان لەوە بگەیەنن، کەدەست بەرداری ئەو بیدعەتانە بن کەلەسەردەمی سەفەوییەکاندا، خۆیانیان پێوە پابەندکردبوو، و بگەڕێنەوە سەر مەزهەبی سونییەکان، و چیتر جنێو بە چوار جێنشینەکانو یارانی دیکەی پێغەمبەر نەدەن-خودا لەهەموویان رازی بێت-و بەرێزەوە ناویان بهێنن، و بۆئەوەی لەمەکەو مەدینەدا، بەباشی مامەڵەیان لەتەکدا بکرێت، کەجیاواز بێت لەمامەڵەی حاجییەکانی دیکە).

لەنەورۆز21ی ئاداری 1747دا، رێکەوتنەکە مۆر کرا، و لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە دانی پیادا نرا، و تیایدا هاتبوو:(...بەهۆی شکۆمەندیی تاجی شاهانی مەملەکەتی هیندو ئێران، و خاقانی گەورە، سێبەری یەزدان، شاهی شاهانی جیهان، سوڵتان نادر شا، خوداوەند دەسەڵاتی پایەدار بکات، و ئەوەی ئەنجامیدا، لەکۆنگرەکەی بیابانی موغان، لەپێناوی بتەوکردنی پەیوەندیی برایانە لەنێوان موسڵماناندا، وایکرد هەموان پابەند بن بەدەسەڵاتەکەیەوە، و ئەوانەی نەهێشت کەئیسماعیل سەفەوی بڵاوی کردەوە، لەئاژاوەو گەندەڵی، و لەیەك دوورخستنەوەی موسڵمانان، بەناوی مەزهەبەوە، کەئەمەیش تۆوی دوژمنایەتیی لەنێوان رۆمو ئێرانییەکاندا چاند، و هەموانی بەرەو برایەتی برد، لەنێوان جەعفەرییەکانو سونییەکاندا، کەئەمەیش رەزامەندیی خوداوەندی بۆخۆی راکێشا...خاقانی دوو دەریاو سوڵتانی دوو وشکانی، ئەسکەندەری دووەم، جێنشینی سێبەری خوداو پاشای ئیسلام...سوڵتان مەحموود خان، خودا پشتگیریی لەدەسەڵاتو جێنشینییەکەی بکات، و رەزامەندیی وەرگیرا بۆبەستنی رێکەوتنەکە، و تەرخان کردنی گۆشەیەك لەگۆشەکانی کەعبە، بۆنوێژی جەعفەرییەکان، و دەستنیشان کردنی سەرپەرشتیاریی حاجییەکان، و رێگەدان پێیان، لەرێگەی شامو میسرەوە، بچن بۆحەج، و بەردانی دیلەکانی هەردوولا، و دەستنیشانکردنی نوێنەری هەر یەکێك لەو دوو دەوڵەتە لەوی دیکەدا...).[194]

[194] سەبارەت بەدانوستانو نامەگۆڕینەوەکانی نێوان نادر شاو دەوڵەتی عوسمانی، بڕوانە کتێبی(دوحة الوزراء)ی شێخ رەسووڵی کەرکووکلی، لاپەڕە 67-89.

## ئاژاوە لەئێراندا:

تەنیا سێ مانگ نادر شا چێژی لەو ئاشتییە وەرگرت کەلەنێوان خۆیو دەوڵەتی عوسمانیدا بەرقەراری کرد، چونکە لە20ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا کوژرا. مامۆستا براون، سەبارەت بەهۆی کوشتنەکە دەڵێت: نادر شا پلانێکی ترسناکی دارشتبوو، بۆکوشتنی هەموو ئێرانییەکان لەسوپاکەیدا، تاوەکو جگە لەتورکمانو ئۆزبەکی کەسی تیادا نەمێنێت، بەڵام هەندێ لەسەرکردە ئێرانییەکان، بەپلانەکەیان زانی،و دەستوبردیان کرد لەکوشتنیدا،و وەکو دەڵێن:(نەیانهێشت دەست بکاتەوە).[195]

دەگێڕنەوە کاتی بەشەو خۆیان گەیاندە خێوەتەکەی، بەمەبەستی کوشتنی، لەخەو راپەڕیو کەوتە شەڕ کردن لەگەڵیاندا، تادوانی لێ نەکوشتن گیانی لەدەست نەدا.[196] هەرچۆن بێت، نادر شا بەشێوەیەك مرد کەشایستەی خۆی بوو، بەجەنگاوەری ژیا و بەجەنگاوەری مرد!

کاتێ هەواڵی کوشتنی نادر شا لەنێوان سوپاکەیدا بڵاو بووەوە، ئاژاوە دەستی پێکردو پەلاماری خێوەتەکەیان داو تاڵانیان کرد،و کێشەو شەڕ لەنێوان شیعەو سونییەکانی ناو سوپاکەدا دەستی پێکرد. ئەحمەد خانی دورانی کەسەرکردایەتیی سەربازە ئەفغانیو ئۆزبەکییەکانی دەکرد، ویستی تۆڵەی نادر شا بسەنێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو،و سوپاکەی

195-Edward Browne(Op. Cit.) vol. 4, P.137.
196-Percy Sykes(Op. Cit.) vol. 2, p. 273.



کێشایەوە بۆئەفغانستان،و لەوێ دەوڵەتێکی بەهێزی دامەزراند، بەناوی دەوڵەتی ئەفغانیو تائێستایش بەرقەرارە.

کوشتنی نادر شا دەستپێکی بڵاوبوونەوەی ئاژاوە بوو لەسەرانسەری ئێراندا،و کوشتنو بڕینو بشێوی لەهەموو شوێنێکدا بڵاو بووەوە،و وایلێهات پاشاکان، یەك لەدوای یەك دەهاتنە سەر تەخت،و تەنیا ماوەیەکی کورت کارەکان بەباشی دەڕۆیشتو، تایەکێکی دیکە شۆڕشی دەکرد بەسەریدا،و لەسەر تەخت دایدەگرت. ئەوەی سەیربوو، ئەوەبوو هەر کەپاشایەك بەسەر ئەوی دیکەدا سەردەکەوت، چاوی هەڵدەکۆڵی،و نازانم هۆکەی چی بوو، کەنەریتی چاو هەڵکۆڵین، لەو سەردەمەدا بڵاو بووەوە. ئەمەیش لیستێکە بەناوی ئەو پاشایانەی چاویان هەڵکۆڵرا:

1-دوای نادر شا، برازاکەی بەناوی عەلی قولی، بەناوی(عادیل شا) دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت،و دەسەڵاتەکەی تەنیا یەك ساڵ درێژەی کێشا، دواتر ئیبراهیمی برای لەسەر تەخت دایگرتو چاوی هەڵکۆڵی.

2-دەسەڵاتی ئیبراهیم تەنیا یەك ساڵی خایاند، دواتر هەوادارانی شا ڕوخ، کوڕەزای نادر شا، کوشتیان،و ئەم شا ڕوخە کوڕی رەزا قولی بوو، کەپێشتر باوکی چاوی هەڵکۆڵیبوو.

3-شا ڕوخ ماوەیەکی کەم لەسەر تەخت مایەوە، پیاوێك بەناوی میرزا سەید محەممەد-کوڕی سەرپەرشتیاری مەزاری رەزا بوو لەمەشهەد- راپەڕیو بەدیل گرتیو چاوی هەڵکۆڵی.

4-یوسف عەلی -یەکێك بوو لەسەرکردەکانی شا ڕوخ-دژی میرزا سەید محەممەد راپەڕیو بەدیل گرتیو چاوی خۆیو کوڕەکانی هەڵکۆڵی، دواتر هەموویانی کوشت.

5-میر عەلەم خانو جەعفەر خان کەدوو سەرکردەبوون، راپەڕین، یەکەمیان لەلایەن هۆزە عەرەبییەکان،و دووەمیان لەلایەن هۆزە کوردییەکانەوە پشتگیریی دەکران،و بەسەر یوسف عەلیدا سەرکەوتنو فرمانیان دا، چاوی هەڵکۆڵن.

6-ئەم دوو پیاوە، دوای ئەوەی سەرکەوتن، لەناو خۆیاندا تێکچوون، میرخان بەسەر جەعفەر خانی هاوڕێیدا سەرکەوت،و چاوی هەڵکۆڵی.

7-میر خان ماوەیەکی کەم لەسەر تەخت مایەوە، ئەحمەد خانی دورانیی پاشای ئەفغان پەلاماری دا،و کوشتی، بەبێ ئەوەی چاوی هەڵکۆڵێت.

8-ئەحمەد خانی دورانی لەخۆراسان دەوڵەتێکی بچووکی دامەزراند، بۆئەوەی ببێت بەبەربەستێك لەنێوان خۆیو ئێراندا،و شا ڕوخی چاو هەڵکۆڵراوی کوڕی چاو هەڵکۆڵراوی هێناو کردی بەپاشای ئەو دەوڵەتە. دەسەڵاتی شا ڕوخ ماوەی پەنجا ساڵ بەردەوام بوو، لەکاتێکدا ناوچەکانی دیکەی ئێران، بەمەبەستی دەست گرتن بەسەر تەختدا، لەشەڕو شۆڕدا بوو.



## کەریم خانو قاجارییەکان:

لەو ماوەیەدا، کەئاژاوە سەرانسەری ئێرانی گرتبووەوە-لەکاتی کوشتنی نادر شا لەساڵی1747 وە تادامەزراندنی دەوڵەتی قاجاری، لەساڵی 1796-تەنیا پیاوێك هەڵکەوت کەشایستەی پاشایەتی بوو، ئەویش کەریم خانی زەند بوو. ئەم پیاوە، لەسەرەتادا، سەربازێکی ئاسایی بوو، لەسوپای نادر شادا، دوای ئەوەی گەورەکەی کوژرا، وردە وردە بەرز بووەوە، تائەوەی لەساڵی 1750دا، توانی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆی لەشیرازدا دابمەزرێنێت،و لەماوەیەکی کورتدا، توانی کۆنترۆڵی سەرانسەری ئێران بکات، بەڵام نازناوی(شا)ی لەخۆی نەنا، بەڵکو حەزی دەکرد ناوی بیکار(وەکیل) لەخۆی بنێت ، بەوەی کەبریکاری شائیسماعیلی سەفەوییە، کە لەو کاتەدا دیل بوو.[197]

کەریم خان لەساڵی 1779دا، کۆچی دوایی کرد،و بەمردنی دووبارە ئاژاوە ئێرانی گرتەوە،و شەڕی نێوان مێمڵەکان، لەسەر تەخت بەردەوام بوو،و بارودۆخەکە ئاسایی نەبووەوە، تەنیا لەساڵی 1796 دا نەبێت، کە تارادەیك دوای ئەوەی ئاغا محەممەد خەسی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، بارودۆخەکە ئارام بووەوە، کەژن برای کەریم خان بوو، ئەوەیش لەسەرەتای دەسەڵاتی بنەماڵەی قاجارییەکان بوو، کەتا دوای شەڕی یەکەمی جیهان دەسەڵاتی ئێرانیان بەدەستەوە بوو.

197-Percy Sykes(op. cit.) vol. 2, p. 277-281.

## شەڕە قەڵەم:

لەچەند بۆنەیەکی داهاتوودا، دێینە سەر باسی دەوڵەتی قاجاری،و کاریگەریی لەعیراقدا، بەڵام دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم، کەئەم دەوڵەتە، هەمان شێوازی دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی گرتەبەر، لەرووی برەودان بەجنێودانو سرووتی ماتەمینیو ئەو جۆرە شتانە،و بەمەیش کێشەی مەزهەبی، دووبارە دەستی پێکرد، بەبێ ئەوەی ئەو هەوڵانەی نادر شا ئەنجامی دا، لەپێناوی نزیکبوونەوەدا، کاریگەریی هەبێت.

لەراستیدا، شەڕی نێوان هەردوو دەوڵەتی قاجاریو عوسمانی، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە، بەتەواوی وەستابوو–بەهۆی ئەو رێکەوتننامەیەوەو بەهۆی دیاری کردنی سنووری نێوانیان، بەشێوەیەکی جێگیر–بەڵام ئەوە کاریگەری نەبوو، لەسەر سووککردنی توندیی مشتومڕی مەزهەبی،و رەنگە زیاتر بووبێت، دوای ئەوەی لەساڵی 1833دا، چاپخانەی سەنگی هێنرایە ئێران،و دەستکرا بەچاپکردنی بابەتی مەزهەبی،و بەژمارەیەکی زۆر دەکەوتە بازاڕەوە،و هەزاران بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی تیادا بوو،و لەلایەن تاقمەکەی دیکەوە، بەهێنانەوەی هەزاران بەڵگەوە، وەڵام دەدرانەوە.

دەتوانین بەجۆرێکی دیکە بڵێین، کاتێ کاری شمشێر لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا پوچەڵ بووەوە، کاری قەڵەم هەر بەردەوام بوو، هەروەکو بڵێی قەڵەم شوێنی شمشێری گرتەوە، لەشەڕی نێوانیاندا، زانایانی هەردوولا،



دەستیان کرد بەنووسینی کتێب، لەپێناوی پشتگیری کردن لەبیروباوەڕی خۆیان،و پووچەڵ کردنەوەی بیروباوەڕی تاقمەکەی دیکە،و بەو مانایە کەشەڕ لەنێوانیاندا هەر بەردەوام بوو، بەڵام لەشەڕە شمشێرو تۆپەوە، بوو بەشەڕی بەڵگە هێنانەوەی عەقڵیو نەقڵی.

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی شەڕە شمشێر ئەوەبوو، شەڕ کۆتاییەکی یەکالا کەرەوەی دەبوو، چونکە لایەنێك بەسەر ئەوی دیکەدا سەردەکەوت،و تاقمی دۆڕاو چاری نەبوو، دەبوا دان بەشکستەکەیدا بهێنێت،و ملکەچی مەرجەکانی لایەنی سەرکەوتوو ببێت. بەڵام شەڕە قەڵەم ئەو دەرئەنجامەی نەدەبوو، چونکە مشتومڕ هەر بەردەوام دەبوو، بەبێ ئەوەی لایەنێك دان بەوەدا بنێت کەدۆڕاوە،و بۆهەتا هەتایە ئەو مشتومڕە، هەر بەردەوام دەبێت–هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

پێشتر ئاماژەمان بەسروشتی ئەو نەهامەتییە کرد کەتووشی کۆمەڵگەی عیراق بووەوە، بەهۆی شەڕوشۆڕی نێوان عەجەمو رۆمەوە، هەروەکو لەناو عیراقییەکاندا باوە، لەراستیدا ئەو نەهامەتییە تەنیا وێرانکردنی شارستانی نەدەگرتەوە، بەڵکو هزرەکانیشی تێکدا. مشتومڕی بێ کۆتایی، کەعیراقییەکان لەسەری راهاتوون، بەهۆی ئەو نەهامەتییەوە، وای کردووە کەپەرژینێك لەنێوانیانو لەنێوان واقیعی ژیاندا دروست ببێت. ئەوەی جێگەی داخە، ئەوەیە کەئەو شێوازی مشتومڕە هێشتا برەوی هەیە لەنێوان زۆربەیاندا–هیچ جیاوازیی نییە لەنێوان ئەوانەی هەڵگری رۆشنبیری نوێن یان کۆنن– رەنگە ئەوە یەکێك لەو هۆیانە بێت، کەبووە هۆی گەورەبوونی توندوتیژیی، لەمشتومڕی سیاسی لەناو عیراقییەکاندا.

# بەشی شەشەم

## سەردەمی مەمالیك لەعیراقدا

### قۆناغی یەكەم

سەردەمی مەمالیك بۆماوەی هەشتا ساڵ لەعیراقدا درێژەی كێشا، لەساڵی 1749بەدەسەڵاتی سولەیمان پاشا(ئەبو لەیلە) دەستی پێكرد،و لەساڵی 1831 بەلابردنی داود پاشا كۆتایی هات. لەرووی رەچەڵەكو بنچینەوە، مەمالیكی عیراق لەمەمالیكی میسر دەچوون، لەجۆرجیاوە هاتن،و هەندێكیان لەوڵاتی چەركەسو داغستانو ئەبازەو لازەوە هاتن، كەهەر هەمووی وڵاتی قەوقاسو دەوروبەری دەگرێتەوە. لەگەڵ خۆیاندا وەكو ئینكشارییەكان، منداڵیان دەهێنا،و دەیانخستنە قوتابخانەی تایبەت بەخۆیان، تاوەكو فێری خوێندنو نووسینو مەلەو سواریو هونەری شەڕ ببن،و كاتێ مەشقیان تەواو دەكرد، لەریزەكانی سوپا یان دامودەزگا حكومییەكاندا دادەمەزران.

والیی بەناوبانگ حەسەن پاشا یەكەمین كەس بوو، بایەخی بەهێنانی مەمالیك بۆعیراق دا، كەلەبەشێكی پێشوودا ئاماژەمان بۆكرد، ئەم والییە ویستی-دوای ئەوەی سیستمی ئینكشاری تووشی گەندەڵی



بوو–[198] سەربازی تایبەت بەخۆی دابنێت،و پشتییان پێ ببەستێتو ئەوانیش پشتی بگرن، بۆیە ناردی بۆقەوقاس بۆئەوەی ئەو منداڵانەی بۆبهێنن.

ئەو سەردەمە، بازاڕەكانی تەفلیس پڕبوو لەو منداڵانە بۆفرۆشتن،و بەرواڵەت فرۆشتنی ئەو منداڵانە دابونەریتی ئەو ناوچانەبوو. شایانی ئامـاژە بۆكردنـە، كەزۆربـەی ئـەو منداڵانـە خـەڵكی قـەوقاس بـوون، لەسەردەمانی پێشتردا هێنرابوون بۆتوركیاو میسرو شام،و هەندێكیان پۆستی بەرزیان بەدەست هێنا،و تەنانەت لەمیسردا، پۆستی پاشایشیان بەدەست هێنا.

حەسەن پاشا لەبەغدا، فەرمانگەیەكی تایبەتی دامەزراند بەناوی(ئیج دایرە سی)، واتە فەرمانگەی هاتووەكان،و ئەركی كڕینی مەمالیكو مەشق پێكردنیان بوو. كاتێ دواتر ئەحمەد پاشای كوڕی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، بەلێشاو مەمالیكی هێناو بایەخی پێدان،و تائەوەی بوون بەهێزێكی گەورە، بەجۆرێ توانییان دوای مردنی گەورەكەیان ئەحمەد پاشا، ویستی خۆیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا بسەپێننو یەكێك لەخۆیان-كە سولەیمان پاشا(ئەبو لەیلە)بوو-بكەن بەوالی عیراق.

---

[198] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(داوود باشا والی بغداد)–قاهیرە 1968–ل23.

## تێڕوانینێکی گشتی:

سەردەمی مەمالیك ئەگەرچی کورت بوو، بەڵام گرنگییەکی گەورەی هەبوو، لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، و من پێمواپە تاوتویٚ کردنی ئەم سەردەمە، وێنایەکی بەهادارمان پێدەبەخشێت لەسەر کۆمەڵگەی عیراق، بەشێوەیەکی گشتی، و کۆمەڵگەی بەغدادی بەتایبەتی.

جیاوازیی سەردەمی مەمالیك، لەگەڵ سەردەمەکانی پێش خۆیو دوای خۆی لەوەدابوو، کەمێملێیی لەسەر دەسەڵات لەعیراقدا توند بوو، و والییەکانی بەر لەسەردەمی مەمالیك، بەپێی فرمانی سوڵتان لەئەستەنبوڵەوە دادەمەزران، بەو مانایە ئەوەی منەی دەسەڵاتی لەعیراقدا بکردایە، دەبوا هەوڵی خۆی لەئەستەنبوڵ بخستایەتە گەڕ، بۆ ئەوەی ڕەزامەندیی سوڵتان یان کەسوکارەکەی بەدەست بهێنایە بۆئەو فرمانە، بەڵام لەسەردەمی مەمالیکدا، بارودۆخەکە گۆڕا، چونکە فرمانی سوڵتان کاریگەریی نەبوو لەدامەزراندنی والییەکاندا. هەندیٚ جار، بەهیچ شێوەیەك کاریگەریی نەبوو.

ئەوەی کاریگەریی زیاتری هەبوو، لەدامەزراندنی والییەکاندا، دەرئەنجامی ئەو کێشمەکێشانەبوو، لەنێوان خودی مەمالیکدا، هەر یەکێك لەمەمالیك دەیتوانی ببێت بەوالی بەغدا-یان وەزارەت، هەروەکو خۆیان



ناویان دەبرد- ئەگەر بیتوانیایە، بەهەر ڕێگەیەك بەسەر مێملەکانی خۆیدا زاڵ ببێت، و ئەگەر ئەوەی بۆبڕەخسایە، ئەوا گەورەپیاوانو زانایانی بەغدا، داواکارییەکیان بۆسوڵتان دەنووسی، و داوای ئەوەیان لێدەکرد، پۆستی وەزارەت، بەمەملووکی سەرکەوتوو ببەخشێت، و گەلیٚ جار سوڵتان ملی بەداواکارییەکەیان دەدا، و فرمانی پێویستی بۆدەردەکرد.

بەکورتی، چەقی قورسایی لەدامەزراندنی والییەکاندا، لەئەستەنبوڵەوە گوێزرایەوە بۆبەغدا، و نابیٚ ئەوەیش فەرامۆش بکەین، کەگەورەپیاوانو زانایانی بەغدا، هیچ کاریگەرییەکیان نەبوو، لەو دامەزراندنانەدا. ئەوان کاتیٚ کۆدەبوونەوە، کەداوایان لێدەکرا، و ئەوان ئامادەبوون هەر داواکارییەك ئیمزا بکەن، کەمەملووکی باڵادەست بیخستایەتە بەردەستیان، ئەوان لەدوعای خێرو ستایشکردنیان، بەولاوە شتێکی دیکە بەزاریاندا نەدەهات. و ئەمەیش لەتێڕوانینیاندا، مایەوە تاماوەیەکی زۆر، و تائێستایش هەندێکیان، تائەم سەعاتەیش، لەسەر هەمان بۆچوونن.

## شەڕە گەڕەك:

ئەو شێوازەی ئاماژەمان پێكرد، لەدامەزراندنی والییەكاندا، دەرئەنجامێكی كۆمەڵایەتی لێكەوتەوە، كەسەرنج راكێش بوو، ئەویش تەشەنەكردنی شەڕە گەڕەك بوو لەبەغدادا، و لەسەردەمی مەمالیكدا، بووبوو بەباو، كەئەگەر شەڕ لەنێوان دوو تاقمیاندا بەرپا ببوایە، لەسەر دەسەڵات، كاردانەوەكەی دەكەوتە ناو دانیشتوانی بەغدا، هەر تاقمەو پەنای دەبردە بەر دۆستەكانی خۆی، لەسەرۆكی گەڕەكەكان وشەقاوەكانیان، و ئەوانیش خەڵكی گەڕەكیان بانگ دەكرد، و گەڕەك بەچەكەوە ئامادەی شەڕ دەبوون، لەگەڵ ئەو تاقمەی پەنای بۆدەهێنا، و بەمەیش مەیدانەكانی بەغداو كۆڵانەكانی دەبوون بەگۆڕەپانی شەڕو جەنگاوەرانی گەڕەك تەراتێنیان دەكرد، و پەلاماری دوژمنەكانیان دەدا، لەجەنگاوەرانی گەڕەكە دوژمنەكان، و ژنان هەلهەلەیان دەكێشا، بۆئەوەی تاقمەكەی خۆیان هان بدەن، بەمەیش زیاتر ورەیان بەرز دەبووەوە.

یەكێك لەتایبەتمەندییەكانی مەمالیك ئەوەبوو، هەر لەمنداڵییەوە لەبەغدادا گەورە دەبوون و بەمەیش پەیوەندیی پاك و ناپاكیان لەگەڵ دانیشتوانی بەغدا هەبوو، و بەمەیش جیاوازییان هەبوو، لەگەڵ ئەو والی و گەورە فەرمانبەرانەی لەئەستەنبوڵەوە رەوانەی بەغدا دەكران، لەسەردەمانی پێشووو پاشتردا. مەمالیك خۆیان بە(بەغادە)بەغدادی دادەنا و ماڵەكانیان لەناو گەڕەكە جۆراوجۆرەكاندا، پەرش و بڵاو بوو، و پشتگیرییان لەگەڕەكەكانی خۆیان دەكرد–هەریەكە لەگەڕەكی تایبەت



بەخۆی–ئەگەر یەكێكیان شەڕی بكردایە، دەرودراوسێكان و كوڕانی گەڕەك دەچوون بەهانایەوە، و دوژمنەكەیشی هەمان كاری دەكرد، و پەنای بەدانیشتوانی گەڕەكەكەی دەبرد. و گەلێ جار شەڕەكە توندتر دەبوو، كەگەڕەكەكانی بەغدا، دەبوون بەدوو بەشەوە، و شەڕیان دەكردو خوێنی تیادا دەڕژا، هەروەكو بڵێی دوو سوپای دوژمن بەیەكدی بن.

## مەمالیك و لادانی سێكسی:

دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیی دیكە هەیە، دەتوانین هۆكەی بگێڕینەوە بۆكاریگەریی سەردەمی مەمالیك، ئەویش دیاردەی تەشەنە كردنی لادانی سێكسی بوو لەعیراقدا.[199] كاتێ مەمالیك بۆبەغدا دەهێنران منداڵ بوون، و دواتر دەخرانە بەر خوێندن لەقوتابخانە تایبەتەكاندا، و لەناوخۆیاندا، خەریكی نێربازی دەبوون، یان مامۆستاكانیان ئەو كارەیان لەگەڵدا دەكردن. لەراستیدا ئەو قوتابخانانە، لەرووی رەوشتەوە، پاك نەبوون، و والییەكانیش گوێیان بەوە نەدەدا، مادامێك فەرمانبەری لێهاتووو سەركردەی جەنگاوەری بۆبەرهەم دەهێنان.

جگە لەوەی ئەو منداڵە هێنراوانە، گەلێ جار تێكەڵی خەڵكی بەغدا دەبوون، و دەكەوتنە ژێر كاریگەریی فریودانەوە، كاتێ تێكەڵ بەهەندێ كەسی بەدرەوشت دەبوون. دەبێ ئەوە فەرامۆش نەكەین كەئەوان،

[199] لەم رووەوە، بڕوانە كتێبی(دراسة في طبيعة المجتمع العراقي)ی نووسەر–بەغدا1965–لاپەڕە322–326.

زۆربەیان جوانو سپیکەلە بوون، و ئەمەیش وایدەکرد، زیاتر لەلایەن کەسانی دیکەوە فریو بدرێن. و باوکیان نەبوو، تاوەکو چاودێرییان بکەن، و ئاگاداریی رەوشتیان بن، بۆیە ، بەبێ ئەوەی شەرم بکەن دەکەوتنە داوی لادانەوە.

کاتێ یەکێکیان پۆستێکی گەورەی لەحکومەتدا وەردەگرت، دەبوو بەباسوخواسی خەڵکیو مایەی سەرسووڕمانیان. ناشیرینترین عەیبە لەناو کۆمەڵگەی عیراقدا، ئەوەیە کەسێك حیز بێت، یان ئەوەی بەمنداڵی گانی دابێت، وخەڵکی بەچاوشکاوی دادەنێن، چونکە ناتوانێت بەباشی تەماشای خەڵکی بکات، و ئەوانیش گاڵتەی پێدەکەنو کاتێ وەها کەسێك پۆستێکی گەورەی لەحکومەتدا پێدەبەخشرێت، ناوو ناتۆرەی لێدەنێن. پێموایە ئەمە سەرچاوەی ئەو بیرۆکەیەیە کەلەناو شوێنە میللییەکانی بەغدادا بڵاو بووەوە–و تائەم دواییەیش هەر برەوی هەبوو–ئەویش ئەوەبوو، کەسێ حیز نەبوایە، پۆستی بەرزی پێنەدەدرا. رەنگە راڤەکردنی ئەو بارە، لەوەوە هاتبێت کەپیاوێکی بەدکار منداڵێکی مەمالیکی گاوە، و دواتر ئەو منداڵە کەگەورە دەبێت، پۆستێکی گەورە لەپۆستە حکومییەکان وەردەگرێت، و رەنگە ئەوە بۆکەسی دیکەیش پێش هاتبێت، و لەناو خەڵکیدا بڵاو بۆتەوەو بووە بەرێسایەکی گشتی بەلایانەوە. ئەوە سروشتی خەڵکی رەشۆکە، کەرووداوێك یان چەند رووداوێك دەکەن بەرێسا.



## سولە یمان( ئەبو لەیلە ):

سولەیمان پاشا(ئەبو لەیلە) یەکەم کەس بوو لەمەمالیك کەدەسەڵاتی لەعیراقدا، بەدەستەوە گرت، هەروەکو پێشتر ئامارژەمان بۆکرد، بەهۆی شەڕو ئاژاوەیەکەوە دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، کەئینکشاریەکان بەرپایان کرد، لەبەغداو سەرایان تۆپباران کرد، و ئاژاوەکە سێ رۆژی خایاند، ئەمە وای لەو والییە کرد کەدەوڵەت دایناو، بەمەبەستی رزگار بوون لەبەغدا هەڵبێت، دەوڵەتیش ناچار بوون لەشوێنی ئەودا، ئەبو لەیلە بکات بەوالی.

دەسەڵاتی ئەبو لەیلە، نزیکەی سیانزە ساڵی خایاند، بۆیە بەوە ناوی دەرکرد، لەبەر ئەوەی شەوان خۆی دەگۆڕیو دەهاتە دەرەوە، و گەلێ توند بوو لەگەڵ ئاژاوەگێڕاندا، بەتایبەتی لەگەڵ هۆزە یاخییەکاندا، و گوێی بەهیچ شتێك نەدەدا، بۆلێدانی یاخی بووان،جگە لە(ئەبو لەیلە) چەندین نازناوی دیکەیان لێ نا، پێیان دەگوت(ئەبو سەمرە)و (شەو نخوون)و (شێر سلێمان).[200] کە ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت، گەلێ بەلایانەوە سەرنج راکێش بووە. پیاوێکی بەهێز بوو، کەئەوەیش، وەکو شاراوە نییە، بەلای کۆمەڵگەی عیراقەوە، لەسەرووی هەموو شانازییەکەوەیە.

[200] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)–وەرگێڕانی جەعفەر خەیات–بەغدا 1962–ل 165.

ئـەوەی سـەرنج راكێشـە لـەم والییـە بـەهێزەدا، ئەوەیـە ئەگەرچـی لەپەیوەنـدیی لەگـەڵ خـەڵك لـەدەرەوەی ماڵەكەیـدا، پیـاوێكی چاونەترس‌و ئازا بوو، بەڵام لەماڵـەوە گـەلێ بێ دەسـەڵات بـوو، و هاوسـەرەكەی عادیلـە خاتوون– كەكچی سەروەرە پێشووەكەی بوو–بەتەواوی زاڵ بوو بەسەریدا. گەڕیـدەی ئـەڵمانی نیبـور ئـەم ژنـە بـەم جـۆرە وەسـف دەكـات، سـەبارەت بـەزاڵبوونی بەسـەر مێردەكەیـدا: ئـەوەی فـەرامۆش نـەكردبوو، كەلەتەمـەنی لاویـدا، پیـاوی بـاوكی بـوو، و گـەلێ لـەخۆبایی بـوو، و بایـەخی بەدەسـەڵات دەدا، چـەند رۆژێكـی دەسـت نیشـان كردبـوو، تاخـەڵكی سـەردانی بكـەن، بەمەبەسـتی كێشـەكانیان، و لەژوورێكدا دادەنیشـت‌و سـەرۆكی پاسـەوانان دەهات‌و داواكارییەكانی دەخستە بـەردەمی، و ئـەویش تەماشـای دەكردن‌و وەڵامـی دەدانـەوە، و گـەلێ جـار ئـەو فرمانانـەی پووچـەڵ دەكـردەوە كەمێردەكـەی دەریـدەكردن. دەستەسـرێكی ئاوریشـمی تایبـەتی هـەبوو، بۆجیاكردنەوەی هەوادارانی باوكی، ئەوانەی لەسەردەمی باوكی‌و باپیریدا، خزمـەتیان كردبـوو، و ئـەو دەستەسـرەیان دەبەسـت بەسـەریانەوە لـەكاتی بۆنەكانـدا، بۆئـەوەی لەفەرمانبـەرەكانی دیكـە جیابكرێنـەوە، و وای لێهـات هەركەسێ بیویستایە، ئەو دەستەسرەی پێ ببەخشرێت، دەبوا برێ پـارە وەكو دیاری پێشكەش بەعادیلە خاتوون بكات.[201]

[201] كارستن نیبور(رحلة نیبور الى بغداد)–وەرگێڕانی سوعاد عومەری–بەغدا 1954–ل 46–47.



هەرچۆنێك بێت، نۆرێنی مەمالیك لەسەردەمی ئەبو لەیلەدا، گەیشتە ئەوپـەڕی، و بەلێشـاو ئـەو كوڕانـەی لـەبازاڕەكانی تەفلیسـدا دەكـڕدران، دەگەیشـتنە بەغـدا، و قوتابخانەیـەكیان بۆكرایـەوە، دووسـەد كەسـی دەگرت، و ئـەبو لەیلـە بـەزۆری لەفەرمانگـە حكومییەكانـدا دایانیدەمەزراند، بەنووسـەرو بـاجگرو سـەركردەی پاسـەوانان، و گـەورە دەربـارانیش هـەر لـەوان بـوون، ئەمـەیش بـووە هـۆی ئـەوەی خێزانـە تـوركی‌و بەغدادییـە بەناوبانگـەكان، لەبڕەبەشـی خۆیـان بـێ بـەریی بـبن، كـە پێشـتر لەسـەری راهاتبوون، لەدامودەزگا حكومییەكاندا. هەر منداڵێك لەوانـە هـەر ئەوەنـدە، لـەو قوتابخانەیـە دەربچـوایە، ئـیتر بـواری بۆدەڕەخسـا تالەفەرمانگـە حكومییەكانـدا، دەسـت بـەكار ببێـت، و پلـەی بـەرز دەبـووەوە تـا دەگەیشـتە بـەرزترین پۆسـت. بـەڵام تـاكی بەغـدادی، بـەهیچ شـێوەیەك رێگـەی پـێ نەدەدرا، وەكو فەرمانبەر كار بكات.[202]

[202] ستیڤن هیمسلی لۆنكریك(سەرچاوەی پێشوو) ل166. هەروەها بڕوانە:ریچارد كۆك(بغداد مدینة السلام)–وەرگێڕانی فوئاد جەمیل‌و مستەفا جواد–بەغدا 1967–ب2 ل89.

## عەلی و عومەر:

لەساڵی 1761 دا، سولەیمان پاشا(ئەبو لەیلە) تووشی نەخۆشی بوو، شەش مانگ بەدەستییەوە تلایەوە، تادواتر کوشتی، و مردنەکەی سەرەتای ماوەیەکی دوورو درێژ لەئاژاوەگێڕیی بوو.

دوای مردنی سولەیمان پاشا، حەوت پیاو پاڵێوراوی جێنشینی بوون، پێیان دەگوتن(أصحاب الداعیة) و هەموویان لەمەمالیك بوون، و هەر یەکێکیان هەستی بەوە دەکرد، کەئەو لەپێشترە، بۆئەوەی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، و مێملێی نێوانیان بوو بەمایەی شەڕو بەغدایش بەبێ والی مایەوە، و ترس و دڵەڕاوکێ خەڵکەکەی گرتەوە، و زانایان و پیاوماقووڵان بەمەبەستی هێورکردنەوەی دۆخەکە، دەست بەکاربوون.[203]

لەکۆتاییدا، لەسەر ئەوە ریککەوتن، ناوی پاڵێوراوان رەوانەی ئەستەنبوڵ بکەن، تاوەکو سوڵتان یەکێکیان بەوالی دەستنیشان بکات. کاتێ وەڵامەکە لەئەستەنبوڵ هاتەوە، بینییان کەسوڵتان عەلی پاشای دەست نیشان کردووە، کەلەو کاتەدا والی بەسرە بوو، و هێشتا نەگەیشتبووە بەغدا، کەوتنە ئەوەی پیلانی بۆبنێنەوە،بۆئەوەی بیکوژن و لەدەستی رزگاریان ببێت.

دەسەڵاتی عەلی پاشا، ماوەی دووساڵ درێژەی کێشا، و لەوماوەیەدا سەرقاڵی شەڕوشۆڕ لەگەڵ هۆزەکاندا بوو، لەباکوورو

[203] عەبباس عەزاوی(تاریخ العراق بین احتلالین) –بەغدا 1954–ب6 ل32.



باشووردا، و دوژمنەکانی ویستیان لەکاتی گەڕانەوەی لەشەڕی هۆزی کەعەب، نزیکی دۆرە بیکوژن، بەڵام رزگاری بوو لەدەستیان.

عەلی پاشا بەرەچەڵەك ئێرانی بوو، و وەکو مەمالیکەکانی دیکە، بەرەچەڵەك قەوقاسی نەبوو، و نەیارەکانی ئەوەیان کرد بەپاساو، و ئەوەیان بۆهەڵبەست کە شیعەیە و توند بوو لەگەڵ هۆزە کوردییە سوننییەکاندا، و لەگەڵ خەزعەلەکاندا نەرم و نیان بوو، کەئەوان شیعەبوون.[204]

ئەو پروپاگەندانە لەدژی ، لەناو بەغدادا بڵاو بووەوە، دوو کەس بەو کارە هەڵدەستان: یەکێکیان عادیلە خاتوونی بێوەژنی وەزیری پێشوو، و عومەر پاشای مێردی خوشکەکەی، کەیەکێك بوو لەحەوت پاڵێوراوەکە.

رۆژێکیان پیلانگێڕان لەساڵی 1763دا ، بەسەرۆکایەتیی عومەر پاشا کۆبوونەوە، و شۆڕشیان بەرپا کرد لەبەغداداو خەڵکی گەڕەکەکانیش دوایان کەوتن، و قەڵایان داگیر کردو سەرایان تۆپباران کرد، و سەنگەریان لەسەر رێگاکانی بەغدادا دامەزراند، تاوایلێهات شار بوو بەرۆژی حەشر.[205] عەلی پاشا ناچار بوو لەسەرا رابکات، بەجلی ژنانەوە، و پەنای بباتە بەر یەکێك لەماڵە دراوسێکان، بەڵام خاوەن ماڵەکە دابونەریتی پێشێل کردو ئاگاداری کردنەوە، و هاتن لەماڵەکە دەریانهێنا و دواتر کوشتییان.

دوابەدوای ئەوە، پیاوماقووڵانی بەغدا کۆبوونەوە، و داواکارییەکیان نووسی، و تیایدا هاتبوو: عەلی پاشا خیانەتی لەدەوڵەت کردووە، و ویستوویەتی عیراق بدات بەدەستی ئێرانەوە، و ئەوان چیتر نەیانتوانی ئەو خیانەتە گەورەیە پەسەند بکەن، و رێوشوێنی بنجبڕیان لەدژی گرتەبەر، بەبێ ئەوەی دەوڵەت ئاگادار بکەنەوە، نەکا دەرفەتەکە لەدەست بدەن، و

[204] ستیفن هیمسلی لۆنگریك(سەرچاوەی پێشوو) ل169–170.
[205] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل37.

ئێستا داوا لەسوڵتان دەکەن، عومەر پاشا بکات بەوالی، چونکە متمانەی تەواویان بەو هەیە، و دڵسۆزی دەوڵەتە.

دواتر فرمان لەئەستەنبوڵەوە هات، بەپێی خواستی زانایانو پیاو ماقوولان، و بەغدا ئاهەنگی گێڕا، بەبۆنەی دانانی عومەر پاشا بەوالی بەغدا، شێخ عەبدورەحمان سویدی بەهۆنراوەیەك ستایشی کرد، کەهەر نیوە دێڕێکی مێژوویەکی لەخۆ گرتبوو، هەروەها سولەیمان شاوی بەهۆنراوەیەك ستایشی کرد، کەدوا نیو دێڕی مێژوویەکی لەخۆگرتبوو، کەئەمەیە:(وقمت بالعدل والاحسان یاعمر).[206] لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، کەمحییەدین کوڕی عەرەبی- قوتبی بەناوبانگی سۆفیگەری- پێشتر پێشبینیی ئەو ڕووداوەی کردبوو، کەلە(الشجرة النعمانیة)دا دەڵێت:(لك سرّ واظهار، وصحو وخمار... علی خلاف العادة یصیر...)، لێرەدا وشەی (صحو) ئاماژەیە بەناوی عەلی پاشا، چونکە ژمارەکەی لەحیسابی پیتەکاندا، یەکسانە بەژمارەی(عەلی)، و هەروەها وشەی(یصیر) ئاماژەیە بۆناوی عومەر پاشا.[207]

[206] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی 6 لاپەڕە 39.

[207] یاسین عومەری(الدار المکنون)-کەفوئاد جەمیلو مستەفا جواد لەپەراوێزی کتێبەکەی ریچارد کۆك(هەمان سەرچاوەی پێشوو) بەرگی 2 لاپەڕە43-94 هێناویەتییەوە.



## شۆڕشی خێڵەکان:

عومەر پاشا هێرشی دەست پێکرد بۆسەر حەموود ئەلحەمەدی شێخی خەزاعیل، لەفوراتی ناوەڕاستدا، و ئەم شێخە هێندە گەورەببوو، کەیەکێتیی خێڵەکانی ژێر دەستی وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆی لێهاتبوو، بڕو بکوژ خۆی بوو. عومەر پاشا بەسەرکردایەتیی لەشکرێکی گەورە ڕووی لەگوندی لەملووم کرد، و دوای چەندین گرفت، هێزەکانی توانییان دزە بکەنە ناو ریزەکانی خێڵە راپەڕیوەکانەوە، و دەست بگرن بەسەر سەنگەرو بەربەستو دیوارەکاندا، و ئەوسا شەڕێکی قورس بۆماوەی زیاتر لەسێ سەعات بەردەوام بوو، عومەر پاشا تیایدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، و دەستی گرت بەسەر خێوەتەکان، و سامانیاندا، و زۆری لێ کوشتنو زۆریشی بەدیل گرت، دواتر سوپاسی خودای کرد، بۆئەو سەرکەوتنە کەپێی بەخشی.[208] وکاتێ عومەر پاشا گەڕایەوە بۆبەغدا، شاعیران بەهۆنراوە ستایشیان کرد، دوان لەو هۆنراوانە لەلایەن سولەیمان بەگ شاوییەوە خوێندرایەوە.[209]

ڕۆژنامەنووس رەسووڵ کەرکووکلی دەڵێت:(دوای ئەو هێرشە سەرکەوتووەی کەعومەر پاشا کردییە سەر شێخی خەزاعیل، و پێگەی

[208] رەسووڵ کەرکووکلی(دوحة الوزراء)وەرگێڕانی موسا کازم نەورەس-بەیرووت-ل140.

[209] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل40.

بەرزبووەوەو گەورەو بچووك لێی ترسان، و هۆزو خێڵەكان ملیان بەفرمانی دا، و دووركەوتنـەوە لـەیاخیبوونو هەڵگەڕانـەوە، و بارودۆخەكـە ئـارامی بـەخۆوە بـینی، و ئاسـایی بـووەوە، لەسـاڵی حـەفتاو هەشـتەوە تـاوەكو هەشتاو دوو، بەڵام لـەم ساڵەدا–واتـە ساڵی هـەزارو سـەدو هەشتاودووی كۆچـی–شـێخی هۆزەكـانی مونتـەفیقو شـێخ عەبـدوڵڵا لـەژێربار هاتنـە دەرەوەو یاخیبوونیـان راگەیانـد، و ملكەچـی فرمـانی دامودەزگاكـانی دەوڵـەت نـەبوون، و دەسـتی كـرد بەپـەلاماردانی ناوچـەكانی دەوروبـەری بەسـرە، و شـەڕو ئـاژاوەی بـۆ حـاجی سـولەیمانی فەرمانـداری بەسـرە دەنایـەوە، و پەنـدو ئامۆژگـاری لەگەڵیـدا سـوودی نـەبوو، و هەوڵـەكانی عەبـدوڵڵا شـاوی بۆرێكخسـتنیان بـێ سـوود بـوو، كەهەسـتا بەرێكخسـتنی كۆبوونەوەیـەك لـەنێوان ئـەوو بەرێوەبـەری بەسـرەدا، لەشارۆچـكەی زوبێـر، بەمەبەستی ئاسایی كردنەوەی ئەو دۆخـە ئاڵۆزەی نێوانیـان...وەزیـر زانـی بەهێز نەبێت نیارەكە چارەسەر ناكرێت، بۆیە بەسوپایەكی گـەورەوە رووی لەبەسـرە كـرد، و كـاتێ لـەو شـوێنە نزیـك بـووەوە، لەشـوێنێك بـەناوی(أم الحنطـة) لـەدووری دوانـزە سـەعات رێـوە لەبەسـرە، خێوەتیـان لێـدا، هـەر ئەوەنـدەی هـەواڵی هـاتنی بەشـێخی یـاخی گەیشـت، شـڵەژاو تـرسو دڵـەڕاوكێ دایگرت، و لەبەر ئەوەی توانـای بـەرگریكردنی نـەبوو، هـەڵهاتو خۆیو خێڵەكانی هەواداری، پێچایانەوەو ئەو ناوەیان بەجێهێشت).[210]

دوای سەركەوتنی عومەر پاشا بەسەر شێخی مونتەفیقدا، فرمانی دا عەبدوڵڵا بەگ شاوی بكوژن، چونكە بۆی روون بووەوە، كە بەخیانەتـەوە

[210] رەسووڵ كەركووكلی(سەرچاوەی پێشوو) ل141.



كەوتبووە نێوانەوە، و شاوییان هێنا بۆ(أم الحنطة)و لەوێدا لەسێدارە درا. كاتێ هەواڵی كوشتنی شاوی بەخێڵە گەورەكەی–عوبێد– گەیشت، یاخی بـوون لەحكومـەت، و لەناوچـەی دوجـەیل لـەباكووری بەغـدادا ، بەسەرۆكایەتیی سولەیمان بەگی شاوی كۆبوونەوە، و سولتان بەگی برای، كەهەردووكیان كوڕی شاوی بوون، و رێگەیان بەكاروان دەگرت.

هـەر كەهـەواڵی ئـەم شۆڕشـە خێڵەكایەتییـە بەعومـەر پاشا گەیشت لە(أم الحنطة)، خێرا هێزەكانی نارد بۆبەغدا، بەهەشت رۆژ پێی گەیشت، لەكاتێكـدا ئـەو مەودایـەی ئـەو بـڕی، دەبـوا بیسـت رۆژ بخایـەنێت. عومـەر پاشا لەبەغدادا نەحەوایەوە، بەڵكولەشوێنێك لەناوچەی(المنطقة) لەنێوان كازمییـەو بەغدا خێوەتی هەڵدا، و لـەوێوە فرمانی بەسوارەكانی دا خێرا، جڵەوی ئەسپەكانیان توند بكەن بەرەو دوجەیل، هەر بەشەو لەپڕ، دایان بەسـەر هـۆزی عوبێـددا، و بینییـان كەسـەرباز چـواردەورییانی گرتـووە، و بەترسێكی زۆرەوە هەڵهاتن، وسولتان بەگ شاوی بەدیل گیرا، و پـەلكێش كرا بۆلای عومەر پاشا، بەڵام خۆكوژی هەڵبـژاردو لەداخدا، خەنجەرەكـەی كرد بەسینگی خۆیدا.[211]

[211] سەرچاوەی پێشوو، ل142.

## تێکچوونی دۆخەکە:

لەساڵی 1772وە، دۆخەکە لەعومەر پاشا تێکچوو، ئەوەبوو تاعوون لەبەغدادا بڵاو بوەوەو سەرانسەری عیراقی گرتەوە. ئەم تاعوونە لەئەستەنبوڵەوە هاتو دواتر بەرەو باشوور تەشەنەی کرد، و هەزاران کەسی لەناو برد، و هەروەکو بڵێی دروێنەی دەکردن. دەگێڕنەوە، کەلەیەکەم رۆژیدا، لەبەغدا حەفتا هەزار کەسی لەناوبرد، دواتر ژمارەی مردووەکان، رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبوو. بۆماوەی شەش مانگ درێژەی کێشا.

دەوڵەمەندەکان لەدانیشتوانی شارەکان–بەتایبەتی لەبەغدادا–ماڵەکانی خۆیان بەجێدەهێشتو لەگوندە دوورەکاندا، دەواریان هەڵدەدا، هەر وەکو باوبوو لەناویاندا، کاتێ ئەو جۆرە نەخۆشییانە بڵاودەبوونەوە، و سەرەتا عومەر پاشا تانەی لێدەدان، بەڵام دواجار ئەویش ناچار بوو، ئەو کارەی ئەوان ئەنجام بدات، و خێزانەکەی برد بۆشوێنێکی نزیک لەئەعزەمییەو لەوێدا دەواریان هەڵدا، تا نەخۆشییەکە کزبوو.

خێڵەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستەوەو دایان بەسەر بەغدادا، و تاڵانیان کردو وێرانکارییان تیادا ئەنجام دا. خێڵەکان دوای رەوینەوەی نەخۆشییەکە، زیاتر گوڕیان گرت، چونکە پیاوانی میریو سەربازەکانی هێندە نەبوون کەبتوانن کۆنترۆڵی دۆخەکە بکەن، بۆیە ئەو دەرفەتە بەهادارەیان قۆستەوە، لەسەر شێوازی(پشیلە لەماڵ نییە، مشکان تیلیلییانە).

هێشتا خەڵکەکە لەمەترسیی تاعوون نەحەوابوونەوە، تائاژاوە لەکوردستان، لەناو بنەماڵەی باباندا دەستی پێکرد، و محەممەد پاشا بابان



پەنای بردە بەر کەریم خانی زەند لەئێران، بۆئەوەی داڵدەی بدات، و کەریم خان هێزی سەربازیو پارەو تفاقی پێدا، و محەممەد پاشا لەئێران گەڕایەوە، بەسەرکردایەتیی هێزێکی گەورەوە، و شەڕێکی قورس لەنێوان هێزەکانی ئەوو هێزەکانی عومەر پاشا رووی دا، و تیایدا شکێنراو ئەوهێزە ئێرانییەی لەگەڵیدابوو، هەزاران کوشتەو بریندارو دیلیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت.[212]

## کێشمەکێش لەئێراندا:

شکستی محەممەد پاشای بابانو ئەو زیانە گەورەیەی لەهێزەکانی ئێران کەوت، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر کەریم خانی زەند هەبوو، گەلێ بەداخەوە، هەواڵی ئەو شکستەی پێگەیشت، و بڕیاری دا تاسەرکەوتن، لەگەڵ حکومەتی بەغدادا درێژە بەشەڕ بدات. ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەستتر کرد ئەوەبوو کەعومەر پاشا دەستدرێژی کردە سەر سامانی ئەوئێرانییانەی بەهۆی تاعوونەکەوە، لەبەسرەو بەغداو مەزارە پیرۆزەکاندا مردن، لەبەسرەو بەغدا زیاتر لەحەوت سەد خێزانی ئێرانی هەموویان بەهۆی تاعوونەکەوە مردن، و عومەر پاشا دەستی گرت بەسەر هەموو سامانەکانیاندا.[213] و دەگێڕنەوە کۆمەڵێ لەدانیشتوانی کازمییەی فەلاقە کرد، کەبووە هۆی ئەوەی یەکێکیان بمرێت.[214]

---

[212] ئەحمەد عەلی سۆفی(المماليك في العراق)–مووسڵ1952–ل23–25.

[213] سەرچاوەی پێشوو، ل31.

[214] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل52.

لەساڵی 1775دا، کەریم خان سوپایەکی گەورەی، بەسەرکردایەتی سادق خانی برای ڕەوانەی بەسرە کردو ئەو شارەی گەمارۆ دا. ئەو گەمارۆیە، ماوەی سیانزە مانگی خایاند، خەڵکی بەسرە بەدەستییەوە ناڵاندیان، و قاتو قڕی بڵاو بووەوە، تەنانەت ناچار بوون گۆشتی پشیلەو سەگ بخۆن. وارێکەوت کەلەو سەردەمەدا، پیاوێکی خانەدانی ئێرانی بەناوی سەید نیعمەتوڵڵای شوشتەری، لەبەسرەدا بوو، و داوای لەسادق خان کرد بەسرە بدات بەدەستەوە، بەپێی چەند مەرجێك کەلەسەری ڕێککەوتن، و بەو جۆرە سوپای ئێران شارەکەیان داگیر کرد.

وتەی مێژوونووسان، سەبارەت بەمامەڵەی سادق خان، لەگەڵ خەڵکی بەرلەکاتی داگیرکردنیدا جۆراوجۆرە. سێر بیرسی سایکسی مێژوونووسی بەریتانی ئاماژە بەوە دەکات کەدادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون،[215] لۆنکریکیش تارادەیەك پشتگیریی لەم بۆچوونە دەکاتو دەڵێت: ئێرانییەکان ڕێکوپێك هاتنە ناو بەسرەوە، و ڕێگەیان بەکاری توندوتیژی، یان ئاژاوەگێڕی نەدا، بەڵام هەندێ ڕووداوی بچووك نەبێت، کەڕوویان دا. بەڵام لۆنکریك ئەوەیش دەڵێت کەدواتر بەدبەختی ئەو شارەی گرتەوە، کاتێ باجی لەخەڵکی کۆکردەوە، و دەوڵەمەندەکان بەکۆکردنەوەی پابەند بوون، و بەڵام هەژارەکان بوون کەپارەیان دەدا، بەوەیش ستەمکاریو گەندەڵی بڵاوبوەوەو دۆخەکەیان شێواند.[216]

بەڵام مێژوونووسی خەڵکی بەسرە ئیبن سەنەد درێژدادڕی دەکات لەگێڕانەوەی ئەو ستەمکارییانەی سادق خان دەرحەق بەخەڵکی بەسرە کردی، و لەم بارەوە دەڵێت:(...لەگەڵ سەربازەکانیدا، هەڵیکوتایە سەر

215-Percy Sykes(A History of Persia)-London 1958-Vol. 2, p.281.

216 ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو)ل189.



بەسرەو سووکایەتی پێکرد، و گوناه نەما نەیکا، و هەموو ئەوبەڵێنانەی خۆی پێشێل کرد، و ستەم نەما ئەنجامی نەدا، کاری وەهای کرد تەتارەکان نەیانکردبوو، و داوای لەخەڵکی کرد جنێو بەجێنشینان بدەن، بەئاشکراو لەمزگەوتەکاندا، بەتایبەتی بەئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عایشە، و لەنوێژدا(حي على خير العمل)ی زیاد کرد...).[217]

## کوشتنی عومەر پاشا:

کاتێ هەواڵی گەمارۆدانی بەسرە گەیشتە ئەستەنبوڵ-سەرەتا-بەرپرسان لەوێ گومانی ئەوەیان کرد کەعومەر پاشا هۆکاری هەرە گەورەی ئەم کێشەیەبووە لەگەڵ ئێرانییەکاندا، و لابردنی دەبێتە هۆی گەڕاندنەوەی ئاشتیی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە، بەڵام ئەوەیان دەزانی کەلابردنی کارێکی ئاسان نییە، چونکە ڕەنگە لەدەوڵەت یاخی ببێتو هەوادارانی لەمەمالیك یان خەڵکانی دیکە دوای بکەون، کەزۆرن.

لەساڵی 1776دا، بەرودوو، سێ فەرماندە گەیشتنە بەغدا، و هەریەکەیان سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بوو: ئۆزۆن عەبدوڵڵا پاشای والی دیار بەکر، و مستەفا پاشا ئەسپیناخچی والی ڕەققە، و سولەیمان پاشا جەلیلی والی موسڵ، مەبەست لەهاتنیان لابردنی عومەر پاشا بوو، بەڵام

217 عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(مطالع السعود بطيب أخبار الوالي داوود)-کورتکردنەوزەی ئەمین حەلوانی-قاهیرە1371ه-ل11.

واخۆیان پیشان دەدا، کەهاتوون یارمەتیی بدەن لەشەڕکردن لەگەڵ عەجەمدا، و گزییەکەیان سەری گرت، تەنانەت داوای لێکردن، بەمەبەستی لابردنی گەمارۆی سەری، بچن بۆبەسرە.[218]

ویلایەتی بەغدا بەمستەفا پاشا ئەسپیناخی سپێردرابوو، و دەسەڵاتی ئەوەشی پێدرابوو عومەر پاشا بکوژێت، ئەگەر ئامادە نەبوو ئەو پۆستەی بداتێ. کاتێ هەردووکیان کۆبوونەوە، و عومەر پاشا لە نیاری لابردنی ئاگادار بوو، ملی پێدا، و هیچ نارەزامەندی دەرنەبڕی، دواتر لەگەڵ یاوەرانیدا بەغدای بەجێهێشت و لە(المنطقة) لەناوەراستی رێگا بەرەو کازمییە، خێوەتی هەڵدا. دیارە مستەفا پاشا دڵنیا نەبوو لەم بزاوتەی عومەر پاشا و رەنگە وامەزەندەی کردبێت، کەئەو ماستە بێ موو نەبێت، بۆیە هێزێکی نارد بۆئەوەی بەشەو پەلاماری عومەر پاشا بدات، و عومەر پاشا توانی هەڵبێت، بەڵام ئەسپەکەی گلاو کەوتە خوارەوەو ملی شکا. دواتر یەکێك لەسەربازەکان دۆزییەوەو سەری بڕی، و کەللە سەرەکەی برد بۆ مستەفا پاشا و ئەویش رەوانەی ئەستەنبوڵی کرد.[219]

والی نوێ مستەفا پاشا ئەسپیناخی فرمانی دا دەست بەسەر سامانی والیی کوژراودا بگیرێت، و هەروەها پارە لەدەوڵەمەندەکان وەربگیرێت، گوایا بۆرزگار کردنی بەسرەیە، بەڵام هەمووی دەچووە گیرفانیەوە، و خەڵکی کەوتنە گلەیی و گازەندە، و سوڵتانیان لێ ئاگادار

[218] ئەحمەد عەلبی سۆڤ (سەرچاوەی پێشوو)ل34.

[219] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل55.



کردەوە. جگە لەوەی گوشاری دەخستە سەر مەمالیك، و بەراشکاوی رایدەگەیاند کەدەیەوێت لەناویان ببات، تاوای لێکردن وردە وردە بەغدا بەجێ بهێڵن، و لەناوچەیەکی نزیك لەرۆژهەڵاتی بەغدادا کۆببنەوە، بەسەرۆکایەتیی سەرکردەکەیان عەبدوڵڵا پاشا کەهیە، و دەستییان کرد بەهەڕەشە کردن لەبەغداو بەبەردەوامیی پەلاماری دەوروبەریان دەدا، و توانییان هەندێ شوێن داگیر بکەن. خێڵەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە، و گەڕانەوە سەر خووە کۆنەکەیان، و داگیرکاریو بڕینو چەتەگەری زۆر بوو.

لەو کاتەدا، بەسرە لەلایەن سوپای ئێرانەوە داگیر کرا، بەو شێوەیەی ئاماژەمان پێکرد، و سوڵتان نەیتوانی لەو رووەوە شتێك بکات، تەنیا ئەوە نەبێت بەفرمانێك مستەفا پاشای لەویلایەتی بەغدا لابرد، کەهێشتا تەنیا هەشت یان نۆ مانگی بەسەر بردبوو، و والی لابراو، بەدەست بەسەری رەوانەی دیاربەکر کرا، و لەوێ بەفرمانی سوڵتان سەری لەلەشی جودا کرایەوە.

## ڕەشبگیری:

سوڵتان لەئەستەنبوڵ ئەنجومەنی گشتیی دەوڵەتی کۆکردەوە–ئەم ئەنجومەنە تەنیا لەکاتی تەنگانەدا کۆدەبووەوە–و ئەنجومەن بڕیاری دا شەڕ رابگەیەنێت دژی کەریم خانی زەند،و بەمەیش داوای فەتوا لەشێخی ئیسلام کرا،و ئەمەیش کورتەکەیەتی:

(زەیدی ستەمکار لەدانیشتوانی وڵاتی عەجەمو لاف ئەوە لێدەدات بریکاری شایە، تاقمێکی یاخیی لەدزو تاوانباری لەخۆی کۆکردۆتەوە. ئەم تاقمە یاخییە پەلاماری ناوچە موسڵمانەکان دەدەنو قەڵایەکی موسڵمانانیان داگیرکردووە،و موسڵمانان دەکوژن،و ئایا زەیدو ئەوانەی پشتی دەگرن لەیاخی بوانن؟(فقاتلو التي تبغي حتى تفيء الى أمر اللّه)،و بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە، ئایا شەڕ کردن پێویستە لەگەڵ ئەم تاقمە یاخییەدا،و پێویستە ئەو قەڵایەیان لێ بسەنرێتەوە، کەلەدەستی موسڵمانان دەریان هێناوە؟). وەڵامی شێخی ئیسلام بۆئەم داواکردنی فەتوایە، ئەمەبوو: بەڵێ، پێویستە شەڕی لەگەڵدا بکرێت،و خودا زاناترە).

لەگەڵ دەرچوونی ئەم فەتوایەدا، بەسیجی گشتی راگەیەنرا، لەسەرجەم هەرێمە عوسمانییەکاندا، دواتر بڕیاری لێبووردن بۆمەمالیکە یاخی بووەکان دەرکرا، کەسەرکردەکەیان عەبدوڵلا پاشا بکرێت بەوالی بەغدا، لەپێناوی پاراستنی یەکڕیزی لەبەرامبەر دوژمنی هاوبەشدا. دواتر پێنج سەد کیسەی پڕ لەپارە لەئەستەنبوڵەوە گەیشتەبەغدا، بۆ پڕکردنەوەی خەرجی شەڕ،و لەرێگەی فوراتەوە سەدوپەنجا کەشتی پڕ لەسەرباز رەوانە کرا.[220]

[220] ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل38–41.



## محەمەدی عەجەمی:

شێخ رەسووڵی کەرکووکلی لەکتێبی(دوحة الوزراء)دا دەڵێت:کاتێ عەبدوڵلا پاشا وەکو والی گەیشتە بەغدا، خەڵکی پێیان وابوو، ئەم پیاوە بەسرە لەدەستی عەجەم رزگار دەکات،و بەڵام بەهۆی ئەوەی بەلای رابواردنو خۆشگوزەرانیدا بایدایەوە، ئەرکی سەرشانی فەرامۆش کردو، بەهاندانی محەممەد بەگ عەجەمی، نەغرۆی خۆشگوزەرانی بوو.[221]

لەراستیدا، ئەم محەممەد عەجەمییە کەنووسەری کتێبی(دوحة الوزراء) ئاماژەی بۆکرد، رۆڵێکی گەورەی گێڕا لەکۆمەڵگەی بەغدادا، لەماوەیەکی نەچەندان کورتدا،و پێویستە لەسەرمان، هەڵوەستەی لەسەر بکەین، بۆئەوەی شتێك لەژیانو کەسایەتیی تاوتوێ بکەین.

محەممەد عەجەمی–خەڵکی بەغدا بەعەجەم محەممەد ناویان دەبرد–هەر لەسەردەمی عومەر پاشاوە هات بۆبەغدا، ولەو سەردەمەدا گەنجێکی جوان بوو مووی لێنەهاتبوو،و دەنگێکی خۆشی پێوەبوو، لەگەڵ دایکیو دوو خوشکی جوانیدا هاتبوو. محەممەد توانی لەم خێزانە، نیمچە تیپێکی مۆسیقا پێکبهێنێت، دوو خوشکەکەی سەمایان دەکردو دایکی دەف لێدەداو خۆیشی گۆرانی دەگوت. گەوادیشی کردبوو بەپیشەی خۆی،و دەگێڕنەوە کەشانازیی بەو پیشەیەوە کردووە،و

[221] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل159.

گوتوویەتی:(ئەگەر ئەو پیشە پیرۆزە نەبوایە، بەم پێگەیە نەدەگەیشتم).[222] ئیبن سەنەدی بەسری بەم جۆرە وەسفی دەکات:(...بازاڕی گەرم بوو لەبەغدادا، و هەوادارانی گەندەڵی و بەد ڕەوشتی، لەئەمیرانی بەغداو خانەدانەکان ڕوویان تێکرد، و پێگەی بەرز بووەوە، تاوایلێهات کاری خەڵکی ڕادەپەڕان، و بەرتیلی پێدەدراو دیاری پێشکەش دەکرا، پێداویستی خەڵکی چارەسەر دەکرد، سوودو زیانی دەگەیاند، تا وایلێهات بەیەکێك لەگەورەپیاوانی دەوڵەت هەژمار دەکرا، و وەکو خوێن و گۆشت، لەوەزیرەکان نزیك بووەوەو بوو بەهاودەمیان– تابڵێی ڕەوانبێژو قسەزان بوو–و بەر لەعەبدوڵڵا پاشا، لەلای عومەر پاشا بوو بەراوێژکار، و دەرگای ستەمی بۆئاوەڵا کردو تیژی دەکرد دژی خەڵکی وماڵی وێران کردن، و زۆربەی بازرگانانی بەغدا، لەترسی عەجەم محەممەد بەغدایان بەجێ هێشت، و ستەمی بێ وێنەبوو،وتا زیاتر دەچووە ساڵەوە، شەڕئەنگێزتر دەبوو، و ئەزموونەکانی فێری ئەوەیان دەکرد، بەجۆرێ زیان بەنەیارانی خۆی بگەیەنێت، کەشەیتان پەی پێنەدەبرد، تەنانەت کاتێ عومەر پاشای وەزیر کوژرا، خەڵکی خۆشحاڵ بوون، بەگومانی ئەوەی لەشەڕئەنگێزیی عەجەم محەممەد ڕزگاریان دەبێت، و گوایا ئاگرەکەی دادەمرکێتەوە، لەکاتێکدا عومەر پاشا پیاوێکی خێرخوازبوو، و کاری چاکەی هەبوو...کاتێکیان زانی مستەفا پاشا زیاتر

[222] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل17.



لەعومەر پاشا، لەخۆی نزیکی کردۆتەوە، و بوو بەراوێژکاری یەکەمی، و یەکەم کەس بوو کەدەچووە لای، و دوا کەسیش بوو کەلەلای دەردەچوو، کردی بەخەزنەداری خۆی، و هەموان سەریان کردە مەیخواردنەوەو زیناکردن و هەتیوبازی و هەموو جۆرە بەدرەوشتییەك و ستەمکارییەك، تەنانەت ئەو پارەیەی سوڵتان ناردی بۆئەوەی خەرجی شەڕی عەجەم بکرێت، بۆدەرکردنیان لەبەسرە، ئەو عەجەم محەممەدە مەلعوونە خۆی پێگەیاند...و وای بۆوەزیر عەبدوڵڵا پاشا دەرخست، کەهەمووی خەرجی شەڕەکە کردووە، و وەزیر عەبدوڵڵا پاشا لەگەمژەییدا، بڕوای پێکردو متمانەی پێدا، چونکە ئەم وەزیرە بەراستی گێل و گەمژەو بێ زمان بوو، بەڵام دەڵێی چی خودا وەزارەتی پێ بەخشیبوو، و کێ دەزانێ، خۆ وەزارەت بەئیش نییە بەریشە...).[223]

[223] سەرچاوەی پێشوو، ل17–18.

## شەڕەگەڕەك:

دەسەڵاتی عەبدوڵڵا پاشا تەنیا دوو ساڵ درێژەی هەبوو، چونکە تووشی نەخۆشی ئاوبەنگ بوو، و لەزستانی 1777دا مرد، و بەمردنی شەڕەگەڕەك بەتوندی لەبەغدا بۆماوەی چەند مانگێك هەڵگیرسا.

مێملێی لەسەر دەسەڵات، دوای مردنی عەبدوڵڵا پاشا، لەنێوان محەممەد عەجەمی و ئیسماعیل ئاغا كەهیەدا بوو، و گەڕەكەكانی بەغدا بوون بەدوو بەشی نەیار بەیەكەوە، و هەر تاقمەو پشتگیریی بۆیەكێك لەو دوانە دەردەبڕی، دژی دوژمنەكەی. گەڕەكەكانی فەزڵ و مەهدیەو قەراغوڵ و مەیدان لایەنگری محەممەد عەجەمی، و گەڕەكەكانی (رأس القريه) و (باب الشيخ) و شۆریجە هەواداری ئیسماعیل ئاغا بوون.[224] بەشێوەیەكی گشتی، مەمالیك پشتگیرییان لە ئیسماعیل ئاغا دەكرد، بەڵام ئینكشارییەكان بوون بەدوو بەشەوە، و سەربازە خۆماڵییەكانیش پاڵیان بەو كەسەوە دەدا، كەپارەی زۆرتری بۆهەڵدەڕشتن.[225] ئیتر هەر تاقمەو كەوتنە نووسینی داواكاریی و كۆكردنەوەی ئیمزا بۆئەوەی رەوانەی لای سوڵتانی بكەن، بەمەبەستی دامەزراندنی كاندیدەكەیان بەوالی بەغدا، لەبری كاندیدە نەیارەكە.

[224] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل70–71.

[225] ستیڤن هیمسلی لۆنكریك(سەرچاوەی پێشوو) ل181.



سولەیمان بەگ شاویی سەرۆكی عوبێد ویستی دۆخەكە ئارام بكاتەوە، كەپێگەیەكی رێزداری هەبوو لەناو هەموو چینەكان لەبەغدادا، و داوای كرد هەردوو كاندیدەكە لەبەغدا دەربچنە دەرەوە، تاوەكو بارودۆخەكە ئارام دەبێتەوە، ئیسماعیل ئاغا رەزامەندی دەربڕی، كەچی محەممەد عەجەمی ملی بەوە نەدا. دانیشتوانی گەڕەكی مەیدان بەتوندی هەواداری عەجەمی بوون، چونكە بۆی هەڵڕشتبوون،[226] جارێكیان شاوی مشتومڕی ئەوەی لەگەڵدا دەكردن، كەدەوڵەت رازی نابێت كاندیدەكەیان بكرێت بەوالی بەغدا، چونكە عەجەمە، هەموو بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوە: (با عەجەم بێت، رۆمەكان تائێستا پێنج وەزیری عەجەمیان داناوە، بائەم شەشەم بێت).[227]

محەممەد عەجەمی پەنای بردەبەر ئەحمەد ئاغای هاوڕێی كەسەرۆكی(لاوەند)بوو[228] كەئەو سەردەمە لەبەعقوبە دەژیا، ئەویش كۆمەڵێ لەلاوەندەكانی بۆنارد، ئەوانیش هاتن لەبەردەم مەزاری شێخ عومەر خێوەتیان هەڵدا، و بەمەیش دانیشتوانی گەڕەكی مەیدان ورەیان بەرز بووەوە.

[226] عوسمانی كوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل24.

[227] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل73.

[228] لاوەند زاراوەیەكی توركییە، بەمانای چریك(جاش)، كەلەسەردەمی عوسمانیدا، بۆكاروباری ناوخۆ چەكدار دەكران، و زۆربەیان كورد یان لوڕ بوون. ئیستایش لەبەغدادا، گەڕەكێك هەیە بە(خان لاوەند) ناسراوە.

لەلایەکی دیکەوە، تاقمەکەی ئیسماعیل ئاغا بەوە ورەیان بەرز بووەوە، کەسولەیمان بەگ شاوی‌و خێڵی عەقیل هاتنە پاڵیان،و خێڵی عەقیل لەکەرخەوە پەڕینەوەو لە(رأس الجسر) نزیکی مەولا خانە سەنگەریان لێدا. ماوەی پێنج مانگ شەڕ لەنێوان ئەو دوو تاقمەدا بەردەوام بوو، تیایدا بازاڕو ماڵەکان تالآن کران،و خوێنی تیادا رژا،و دەستدرێژی زۆری تیادا کرا،و (چەندین دەوڵەمەند هەژار کەوتن‌و چەندین هەژار دەوڵەمەند بوون).[229] باری سەرشانی چەوساوەکان قورستر بوو. لەبازاڕەکاندا شەڕوشۆڕ بووبووە کاری رۆژانە.

لەمانگی ئایاری ساڵی 1778دا، کاتێ حەسەن پاشا کەرکووکلی گەیشت، بەفرمانی سوڵتانەوە وەکو والی بەغدا، بارودۆخەکە ئارام بووەوە،و والی نوێ بەشێوەیەکی رەسمی هاتە بەغداو محەممەد عەجەمی ، بەیارمەتیی ئەحمەد ئاغای هاوڕێی، بەرەو ناوچەکانی دیالە رایکرد،و لەوێوە دەستیان کرد بەچەتەگەری‌و پەلاماری بەغدایان دەدا.

[229] سەرچاوەی پێشوو، ب6 ل74.



## سەردەمی حەسەن پاشا کەرکووکلی:

لەسەردەمی ئەم والییەدا، بەسرە لەدەستی ئێرانییەکان سەندرایەوە،و ئازایەتیی والی نەبوو، چونکە سوپای ئێران، دوای مردنی کەریم خان لەشیراز، کشایەوە. و سولەیمان ئاغا فەرماندای پێشووی بەسرە گەڕایەوە، دوای ئەوەی بەدرێژایی داگیرکردنی بەسرە لەلایەن ئێرانییەکانەوە، لەشیراز زیندانی بوو. دیارە لەزینداندا رووبەرووی ئەشکەنجە نەبووبووەوە،و دەڵێن ئێرانییەکان خۆشیان ویستووەو رێزیان لێگرتووە.

دەسەڵاتی حەسەن پاشا لەبەغدا، زۆری نەخایاند، زیاتر لەهەژدەمانگ نەبوو،و خەڵکەکە لەو ماوەیەدا لەژێر گوشاردا بوون،و محەممەد عەجەمی توانی زیاتر لەدەهەزار لەهەوادارانی خۆی کۆبکاتەوەو ناوچەیەکی زۆر لەدەوروبەری بەعقوبە داگیر بکات‌و ئاسایشی تێکداو رێگەی لەرەوتی کاروانەکان دەگرت، کەئەمەیش بووە هۆی پەککستنی ژیانی ئابووری لەبەغدادا،و لەبەغدادا هەواداری زۆری هەبوو،و بەتایبەتی لەگەڕەکی مەیدان،و خەڵکیان هان دەدا شۆڕش بکەن. گوایا مەمالیك لەبەغدا، رازی نەبوون لەدەسەڵاتی حەسەن پاشا، چونکە لەخۆیان نەبوو،و ئەوانیش دەستیان هەبوو لەوشۆڕشەدا.

لەکۆتایی تشرینی یەکەمی 1779دا، شەڕ لەنێوان دوو کەس لەنزیکی مەزاری شێخ عومەر روودەدات،و کاتی دانیشتوانی مەیدان ئەوە

دەبیستن، دەیکەن بەبیانوویەك بۆراگەیاندنی شۆڕش،و بەدەنگی بەرز هاواریان دەكرد، كەحەسەن پاشایان ناوێت.

والی لەوە ترسا،و خۆی لەقەڵای ناوخۆدا قایم كرد. رۆژی دواتر كاتیٚ خەڵكەكە هەستیان بەلاوازیی والی كرد، لەشەقامەكاندا كۆبوونەوەو سەنگەریان لێدا،و دواتر پەلاماری سەرایان دا.

هەر ئەو رۆژە كاتیٚ شەو داهات، والی لەترسانا، لەدەرگای قەڵاكەوە خۆی دزییەوەو بەرەو كەرخ پەڕییەوە،و دواتر توانی بۆدیاربەكر رابكات،و لەویٚ نەخۆش كەوتو دوای چەند رۆژێك مرد.[230]

سولەیمان ئاغا لەبەسرەوە، بەوردی چاودێریی رووداوەكانی بەغدای دەكرد،و نامەی ماستاوی بۆسوڵتان دەنووسی تابیكات بەوالی بەغدا،و بەڵێنی پێدەدا كەئاژاوەگێڕی بنبڕ بكات،و ئاسایش سەقامگیر بكات،و دوای چەندین نامە گۆڕینەوە، سوڵتان رازی بوو،و رێنمایی دەركرد بۆئەوەی، سەرەرای دەسەڵاتەكەی خۆی، بیكەن بەوالی بەغدا.[231]

دواتر ئەم سولەیمان ئاغایە بە(بیوك سولەیمان– واتە سولەیمانی گەورە، لەناو خەڵكیدا ناوبانگی دەركرد،و لەمەمالیك بوو،و سەردەمەكەی بەسەردەمی زێڕینی حكومەتی مەمالیك لەعیراقدا هەژمار دەكرێت.

[230] سەرچاوەی پێشوو، ب6 ل82–83.

[231] ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل53.



# بەشی حەوتەم

## سولەیمانی گەورەو سەرهەڵدانی بزاڤی وەهابی

لەساڵی 1780دا، دەسەڵاتی سولەیمانی گەورە لەبەغدا دەستی پێكرد،و ماوەی بیستو دوو ساڵ درێژەی كێشا،و دەسەڵاتی هیچ والییەكی دیكە، لەمێژووی سەردەمی عوسمانیدا هێندە درێژەی نەبوو. بۆیە نازناوی گەورەی وەرگرت، بۆئەوەی لەوالییەكی دیكە جیابكرێتەوە، بەناوی سولەیمان دواتر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، بەڵام هەرچۆن بێت، شایستەی ئەو نازناوەبوو، یەكێك لەو بەریتانییانەی تێكەڵی بوو–سێر هارفۆرد جۆنز– بەم جۆرە وەسفی دەكات:(رەنگە سولەیمان نموونەی باشترین پاشای توركی بێت. لەمەمالیك بوو، پیاوێكی قۆز بوو–وهێندە جوان بوو، كەبەتەماشا كردنی دڵ دەكرایەوە– بەتایبەتی كاتیٚ جلوبەرگیی توركی لەبەر دەكرد. وەكو پسپۆڕێك شارەزایی لەهەموو بزاوتە سەربازی،و وەرزشییەكاندا هەبوو،و بەئەرك‌و كاروباری ئایینییەوە پابەند بوو...).

لەم وەسفەدا دەردەكەوێت كەسولەیمانی گەورە جوانیی رەوشتو لێهاتوویی لەخۆیدا كۆكردبووەوە،و بوونی ئەو دوو سیفەتەیش لەكەسێكدا، دەروازەكانی لەبەردەمدا ئاوەڵا دەكات،و زەمینەی بۆخۆش دەكات، تابەرەو سەركەوتن هەنگاو بنێت،وهێندەی كاریگەریی لەسەر

ستیڤن هیمسلی لۆنكریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)–وەرگێڕانی جەعفەر خەیات– بەغدا1962–ل193.

خەڵکی دروست کردبوو، کەزۆر جار کاری وایان دەدایە پاڵی کەئەنجامی نـەدابوو، و لەستایشـکردنیدا زێـدەڕەوییان دەکـرد. لەراسـتیدا ئێسـك سـووکی و رواڵـەتی مـرۆڤ کاریگەرییـەکی کۆمەڵایـەتیی گـەورەی هەیـە، بۆئـەوەی بچێتە دڵـەوە، و تازیـاتر بێت، دەرفـەتی سـەرکەوتن لەبەردەمیـدا زیـاتر دەبێـت بـەرەو سـەرکەوتن، و دەسـتەبەر کردنـی پێگـەی بـەرزتر لەکۆمەڵگەدا، و وای لەوەی ئێسکی قورس بێت و نەچێتە دڵەوە!

سولەیمانی گەورە لەبەرچاوی عیراقییەکان بوو بەئەفسانەو پیایاندا هەڵـدەدا. مێـژوونووس یاسـین عومـەری دەڵێـت: محێـدین ئـیبن عـەرەبی– سۆفییە بەناوبانگەکە– پێشبینی دەسەڵاتی سولەیمانی گەورەی کردوە، و باسی پیاوەتیی ئەوی کردووە، و لەکتێبی(الشجرة النعمانیة)دا دەڵێت:(یا رأس الرؤوس ویا نفس النفوس لك الظهور) واتە، ئەی سەری سەران و ئەی گیـانی گیـانـان، تۆدەردەکـەویت)، و وشـەی سـەرهەڵدان(الظهور) لـەژمارەی پیتەکانـدا، یەکسـانە بـەژمارە(1192) و هێمایـە بـۆ ئەوسـاڵەی دەسـەڵاتی سولەیمانی گـەورە بـەپێی رۆژژمێـری کۆچـی دەسـت پێـدەکات، و هـەروەها ئـیبن عـەرەبی، لەوەسـفکردنیدا دەڵێـت:(فـأمر بـالمعروف في الأمـور وأدار الزمـان وحـوادث الحـدثان فقد یقـوم بطـل قـرم لاعطـل سیفه حسـام قصـا) واتە، کاروبار بەباشی بەڕێوە دەبات، پاڵەوانێك لەقەرم پەیدا دەبێت و هیچ شمشێرێك لەبەردەم شمشێرەکەیدا خۆی ناگرێت، وشـەی(قصـا) لـەژمارەی پیتەکانـدا یەکسـانە بـەناوی سـولەیمان. رەنگـە خـەڵکی لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا، ئـەوە بەشـتی پڕوپـووچ و خـەیاڵ دابنـێن، بـەڵام لـەو سـەردەمەدا، بەراست دەزانرا و گومان لەراستی ئەوە نەدەکرا.

یاسین عومەری(غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر)–مووسڵ1940–ل62.



## تۆکمەکردنی بنەماکانی دەسەڵات:

هەر کەسولەیمان پاشای گەورە وەکو والی گەیشتە بەغدا، یەکسەرە رووی کـردە دیالـە بۆلـەناوبردنی محەممـەد عەجـەمی و داروودەسـتەکەی، کەئەو ناوچانەیان کۆنترۆڵ کردبوو، و لـەوەدا سەرکەوتوو بوو، و ئەمـەیش وای لەمحەممەد عەجەمی کرد بەرەو ئێران رابکات. دواتر سولەیمان پاشا رووی کـردە خـەزاعیل لـەفوراتی ناوەراسـت، و ئەوانـە دەرفـەتی ئـەو ئاژاوەیـەیان قۆسـتبووەوە، کـە وڵاتـی گرتبـووەوە، لەسـەردەمی پێشـتردا و دەستیان گرتبوو بەسەر فوراتی ناوەراستدا، بۆماوەی نزیکەی هەشت ساڵ بەسـەرۆکایەتیی شـێخەکەیان حەمـەد ئـەلحمود. سـولەیمان پاشـا تـوانی بیانخاتـە ژێـر رکێفـی دەسـەڵاتیەوە، لەرێگـەی بـڕینی ئـاوی رووبـار لێیـان، بـەبێ ئـەوەی دڵۆپێـك خـوێن بڕێـژرێت، بـەوەیش سـوڵتان بەشمشـێرێك و جلوبەرگی نایاب خەڵاتی کرد. لەساڵی 1782دا، رووی لەکوردستان کرد بۆدامرکاندنـەوەی شۆڕشـێك کەلـەو ناوچـەیەدا بـەرپا بووبـوو، پارێزگـاری شۆڕشگێڕ مەحموود پاشای بابان پەنای بۆ ئێران برد، و سولەیمان پاشا، لەشوێنەکەیدا، ئیبراهیم بەگی بابانی دانا، و ئەم ئیبراهیم پاشایە، شاری سلێمانی دامەزرانـد، بـەڵام ئـەو وەکـو وەفادارییـەك بۆسـەروەرەکەی خـۆی، بەناوی سولەیمان پاشای گەورەوە ناوی نا.

ئەحمەد عەلی سۆفی(الممالیك فی العراق)–مووسڵ 1952–ل 54–58.

ئەم سەركەوتنانەی سولەیمان پاشا، لەسەرەتای دەسەڵاتەكەیدا بەدەستی هێنا، هێندەی دیكە سامی لەدڵی خەڵكیدا زۆرتر كرد، و بەمەیش ئاسایش لەسەرانسەری وڵاتدا سەقامگیر بوو، و هاتوچۆی كاروانەكان رێكخراو بازاڕەكان بووژانەوە. سولەیمان پاشا لەناوەوەو لەدەرەوە، هەزار مەمالیكی كۆكردەوە، و مەشقی پێدەكردن، بۆئەوەی لەكاتی تەنگانەدا پشتیان پێببەستێت، و دواتر ئەفسەری بۆئینكشارییەكان دیاری كرد، و ، لەبری ئەوەی لەبەغدادا بیانهێڵێتەوە، بەسەر مەڵبەندەكانی فوراتی ناوەراستو خالیسدا دابەشی كردن.

## قاتوقڕی لەبەغدا:

لەهەموو سەردەمی سولەیمانی گەورەدا، تەنیا یەكجار بشێویی بەغدای گرتەوە، ئەویش بەهۆی قاتوقڕییەكی قورسەوەبوو كەلەساڵی 1786دا وڵاتی گرتەوە. لەو ساڵەدا ئاوی رووبارەكان كەمی كردو كەمبارانی بوو، و نرخی گەنم بۆ هەشت قروش بەرز بووەوە، ئەو نرخە لەو سەردەمەدا گەلێ زۆر بوو، كەهەموو كەسێك بۆی هەڵنەدەسووڕا، قاتوقڕی وڵاتی گرتەوەو نەخۆشی بڵاو بووەوە، تاوایلێهات لاشەی مردووەكان لەشەقامو كۆڵانەكاندا لەسەر یەك كەڵەكە دەبوون، وهەندێ كەس گۆشتی مردوویان دەخواردو خوێنەكانیان دەمژی.

ستیڤن هیمسلی لۆنكریك(سەرچاوەی پێشوو)ل 198.

رەسووڵ كەركووكلی(دوحة الوزراء)–وەرگێڕانی موسا كازم نەوڕەس–بەیرووت–ل183.



والی هەوڵی دا هەندێك لەباری گرانی قاتوقڕییەكە لەسەر خەڵكی بەغدا سووك بكات، بۆیە فرمانی دا، ئەو جۆیەی لەعەمبارەكانی حكومەتدا هەبوو، و دانرابوو بۆئاڵفی ئەسپەكان، بەسەر هەژاراندا دابەش بكرێت، بەڵام بێ سوود بوو.

دەنگی شۆڕش لەناو گەڕەكەكانی بەغدادا بڵاو بووەوە، و شەقاوەكان ئەو هەلەیان قۆستەوەو بەكەیفی خۆیان تەراتێنیان دەكرد. دانیشتوانی (باب الشیخ) پەرچەمی شێخ عەبدولقادریان دەركرد، و رێپێوانیان پێكرد، و دەنگی جنێودان بەوالیو لابردنی بەرز بووەوە. دواتر كۆمەڵێ روویان كردە سەرا، بەمەبەستی پەلاماردانی، بەڵام والی ملی پێنەدان، بەڵكو فرمانی بەسەربازەكانی دا تەقەیان لێبكەن، هەندێكیان لێكوژراو ئەوانی دیكە رایان كرد. والی بەوەوە نەوەستا، بەڵكو فرمانی دا سەرانیان بگرن، كەخەڵكییان هانی ئاژاوەنانەوە دابوو، یەكسەرە هەندێكیانیان لەسێدارە دا، بۆئەوەی ببن بەپەند بۆئەوانی دیكە. بەڵام ئەو پیاوەی پەرچەمەكەی شێخ عەبدولقادری هەڵگرتبوو، كاتێ گرتییان، بینییان ئەقڵی تەواو نییە، بۆیە بۆ بەسرە دووریان خستەوە.

عوسمانی كوڕی سەنەدی بەسری(مطالع السعود بطیب أخبار الوالي داوود)–كورتكردنەوەی ئەمین حولوانی–قاهیرە1371ھ–ل 39.

رەسووڵ كەركووكلی(سەرچاوەی پێشوو) ل184.

## سوله یمان شاوی:

بەبیٚ ئەوەی ئاماژەیەك بەژیانی حاجی سولەیمان شاوی نەکەین، ناتوانین بڵێین بەتەواوی باسی سەردەمی سولەیمانی گەورەمان لەعیراق کردووە، ئەم پیاوە لەراستیدا، شایستەی ئەوەیە باسێکی تایبەتی بۆتەرخان بکەین، ژیانی وێنایەکی روون، لەسەر بارودۆخی سەیری کۆمەڵگەی عیراقی ئەو سەردەمەمان بۆبەرجەستە دەکات.

حاجی سولەیمان چەندین سیفاتی تیادا بوو، بەدەگمەن لەکەسێکی دیکەدا کۆدەبوونەوە، سەرۆکی خێڵێکی گەورەی وەکو عوبێد بوو، یەکێك لەشاعیرانی هەجو، و نووسەرو زمانەوان بوو،[□□□] جگە لەوەی لەوالییەکانی بەغداوە نزیك بوو، پۆستی(باب العرب)ی لێیان وەردەگرت-واتە بەرێوەبردنی کاروباری خێڵەکان-و لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان بەو شۆڕشە کرد کە لەسەردەمی عومەر پاشادا بەرپای کرد، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی کوشتنی باوکی، و ئەو رۆڵە گەورەیەی دواتر گێڕای، لەکاتی گەرمبوونی شەڕەگەڕەکی بەغدا، کەپشتگیریی لەئیسماعیل ئاغا، لەدژی محەممەد عەجەمی دەکرد.

[□□□] عەبباس عەزاوی(تأريخ الأدب العربي في العراق)-بەغدا 1962-ب2 ل41-43.



لەسالأنی یەکەمی دەسەڵاتی سولەیمانی گەورەدا، پەیوەندیی نێوان ئەوو نێوان سولەیمان شاوی گەلیٚ بتەو بوو، و کەوتە نێوان والیو شێخەکانی فوراتی ناوەراستەوە، بۆئەوەی مل بەفرمانی والی بدەن.[240] تاساڵی 1785 پەیوەندیی نێوانیان بتەو بوو، بەڵام لەپڕ تێکچوو، و دواتر بڕا، و حاجی سولەیمان بەتوڕەبوونەوە بەغدای بەجێهێشت، و چووەوە ریزی خێڵەکەی خۆیەوە، و لەناوچەکانی خاپوردا، دەستی بەئاژاوە نانەوە کرد.

بۆچوونی مێژوونووسان لەدەرخستنی هۆکاری ئەم کێشەیەی لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا رووی دا جیاوازە، شێخ رەسووڵ کەرکووکلی دەڵێت: حاجی سولەیمانی شاوی لەبەردەم والیدا، خۆی بەزل دەزانیو خۆپەسەندو خۆویست بوو، و لەخۆبایی بوو، بەدەنگی بەرز بەسەر والیدا دەیخوڕیو قسەی ناشایستەی ئاراستە دەکرد، و چەند جاریٚ والی راستەخۆو ناراستەوخۆ ئاگاداری دەکردەوە، بەڵام بیٚ سوود بوو، بەڵکو زیاتر لەخۆ بایی دەبوو، سەرەرای ئەوەی دژایەتیی ئەحمەد ئاغای دەکرد کەپیاوێکی پایەبەرز بوو، و لەکەسایەتیی کەم دەکردەوە، چونکە ئیرەیی لێدەکرد، و ئەوەی فەرامۆش کردبوو، کە گەورەیی پیاو لەرەوشتیدایە، نەك لەرەچەڵەك، و دوای ئەوەی بەبەرییەوە نەما، والی ناچار بوولەبەغدا دووری بخاتەوە، بۆئەوەی لەچەقەچناویی حاجی رزگاری ببێت...[241].

[240] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل198.

[241] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل181-182.

کەچی ئەحمەد عەلی سۆڤ، نووسەری کتێبی(المماليك فى العراق) هۆکاری شەڕی نێوانیان دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کەحاجی سولەیمان شاوی رقی لەمەمالیك بووو بەداگیرکەری دادەنان، کەسامانی وڵات دەدزن‌و بەکوێرایی چاوی رۆڵەکانی عیراقەوە دەسەڵات بەڕێوەدەبەن،و بەراشکاوی رەخنەی لێدەگرتن وسکالآی خۆی دژی ستەم‌و زۆرداریيانی رادەگەیاند،و بەتەواوی رق‌و کینەی زۆرتر بوو، کاتیٚ ئەحمەد ئاغای مەمالیکی بینی کەدەستی بەسەر کاروباری بەغدادا گرتووە،و حاجی سولەیمان کەشێخێکی گەورەی عەرەب بوو، نەیدەتوانی ببێت بەپاشکۆی مەمالیکێکی چەپەڵ‌و قێزەون.[242]

مێژوونووسێکی دیکە هۆکارەکە قووڵتر دەکاتەوە،و دەڵێت والی سولەیمانی گەورە، پلانێکی بەنهێنی داڕشت بۆئەوەی هەموو کاروبارەکان بخاتە ژێر دەستی مەمالیکەوە،و نۆرێنی لایەنەکانی دیکە لەناوببات، هەستا بەدوورخستنەوەی سەرانی ئینکشاری وعەرەب‌و کوردەکان،و توندیی دوژمنایەتیی نێوان ئەحمەد ئاغاو حاجی سولەیمانی قۆستەوە،و ئەوەی کرد بەپاساوی دوورخستنەوەی حاجی سولەیمان،و تەنیا ئەحمەد ئاغا لەو کەینوبەینە ئاگادار بوو.[243]

[242] ئەحمەد عەلی سۆڤ(سەرچاوەی پێشوو) ل59–60.

[243] عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين)–بەغدا1954–ب6 ل96.



## شاویی شۆڕشگێڕ:

حاجی سولەیمانی شاوی چەند مانگێك لەخاپوور مایەوە، بەمەبەستی خۆئامادەکردن، بۆشەڕکردن لەگەڵ حکومەتدا،و خێڵی عوبێد ، هەروەها هەموو ئەوانەی دەربەدەرو بیٚ دەرەتان‌و هەڵهاتوو بوون لەگوندو شارەکان، لەدەوری گلێر بوونەوە،و هێزەکانی دەستییان کرد بەئاژاوەگێڕی، لەنێوان خاپوورو دەوروبەری بەغدا، تاوایلێهات رێگەوبان‌و باخەکانی دەوروبەری بەغدا، ئاسایشیان تیادا نەما.[244] لەساڵی 1786دا، شەڕێکی گرنگ لەنێوان هێزەکانی‌و سوپای حکومەتدا رووی دا، لەنزیکی فەلوجەو بەسەر سوپادا سەرکەوت. دوای تێپەڕبوونی مانگێك بەسەر شەڕی فەلوجەدا، حاجی سولەیمان بەهێزەکەیەوە گەیشتە دەوروبەری بەغدا،و لەتەنیشت مەزاری حەللاج، لەنزیکی ست زوبێدە خێوەتی هەڵدا، ورێگەکان بڕان‌و ترس دانیشتوانی بەغدای داگرت، بەو گومانەی بەو زووانە بەغدا دەکەوێتە دەستی خێڵەکییەکان‌و کوشتن‌و بڕین تیایدا بڵاو دەبێتەوە.

والی خێرا هەرچی هێزی هەبوو هەمووی کۆکردەوە،و فرمانی دا خەڵکی بەغدا بەسیج بکرێن،و هەرچۆنێك بوو توانی دوژمن بشکێنێت،و

[244] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل200.

عەقیلییەکانی دانیشتووی کەرخ بەرگرییەکی پیاوانەیان کرد، و حاجی سولەیمان ناچار بوو بەرەو دوجەیل بکشێتەوە، و دواتر بەرەو (شوفاسە) رۆیشت، و لەوێوە پەنای بردە بەر سوەینیی شێخی مونتەفیق.

شێخ سوەینی یەکسەرە پشتگیریی خۆی بۆحاجی سولەیمان راگەیاند، و نامەی بۆ حەمەد ئەلحمودی شێخی خەزاعیل نارد، بەمەبەستی پێکهێنانی بەرەیەکی خێڵەکیی بەهێز دژی حکومەت. ئەو بەرەیە پێکهێنرا، تەنانەت وادانرا، کەترسناکترین شۆڕشی عەرەبی بوو، کەدژی حکومەتی مەمالیك لەعیراقدا بەرپاکرا.[245] شێخ سوەینی بەشێك لەسوپای سوارەی مونتەفیقی نارد بۆبەسرە، و چوونە ناوشارەوەو دەستیان گرت بەسەر سەرادا، و دوای دوو رۆژ لەهاتنی سوەینی بۆبەسرە، لەگەڵ پێنج هەزار سەرباز، سەرۆکی فەرمانگە حکومییەکانو ئەفسەرانی دەریای دەستگیر کرد، و دەستی گرت بەسەر سامانەکانیاندا، هەروەها بڕی شەش هەزار تومان باجی لەسەر خەڵکی بەسرە دانا، و بەمەیش بەسرە بوو بەحکومەتێکی عەرەبیی خێڵەکایەتی.[246]

لەمانگی ئاداری لەساڵی 1787دا، سولەیمان پاشا بەسەرکردایەتی سوپایەکی گەورە، لەرێگەی فوراتەوە، رووی لەبەسرە کرد. لە13ی تشرینی یەکەمدا، شەڕێکی یەکالاکەرەوە لەنێوان هەردوولادا رووی دا، لە(أم الحنطة)ی نزیکی بەسرە، و خێڵەکان لەو شەڕەدا تۆپیان بەکار هێنا، و

[245] ئەحمەد عەلی سۆڤ(سەرچاوەی پێشوو) ل63.
[246] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل201.



سولەیمان پاشا ئازایەتیی نواندو شمشێری هەڵکێشاو کەوتە ناو ریزەکانی دوژمنەوە. شەڕەکە بەسەرکەوتنی ئەو کۆتایی هاتو لەو شەڕەدا دەستکەوتی زۆری هەبوو.

سولەیمان پاشا فرمانی دا بەلابردنی سوەینی لەسەرۆکایەتی مونتەفیقو حەموود ئەلسەعدوونی لەشوێنی دانا، و هەروەها حەمەد ئەلحمودی لەسەرۆکایەتیی خەزاعیل لابردو موحسن ئەلحەمەدی لەشوێنی دانا. بەڵام حاجی سولەیمان شاوی توانی هەڵبێتو ماوەیەك بەو جۆرە مایەوە، دواتر داوای بەخشینی لەوالی کردو ئەویش لێی خۆشبوو، و سامانەکەی بۆگێڕایەوەو فرمانی پێدا، لەناوچەیەك لەرۆژئاوای بەغدا، کەپێی دەڵێن(تل أسود) نیشتەجێ ببێت.

تاساڵی 1790 حاجی سولەیمان لە(تل أسود) مایەوە، لەو ساڵەدا لەپڕ محەممەد عەجەمی لەئێران گەڕایەوەو پەنای بەو برد، بۆئەوەی بەپێی دابو نەریتی خێڵەکایەتی داڵدەی بدات، و لەوێدا حاجی سولەیمان کەوتە بارودۆخێکەوە، نەیدەزانی چۆن خۆی قوتار بکات، ئاسان نەبوو بتوانێت داڵدەی کەسێك نەدات کەپەنای پێبردووە، و ئاسانیش نەبوو کەبەو هۆیەوە، والی لێی توڕە ببێت.

والی داوای لێکرد عەجەمی بدات بەدەستەوە، و ئەویش خاوەخاوی دەکرد لەجێبەجێ کردنی داواکەی والیدا، ئەوەیش وایکرد والی هێزێکی بۆبنێرێت، بەسەرکردایەتیی کەهییە. حاجی دەرەتانێکی نەما، ئەوە نەبێت، لەگەڵ عەجەمیدا، بەرەو بیابان رابکات، بەوەیش هەرچی مەڕو

مالاَْتو سامانی هەبوو، هەمووی لەدەست دا.[247] حاجی زیانی ماددی لەزیانی مەعنەوی پیَ باشتر بوو.

دواتر محەممەد عەجەمی توانی لەرێگەی بیابانەوە، بەرەو میسر هەڵبێت-هەر لەوێیش مرد-و حاجی سولەیمان شاوی گەڕایەوە ناو کەسوکارەکەی لەخاپوور. لەساڵی 1794دا، یەکێك لەخزمانی خۆی کوشتی،[248] و بۆخۆی رزگاری بوو!

[247] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل194.

[248] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل113.



## پەیدابوونی بزاڤی وەهابی:

لەسەردەمی سولەیمان پاشای گەورەدا، بزاڤی وەهابی لەنەجددا پەرەی سەند، و توانی ئەحسا داگیر بکات، و بووبەمایەی هەڕەشە لەسەر عیراق. پێویستە لەسەرمان، لەم بۆنەیەدا، هەندێ باسی سەرەتای ئەم بزاڤەو پرەنسیپە بنچینەییەکانی بکەین.

ناوی بزاڤی وەهابی، لەناوی دامەزرێنەرەکەی شێخ محەممەد کوڕی عەبدولوەهابەوە وەرگیراوە.[249] ئەم پیاوە لە(عینە) کەگوندێکی سەر بەنەجدە، لەدایکبووە لەساڵی 1703دا، و باوکی دادوەری گوندەکە بوو، و لەژینگەیەکی ئاینییدا پەروەردە بووە، و خوێندنی ئایینی لەمەکەو مەدینەو بەسرەدا تەواو کردووە. سەرەتای دەستپێشخەریی نوێکردنەوەی ئایینی، کاتێ لەودا دەرکەوت، کە لەمەدینە سەرقاڵی خوێندن بوو، کەدەیبینی خەڵکی لەگۆڕی پێغەمبەر دەپاڕێنەوە، و نکۆڵی لەوە کردو بەکوفری زانی. کاتێ چوو بۆبەسرە، و کەبینی خەڵکی خەریکی پاڕانەوە لەگۆڕەکانن، بەتوندی رەخنەی لێدەگرتن، و ئەمەیش هەندێکیانی ئاڵۆز

[249] وەهابییەکان خۆیان بەو ناوە رازی نابن، ئەوان بەخۆیان دەڵێن(الموحدین)، و ئێمەیش لەم کتێبەدا، هەر بەو ناوە ناویان دەبەین، کەزیاتر باوە، و لەزۆربەی سەرچاوە مێژووییەکانیشدا، هەر وا ناوی هاتووە.

کردو ئیتر ئەوانیش گوشاریان لەسەر دروست دەکرد، و دواتر لەبەسرە دەریانکرد، و خەریك بوو لەبیابان، لەتینوویەتیدا بخنکێت.

شێخ بڕوای تەواوی بەوە هەبوو، کەپرەنسیپی پاڕانەوەوشەفاعەتی گۆڕ لەگەڵ بڕوای یەکبوونی ئیسلامدا یەکناگرێتەوە، خودا لەقورئاندا دەڵێ(وان المساجد لله فلا تدعوا مع اللّه أحدا)، و لەقورئاندا چەندین ئایەتی دیکە هەیە، ئەو مانایە دەگەیەنن، کەهانی خەڵکی دەدەن، لەخودا بپاڕێنەوەو تەنیا شەفاعەت بەو بکەن، کەواتە بۆچی موسڵمانان سەرپێچی لەقورئان دەکەن!!

شێخ ئەو مەزارانەی کەموسڵمانان راهاتبوون لەسەر پیرۆزکردنیان‌و زیارەت کردنیان، بەو بتانەی دادەنان کەجاهیلییەکان لەجیاتی خودا دەیانپەرست، خەڵکی داوایان لەو بەخاك سپێردراوانەی ناو ئەو مەزارانە دەکرد، لای خودا شەفاعەتیان بۆبکەن‌و لێی نزیك ببنەوە، ئەمەیش بەلای شێخەوە، وەکو ئەوە وابوو کەجاهیلییەکانە بەرامبەر بەبتەکان دەیانکرد.

ئەم بیرۆکەیە مێشکی شێخی گرتبووەوە، تەنانەت وایلێهات لەژیاندا تەنیا یەك مەبەستی هەبوو، ئەویش گێڕانەوەی خەڵکی بوو، بۆخۆڕسکییە سەرەتاییەکانی ئیسلام، کەئەویش خودا پەرستی‌و وازهێنان لەپەرستنی گۆڕو مەزارەکان بوو. دیارە ئەو یەکەمین کەس نەبوو، بیری لەوە کردبێتەوە، پێش ئەویش ئیبن تەیمییە بەر لەپێنج سەدە، هەمان بیری هەبوو، بەڵام جیاوازیی نێوانیان ئەوە بوو، کەئیبن تەیمییە لەژینگەیەکی شارنشینیدا، داوای ئەوەی کردو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام



محەممەد لەژینگەیەکی سارانشینیدا، داوای ئەوەی کردو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا.

شێخ محەممەد لەساڵی 1730دا چوو بۆگوندی(حورەیملە)ی سەر بەنەجد، و لەوێدا بزاڤەکەی خۆی راگەیاند، و هەندێ پشتگیرییان لێکردو هەندێکی دیکەیش بەرپەرچیان دایەوە، و خەڵکی ئەو شوێنە بوون بەدوو بەشی دژبەیەکدی، و ئەگەر لەو گوندە راینەکردایە بۆزێدی خۆی(عینە)، ئەوا نەیارەکانی دەیانکوشت، و لەوێ ئەمیری عینە، عوسمان کوڕی حەمەد پشتی گرت‌و جەوهەرەی خوشکی خۆی لێ مارەبڕی.

شێخ محەممەد بەکردەوە بیروباوەڕی خۆی لەو گوندەدا پیادەکرد، و فرمانی دا ئەو درەختانە ببڕن، کەبەلای خەڵکەوە پیرۆزبوون، و وبۆخۆی چوو بەتەورێك ئەو درەختە سەرەکییە ببڕێتەوە، کەلەوانی دیکە پیرۆزتر بوو. دواتر رووی کردە مەزارێکی هەرە پیرۆز لەنەجد کەگۆڕی زەیدی کوڕی خەتاب-برای جێنشینی دووەم عومەر-ی لێبوو، کەلەشەڕی(الردة)دا لەوی کوژرابوو، شێخ بەشەش سەد کەس لەهەوادارانیەوە ویستی ئەو مەزارە بڕوخێنێت، خەڵکی گوندەکە دەرچوون بۆئەوەی رێگەی لێبگرن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، و شێخ بەنوێڵ دەستی کرد بەرووخاندنی مەزارەکە. خەڵکەکە پێیان وابوو، شەو بەهۆی ئەو دەستدرێژیکردنەیەوە، بۆسەر ئەو مەزارە پیرۆزە، تووشی بەڵایەك دەبێت، بەڵام رۆژی دواتر بینیان، کەلەشساغە.[250]

[250] عەبدوڵڵا فیلبی(تأریخ نجد وتأریخ الشیخ محمد بن عبدالوهاب السلفیة)-وەرگێڕانی عومەر دیراوی-بەیرووت-ل37.

## هاوپەیمانی لەگەڵ ئیبن سعوود:

لەساڵی 1745دا، محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب لەگەڵ ئەمیری حورەیملەدا تێکچوو، و ئەو گوندەی بەجێهێشت و پەنای بردە بەر گوندی(درعییە)کە محەممەد کوڕی سعوود ئەمیری بوو. وەهابییەکان ئەو کۆچکردنەی ئەو وەکو کۆچکردنەکەی پێغەمبەر لەمەکەوە بۆمەدینە لێکدەدەنەوە.

شێخ محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب لەگەڵ محەممەد کوڕی سعوودا پەیمانیان بەست، کەیەکبن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو داوا نوێیەو دوژمنانی لەناوببەن، و ئەمە راگەیاندنی وەرچەرخان بوو، لەگۆڕینی داواکە، لەرەوشی ئاشتییەوە بۆ رەوشی شەڕ.

شێخ محەممەد پرەنسیپی جیهادی پیرۆزی خستبووە مێشکی لایەنگرەکانی خۆیەوە، بەوەی یەکێکە لەفەرزە ئایینییەکان، و بەمەیش پەنجەی خستە سەر خاڵێکی هەستیار لەکۆمەڵگەی سارانشینیدا، کەئەویش داگیرکاری و دەستکەوت بوو، و هۆزەکان بەلێشاو دەچوونە ریزی ئەوبزاڤە نوێیەوە، و هەر سەرکەوتنێکی ئەو بزاڤە، لەشەڕەکانیدا بەدەستی بهێنایە، دەبووە هۆی ئەوەی ژمارەی هەوادارانی زیاتر ببێت، و زیاتر خولیای بن.



ئەوەی لێرەدا، شایانی ئاماژە پێکردنە، ئەوەیە نکۆڵی کردن لەبیروباوەڕی شەفاعەت و بەکوفر زانینی، هۆکارێکی گرنگ بوو بۆسەرکەوتنی، ئەو رێگەی بەهەوادارانی دابوو، بۆداگیرکردنی سەرپێچیکەران، بەوەی شەریك بۆخودا دەدۆزنەوە، و خوێن، و سامان و ژنەکانیانی حەڵاڵ کرد. جگە لەوەی سارانشینان خۆبەخۆ، بەپێچەوانەی شارنشینانەوە، بڕوایان بەشەفاعەت نییە، ئەوان لەسەر ئەوە رانەهاتوون لەژیانی کۆمەڵایەتییاندا، پشت بەناوەندیار ببەستن، و بەپێچەوانەی شارنشینانەوە، فەرمانڕەوای ستەمکاریان نییە، و بۆیە بەلای ئەوانەوە ئاسان بوو لەپرەنسیپی وەهابی تێبگەن، لەنکۆڵی کردن لەشەفاعەت، و بەئاسانی بەدەمییەوە بچن. رەنگە هەر ئەمە بووبێتە هۆی ئەوەی بزاڤی وەهابی بەئاسانی، لەنێوان سارانشیناندا بڵاوببێتەوە، و لەناو شارنشیناندا بڵاونەبێتەوە. تاکی شارنشین، کەراهاتووە لەسەر شەفاعەت، لەپەیوەندییەکانی لەگەڵ فەرمانرەوایانیدا، ناتوانێت لەگەڵ خودایشدا، دەستی لێهەڵبگرێت. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین، زۆربەی بیروباوەڕو سرووتەکانی نێوان خەڵکی، رەنگدانەوەی دابونەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانە، و دواتر پیاوانی ئایینی دێن و پشتگیریی لەخەڵکەکە دەکەن، لەوەی بڕوایان پێی هەیەو ئەوەی ئەنجامی دەدەن.

## لەنێوان باشیو خراپیدا :

ئیبن سەنەدی بەسری، سەبارەت بەبزاڤی وەهابی-کەخۆی هاوچەرخی بوو- دەڵێت:( لەباشییەکانی وەهابییەکان ئەوەبوو، بیدعەیان نەهێشتو لەناویان برد. هەروەها یەکێکی دیکە لەباشییەکانیان ئەوەبوو ئاسایشی ئەو سامانانەیان دابین دەکرد کەخاوەنی بوونایە، و کەسێك هەرچی هەبوایە، بەبێ ترس دەیتوانی لەسەر گوێدرێژێك بەتەنیا بیگوێزێتەوە، بەتایبەتی لەنێوان مەکەو مەدینەدا. رێگەیان نەدەدا، عەرەبە خێڵەکییەکان یەکدی داگیر بکەن، و هەموویان وایان لێهات-لەحەزرەمۆتەوە تا شام- هەروەکو بڵێیت بران و بەرەی پیاوێکن، و ئەوەیش بەهۆی توندبوونیان لەسزادانی بکوژو دزو چەتەدا بوو،، بەجۆرێ کەخراپەکاری لەسەردەمی ئیبن سعووددا نەما، و رەوشتی عەرەبە خێڵەکییەکان، لەدڕندەییەوە گۆڕا بۆمرۆدۆستانە... هەروەکو بڵێی دابین کردنی ئاسایشی رێگاوبان، یەکێك بێت لەپایەکانی ئایین. ئەوان پێیان وابوو، ئەگەر بکوژو دزو چەتە نەمێنێت، چی رێگە لەوە دەگرێت سەرقاڵی کشتوکاڵو بازرگانی یان بەخێوکردنی مەڕو مالات بن، لەسارای بەپیتدا، بۆئەوەی سوود لەشیرو خوریو پێستەکانیان ببینن، و ئەگەر سەرقاڵی کەسابەتی حەلاڵ بن، ئیتر لەبیری دزیو چەتەگەریو کوشتندا نابن، واتە ئەگەر ئاسایش سەقامگیر ببێت ئەوا دزیو کوشتن نامێنێت، چونکە سەرقاڵی



بژێویی حەلاڵ دەبن، بەلام ئەمە دووسەرەیە، و ئەگەر وەهابییەکان هەڵگری ئەو چەمکە نەبوونایە، واتە چەمکی بەکافردانانی نەیارەکانی خۆیان، ئەوا دەیانتوانی دەست بگرن بەسەر هەموو ولاتانی ئیسلامداو بەئارەزووی خۆیان، بێنە ژێر رکێفیانەوە، بەلام بەهۆی ئەم چەمکەوە، نەتەوەکان بێزاربوون لەدەستیان و دەوڵەتانیش بەسەریاندا زاڵ بوون...[251].

ئەم وتەیەی ئیبن سەنەد هێناویەتییەوە، خۆی شیکارییەکی کۆمەلایەتیی خراپ نییە، بەلام دەتوانین لەدوو رووەوە، لەسەری بدوێین: یەکەم ئەوەی چەمکی بەکافرزانین بەلای وەهابییەکانەوە، بەهۆکاری شکستو بێزاربوونی نەتەوەکان لێیان دادەنێت، و ئەوە فەرامۆش دەکات کەهەر ئەم چەمکە پاساوێك بوو بۆشەرعییەتدان بەشەڕکردن لەگەڵ نەیارەکانیاندا-هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد- و ئەگەر ئەوە نەبوایە، ئەوا خێڵەکان بەلێشاو نەدەچوونە ریزی ئەو بزاڤەوە، و بەوجۆرە مشووریان نەدەخوارد.

لەلایەکی دیکەوە، ئیبن سەنەد دەڵێت، توندیی وەهابییەکان لەسزادانی دزو چەتەو بکوژدا، بووە هۆی ئەوەی ئاسایشی رێگاوبان لەبیاباندا دابین بکرێت. ئەم بۆچوونە تارادەیەك راستە، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە دەتوانین بڵێین کەتوندیی لەسزادانداندا، بەتەنیا کاریگەریی نابێت، چونکە سارانشینەکان کەرۆشنبیریی کۆمەلایەتییان هەر لەمێژەوە،

[251] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل81-82.

لەسەر بنەمای داگیرکردن و دزی دانراوە، ناتوانن دەستی لێهەڵبگرن، ئەگەر بوارێکی دیکەیان بۆنەڕەخسێت، بۆئەوی بەجۆرێ لەجۆرەکان، شوێنی ئەوەیان بۆبگرێتەوە.

لەراستیدا، بزاڤی وەهابی زیاتر لەوەی پێشتر لەسەری راهاتبوون، سارانشینانی سەرقاڵی دەستکەوتی شەڕ کرد، بواری داگیرکردنی وڵاتانی دەوروبەری بۆرەخساندن، لەبری ئەوەی یەکدی داگیر بکەن، پەلاماری ئەو وڵاتانەیان دەدا، و شتی وایان دەستکەوت دەبوو، کەلەشەڕەکانی پێشویاندا، خەونیشیان پێوە نەدەبینی، ئەمە جگە لەودەستکەوتانەی لەبەهشت چاوەروانیان دەکات.

سارانشینان بەگشتی ناتوانن دەست لەنەریتی چەتەیی و داگیرکاری هەڵبگرن، مادامێك سارانشینن، بەڵام ئەو نەریتە لەشێوازێکەوە، بۆشێوازێکی دیکە دەگۆڕێت!.



## کاریگەریی بزاڤەکە لەعیراقدا:

ئەمیر محەممەد کوڕی سعوود، لەساڵی 1765دا کۆچی دوایی کرد، و کوڕە گەورەکەی عەبدولعەزیز شوێنی گرتەوە، و ئەمیش لەسەر رەوتی باوکی رۆیشت، لەهاوپەیمانی و هاوکاری لەگەڵ شێخ محەممەد کوڕی عەبدولوەهاب، بۆبڵاوکردنەوەی بزاڤە نوێکە بەزەبری شمشێر، و ئەم رەوشە سەرکەوتنی جۆراوجۆری بەدەست هێنا، و کردی بەسەروەری بیابان.

لەساڵی 1790وە، وەهابی وەکو مەترسییەك هەڕەشەی لەعیراق دەکرد، و لەسنووری ناوچەی بیابانەوە، چەند تاقمێکی وەهابی پەیدا بوون، و مۆری تایبەتیان بەحوشترەکانیانەوە دەنا، کەئارمی ئایینیی سەیریان پێوەبوو، و پەلاماری لەوەرگەکانی زوفەیرومونتەفیق و شامییەیان دەدا. هەروەها هەڵگرانی بیری وەهابی دزەیان دەکردە ناو عیراقەوە، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی بزاڤەکە، لەناو خێڵ و شارەکاندا، و سەردانی دیوەخانی شێخەکانیان دەکرد لەفوراتدا، بۆئەوەی وتار بخوێننەوە و ئەو دوژمنایەتییانە ، کەلەناو خێڵەکاندا هەبوو، دژی حکومەتی عوسمانی و والیی بەغدا بقۆزنەوە.[252]

لەشارەکاندا، پرۆپاگەندەی بزاڤی وەهابی تادەهات زیاتر بڵاودەبووەوە، و کاریگەریی لەسەر خەڵکی، بەتایبەتیی پیاوە ئایینییە سوننییەکان هەبوو، و مشتومڕ لەنێوانیاندا پەیدا بوو، هەندێك پێیان

[252] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل211.

وابوو، بزاڤی وەهابی پاككردنەوەی ئیسلامە لەبیدعە نوێكانو گەڕانەوەیە بـۆ پێشـینانی پیاوچـاكو خۆشـیان ویسـت،و هەشـبوو دژبـە گـەورەیی پیاوچاكانو كەراماتیان لەقەڵەمیان دەدا،و ڕەتیان كردەوە.

مێژوونووسـی موسـڵاوی یاسـین ئەفەنـدی ئەلعومـەری، لـەزاری دادوەرێكی سەردەمی خۆیەوە دەگێڕێتەوە، كەبیروباوەری سەلەفیی خۆی نەدەشاردەوە، ئەویش مەلا محەممەد كوڕی مەلا ئەحمەدی موسڵی ناسراو بـە ئیبن كولـە بـوو، ئـەم پیـاوە لەدیاربـەكر دادوەربـوو، دواتـر گوێزرایـەوە بۆبەغدا، لەسالّی 1794،وكـاتێ بەموسـڵدا ڕەتـدەبێت، بەمەبەسـتی هـاتن بۆبەغدا، سـەردانی دیوەخـانی بنەماڵـەی جـەلیلی دەكات،و لـەوێ نكـۆڵیی لەرەتكردنـەوەی شـێخ عەبـدولقادرو شـێخ محێـدینی عـەرەبی ناكـات،و دەیگوت: ئەگەر سەندووقەكەی شێخ عەبدولقادری دەست بكەوێت ئاگری تێبەردەداو قاوەی لەسەری لێدەنا. یاسین ئەلعومـەری لـەو بـارەوە دەڵێت، ئەگەر ئەم پیاوە بچێت بۆبەغدا، ئەوا شێخ عەبدولقادر دەریدەكات،و ئەگـەر ڕووی لـەرۆم كـرد ئـەوا شـێخ محێـدین دەیگرێـتو ڕەنگـە بیكوژێـت، یـان بیگێڕێتـەوە بۆسـەردەمی هـەژاریو لاوازی خـۆی. پێشـبینییەكەی ئەلعومـەری بـەكردەوە هاتـەدی، دوومـانگ بەسـەر نیشـتەجێ بـوونی ئـەم دادوەرە لەبەغـدا ڕەتنـەبووبوو، كەسـولەیمان پاشـا والـی بەغـدا دووری خستەوە( بەترسو دڵەراوكێوە ئەوێی بەجێهێشت...و ڕووی لـەولاتی رۆم كردو لەوێ تڕۆبوو).[253]

[253] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل35–36.



## سەرەتای دوژمنایەتی لەگەڵ دەوڵەتدا :

لەسـاڵی 1796دا، هـەواڵ گەیشـتە بەغـدا، كەئـەمیر عەبدولعـەزیز كوڕی سعوود باشووری ناوچەی ئەحسای نزیكی عیراقی داگیركردووە،و قـەتیفو عـەقیری گرتـووە، تاگەیشـتۆتە كـەناری كەنـداو،و گوایـا لـەكاتی داگیركردنـی ئـەو ناوچـانەدا، نزیكـەی دوو سـەد زانـای تیـادا كوشتووە.[254] لەلایەكی دیكەوە، ئیبن سعوود بووبە هەڕەشە لەسەر ڕێگـەی حـەج، ئەمـەیش وای لەشـەریفی مەكـە كـرد، داوای یارمـەتی لەسـوڵتان بكـات،و سـوڵتانیش داوای لەسـولەیمان پاشـای والـی بەغـدا كـرد، بۆتەمێكردنی یاخیبووان بەهێزەوە ڕوو لەوناوچەیە بكات.

دیـارە لـەو سـەردەمەدا، سـولەیمان پاشـا بەدەسـتی پیرییـەوە دەینالاند،و دەڵـێن ماوەیـەك بـەر لـەوە داوای لەسـوڵتان كردبـوو، لەسـەر دەست لـەكار كێشانەوەی، ڕەزامەنـدی پیشـان بـدات، بـەڵام سـوڵتان ڕازی نـەبووە. والـی لەسـاڵی 1797دا، ناچـاربوو داوا لەسـوەینیی شـێخی مونتـەفیق–دوای ئـەوەی ئاشـتی كـردەوەو ڕازی كـرد–كـرد، بۆشـەڕی وەهابییـەكان بكەوێتـەڕێ،و فرمـانی دا چـەكدارانی بەسرە كـەبلوچ بـوون، لەگـەڵ پێـنج تۆپـدا دوای بكـەون. سـوەینی ڕووی لەئەحسـا كـرد لەگـەڵ خێڵـەكانی مونتـەفیقو عـەقیلو زوفـەیرو بـەنی خالیـدو ...هتـد. بـەڵام هـەر لەگەڵ هێزەكەیـدا، گەیشتە(عین الشیبك) ڕەشپێستێك بـەناوی (توعـەیس)

[254] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل121.

لەخێوەتەکەیدا، پەلاماری داو بەدەم ئەڵڵاهوئەکبەرەوە، خەنجەرەکەی کرد بەسینگیدا!.

هەرکە هەواڵی مردنی سوەینی لەناو ئەوخێڵانەدا بڵاوبووەوە، کە لەگەڵیدا بوون، لەترسانا هەموو بڵاوەیان لێکرد، و وەهابییەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستەوەو دایان بەسەریاندا، و دەستییان کرد بەکوشتن و بڕین و دەستیان گرت بەسەر تۆپەکانیاندا، و مەڕوماڵات و تفاقێکی زۆریان بەتاڵان برد.

والی سولەیمان پاشاچاوەڕوانی وەها گورزێکی کوشندەی نەدەکرد، کەبەری بکەوێت، و ڕەنگە، بزاڤی وەهابی بەسووك تەماشا کردبێت، و وایزانیبێت لەناوبردنیان پێویستی بەماندووبوونێکی زۆر نەبێت، بەڵام دواتر بۆی دەرکەوت، کەگەورەترە لەوەی مەزەندەی دەکرد.

هێشتا چەند مانگێك بەسەر ئەو شکستەدا ڕەتنەبووبوو، تاسعوود کوڕی عەبدولعەزیز پەلاماری گوندی(أم العباس)ی نزیکی(سوق الشيوخ)داو ژمارەیەکی زۆری لەدانیشتوانی گوندەکە کوشت، دواتر دای بەسەر کانیی بەناوبانگی(اڵبیچ) دا لەنزیکی سەماوە، کەچەندین خێڵی وەکو شەمەرو زوفەیرو ئال بوعەیج و زەقاریت، لەدەوری کۆبووبوونەوە، و لەناو ماڵەکانیاندا پەلاماریدان و هەرچی حوشترو تفاقیان هەبوو، هەمووی برد، هەروەها ژمارەیەك لەسوارەکانیانی کوشت، کەموتڵەق کوڕی محەممەد جەرباء سەرۆکی خێڵی شەمر یەکێکیان بوو.[255]

[255] سەرچاوەی پێشوو، ب6 ل123–126.



## شەڕی ئەحسا

والی بایەخی بەنیارەکە دا، هێزێکی گەورەی پێکەوە نا بەسەرکردایەتیی کەهییە[256] عەلی پاشا، بۆهێرش کردنە سەر وەهابییەکان. عەلی پاشا هاوینی ساڵی 1798ی لەئامادەکردنی ئەو هێزەدا بەسەربرد، و نزیکەی پێنج هەزار ئینکشاری و تۆپی زۆرو ژمارەیەك لە خێڵەکانی عەقیل و عوبێد و شەمەرو مونتەفیق و قەشعەم و زوفەیرو...هتدی کۆکردەوە، هەروەها پێنج هەزار تفەنگی لەنەجدییەکان بەکرێ وەرگرت، و کاتێ گەیشتە زوبێر، خەڵکێکی زۆری ئەوشارۆچکەیەیش دوای کەوتن.

بەراستی هێرشێکی گەورەبوو، تەنانەت دەگێڕنەوە، کەهەژدە هەزار ئەسپ و دەهەزار حوشتریشی کۆکردبووەوە، بەڵام ئەم گەورەییە، بەکەڵکی نەهات لەبیاباندا، و ڕەنگە بووبێتە کێشەیەکی گەورە بۆی. کاتێ هێزەکە گەیشتە هەردوو قەڵای(الهفوف)و (المبرز) نیشانەی شکستی تیادا دەرکەوت، تۆپەکان نەیانتوانی دیواری ئەو دوو قەڵایە بڕوخێنن، بۆیە

[256] کەهییە زاراوەیەکی وەرگیراوە لە(کد خدا) ی فارسییەوەو لەسەردەمی مەمالیکدا، بەمانای والی و جێبەجێکەری فرمانەکانی و سەرکردەی هێزەکانی بوو، و لەوسەردەمەدا، پلەکەی هەندێ لەخوار پلەی والییەوە بوو. و گەلێ جار وشەی کەهییە، لەزاراوەی عیراقیدا، بەکەخییە یان چەخییە دێت.(فارسەکان بەریش سپی یان کوێخای گوند دەڵێن کەد خودا"کد خدا"–وەرگێڕ–).

بەنوێڵ تێیکەوتن، و سوودی نەبوو، و حوشترەکان لاواز بوون، و سەربازەکان بێزار بوون، و زۆربەیان داوای گەڕانەوەیان دەکرد، و دەیانگوت شەڕکردن سوودی نییە.[257]

لەو کاتە ناسکەدا، سعوود نامەیەکی بۆعەلی پاشا نارد، داوای ئاشتی لێکرد، کەلێرەدا ئەو نامەیە بڵاو دەکەینەوە، کەچەندە نامەیەکی سادەیە:

(لەسعوود عەبدولعەزیزەوە بۆ عەلی، نەمانزانی هۆی هاتنتان بۆ حەسا چی بوو، و بەچ نیازێك هاتوون، بەڵام خەڵکی حەسا چەتوون و نەفرەت لێکراون، و ئێمە بەزەبری شمشێر کردوومانن بەموسڵمان، و ئێستا گوندەو لەسنووری دەسەڵاتی رۆمدا نییەو لەئێوەوە دوورەو لەماندوو بوون بەولاوە، شتێکیان لێهەڵناکرێنن، و ئەگەر هەموو خەڵکی حەسا و دەوروبەری، چەند درهەمێکتان بدەنێ ناگات بەو هەموو خەرجییەی کەلەم گەشتەتاندا کردووتانە، و پێشتر هیچ لەنێوانماندا نەبووە، تەنیا سوەینی نەبێت، ئەویش دەستدرێژی کردە سەرمان و بەسزای خۆی گەیشت، و ئێستا بەنیازی ئاشتیین، کەبۆهەردوولامان باشترە، و ئاشتی سەروەری هەموو بڕیارەکانە).

دوای چەندین نامەگۆڕینەو دانوستان، هەردوولا لەسەر ئاشتی رێکەوتن، و لەمانگی تەمموزی ساڵی 1799دا، هێزەکە گەڕایەوە بۆبەغدا.

[257] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل213.



تەنیا بەڕێوەبردنی رێوڕەسمی مۆرکردنی رێکەوتننامەکە مابوو، ئیبن سعوود لەلایەن خۆیەوە، پیاوێکی نارد بۆبەغدا، بۆئەوەی بەنوێنەرایەتیی خۆی رێکەوتننامەکە مۆربکات. لەوێ رووداوێکی سەیر رووی دا، کەبەغدا هێنایە پێکەنین: سەرایان رازاندەوە، لەپێناوی پێشوازیکردن لەنوێنەری سعوودیدا، و والی و پاسەوانەکانی هەرچی جلی رەسمیی جوان هەبوو لەبەریان کرد، و سەربازەکان بەمەبەستی پێشوازیی ریزیان بەست، بەڵام لەپڕ بینییان پیاوێکی سارانشین بەجلی شڕەوە، هەنگاوی خێرا دەنێت، و کاتێ هاتە ژوورەوە بایەخی بەو پاشایانە نەدا کەئامادەبوون بۆپێشوازی کردنی، بەڵکو لەبەردەم والیدا بەچیچکەوە دانیشت، و پارچە کاغەزێکی چڵکنی دەرهێناو بەزاراوەی نەجدی، وتارێکی وشك و پووچی خوێندەوە.[258]

[258] سەرچاوەی پێشوو، ل214.

## دووبارەبوونەوەی کێشەکە :

ئاشتیی نێوان هەردوولا هێندە درێژەی نەکێشا، هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر مۆرکردنی پەیمانی ئاشتییدا رەتنەبووبوو، کەرووداوێك هەڵیوەشاندەوە، و پوختەی رووداوەکە وەکو ئەوەی مێژوونووس یاسین ئەلعومەری دەیگێڕێتەوە، ئەوەیە کە کاروانێك لەسارانشینانی نەجد، بەپاسەوانیی سوارەکانی سەر بەئیبن سعوود دێن بۆعیراق، و کاروانەکە دەگاتە بەغداو بارەکەی خۆیان دەفرۆشن و پێویستیی خۆیان دەکڕن، و دەگەڕێنەوە، و کاتیٚ کاروانەکە بەنەجەفدا تێدەپەڕێت، لەکاتی گەڕانەوەدا بەرەو دیاری خۆیان، وەهابییەکان دەبینن شێخی خەزاعیل ماچی مەزاری عەلی دەکات، ئەوانیش پەلاماری دەدەن و دەیکوژن، و ئیتر شەڕێکی خوێناویی لەنێوان وەهابییەکان و خەزاعیلدا روودەدات، بۆماوەی سیٚ سەعات، و ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا دەکوژرێت، و حوشترو ئەسپەکانی وەهابییەکان تاڵان دەکەن.[259]

کاتیٚ ئیبن سعوود بەرووداوی نەجەف دەزانێت، داوای خوێنبەها لەوالیی بەغدا دەکات و هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی لێدەکات، کەلەنێوانیاندا بەسترابوو، والی عەبدولعەزیز بەگ شاوی نارد، بۆئەوەی لەگەڵیدا دانوستان بکات، و ئاگاداری بکاتەوە، کەئەوانەی کوژراون

[259] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل53-54.



لەهەردوولا بوونە، وچۆن خەزاعیلەکان لەوەهابییەکانیان کوشتوە، ئاوایش وەهابییەکان لەخەزاعیلییان کوشتووە، بەڵام ئیبن سعوود پێکەنینی بەقسەکانی شاوی هات، لەم بارەوە، و گوتی:(دەبیٚ وەزیر شوکری خودا بکات کەلێی دەگەڕێین دەسەڵاتی بەسەر بەغدادا هەبێت. سوێندبیٚ بەخودا، بەمزوانە دەبینی کەرۆژئاوای فورات بۆئێمە دەبێت و رۆژهەڵاتی بۆئەو). ئیبن سەنەد دەگێڕێتەوە، کەعەبدولعەزیز شاوی لەکاتی مانەوەی لەناو وەهابییەکان، بەمەبەستی دانوستان، کەوتە ژێر کاریگەرییانەوەو چووە سەر رێبازیان.[260]

یەکێك لەهۆکارەکانی شکستی دانوستانەکە، ئەوەبوو وەهابییەکان لێرەو لەویٚ، لەرۆژئاوای فورات دەردەکەوتن، و رێگەیان دەبڕی و دەیاندا بەسەر گوندەکاندا. لەمانگی ئایاری ساڵی 1800دا، کاروانێکیان بڕی کەلەشامەوە دەهات، لەنزیکی شارۆچکەی عانە، و ژمارەیەك لەخەڵکی عانەیان کوشت.[261] یاسین عومەر دەگێڕێتەوە، کەئەوانە داویانە بەسەر خودی شارۆچکەی عانەدا، و هەندیٚ ماڵیان بڕیوە، و چل کەسیان لەدانیشتوانی کوشتوە، دواتر داویانە بەسەر کەبیسەدا، بەڵام خێڵی عوبێد لێیان هاتوونەتە دەست و راویان ناون.[262]

[260] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل72.
[261] یەعقووب سەرکیس(مباحث عراقية)-بەغدا 1948-ب1 ل50.
[262] یاسین عومەری( سەرچاوەی پێشوو) ل57.

## تاعوون و رووداوی کەربەلا:

لەمانگی شوباتی ساڵی 1802دا، تاعوونێکی توند لەبەغدادا بڵاو بووەوە، والی و داروودەستەکەی ناچار بوون، بەرەو خالیس بەغدا بەجێ بهێڵن، بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لەناوچەی نەخۆشییەکە. ئەو کاتە والی تووشی رۆماتیزم بووبوو، و تەمەنی لەهەشتا رەتبووبوو، وهێشتا لەخالیس نەگیرسابووەوە، حەموود سامیری شێخی مونتەفیق ئاگاداری کردەوە، کەهێزێکی وەهابییەکان، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لەرووداوی نەجەف، بەرەو عیراق دێت.

والی لەبارێکی وەهادا نەبوو بتوانێت رووبەرووی ئەومەترسییە ببێتەوە، ئەو نیارەی رووبەرووی کەهییە عەلی پاشا کردەوە، دیاربو کەهییەش لەدڵەوە حەزی بەوە نەدەکرد، لەبەغدا دەرچوو، بەڵام لەدۆرە وەستا، بەبیانووی ئەوەی چاوەڕوانی خێڵەکان دەکات بۆئەوەی پەیوەستی بن، وخەریکبوو درێژە بەرەوتەکەی بدات، تاهەواڵی ئەو کارەساتە گەورەیەی پێگەیشت کەوەهابییەکان بەسەر کەربەلایاندا هێنابوو. کەهییە بەخێرایی هێزەکەی جووڵاند، بەڵام کاتێ گەیشتە ئەو شارە، کار لەکار ترازابوو.[263]

وەسفێکی سەیرمان بەدەست کەوت، بەزاراوەی ناوخۆیی، سەبارەت بەبارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی بەغدا، و کاریگەریی تاعوون

[263] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل216–217.



لەسەری. بازرگانێکی مەسیحی دانیشتووی بەغدا، بەناوی یوسف کوڕی دیمتری موقەدەسی، لەو سەردەمەدا نووسیویەتی. لێرەداو لەبەر گرنگیی ئەو وەسفە بڵاوی دەکەینەوە:

(لەرەمەزان، بەر لەهاتنی کەرەوانی ناوبراو، رێکەوتی شوبات لەوبەر لەبەغدا لەخوار بابی شێخ مەعرووف و بابی کازم، نەخۆشی و درمومەرگی ناگەهان بڵاو بووەوە، و ترس خەڵکی بەغدای گرتەوە، گوایا تاعوونە، و رۆژانە لەوبەر 20 تا25 تا30کەسیان لێ دەمرد. خەڵکێکی زۆر بەرەو چۆڵەوانی رایان کرد، و تەنیا خەڵکێکی کەم لەو بەر مانەوە، لەزۆربوون و کەمبووندا بوون، لەو هەموو بگرەوبەردەیەدا، شتێك تووشی یەهوودی و مەسیحی نەبووەوە. لەسێیەم رۆژی جەژن، لەمانگی زیحەجەی ساڵی 1216دا، هەواڵێك بڵاو بووەوە کەحەزرەتی والی سولەیمان پاشا، بەنیازە دووەم رۆژ بڕوات، و خەڵکی ترسان، و ئەم هەواڵە بیسترابوو، و بازرگانە ناودارە موسڵمانەکان لەبەغدا دەرچوون بەرو گوندەکان، هەندێکیان بەمۆڵەت..هەندێکیان بەبێ مۆڵەت وەرگرتن. وەزیری ناوبراو لەپێنجەم رۆژی جەژندا، خۆی و داروودەستەکەی و خاووخێزان و مەمالیك و ژمێریارەکانی دەرچوون، خەڵکەکە لەوە ترسان. بەمەیش کارەکان پەکیان کەوت. وەزیر تەنیا دوو سەعات رێگە لەبەغداوە دووربوو. لە18ی زیحەجەدا هێزێکی وەهابی، کەژمارەیان نەزانرابوو، گەیشتنە پێگەی حوسێن، کەرۆژە ڕێیەك لەوێوە دوورە...ودەرگاکان کرانەوە و سەربازەکان لەپڕ خۆیان کرد بەناودا...).[264]

[264] یەعقووب سەرکیس(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل50–51.

## باسی رووداوەکە بەدرێژی:

رووداوەکەی کەربەلا لەرۆژی 22ی نیسانی ساڵی 1802ی زاییندا رووی دا، کەرێکەوتی 18ی زیحەجەی ساڵی 1216ی کۆچی بوو. ئەو رۆژە جەژنێکی گەورەی شیعەکانە، بەناوی جەژنی غەدیر،و وەهابییەکان شمشێر بەدەستەوە، لەپڕ رژانە ناو شاری کەربەلاوە،و ، بەبێ گوێدان بەپیرو ژنو منداڵهەرکەسێکیان ببینییایە سەریان دەبڕی.[265]

مێژوونووسان لەسەر ژمارەی کوژراوانی ئەو رۆژە تەبانین، هەندێکیان بەهەشت هەزارو هەندێکیان بەکەمتر لەقەڵەمی دەدەن، دەڵێن وەهابییەکان لەسەر گۆڕی حوسێن، پەنجا کەسیان کوشتووە،و لەناو مەزارەکەدا پێنج سەد کەس،و هەرچییەکیان بەردەست کەوتبێت لەگەڵ خۆیان بردوویانە–لەشتومەکی ناوماڵو دوکانو مەزاری پیرۆز–پڕبەهاترین ئەو شتانەی وەکو دەستکەوت بردوویانە، ئەو خشڵو سەنگە پڕبەهایانە بووە، کە لەمەزاری حوسێندا عەمبار کرابوون،و ویستویانە ئاڵتوونی دیوارەکانی مەزارەکە هەڵبکەنن، بەڵام سەرکەوتوونەبوون.

میرزا ئەبو تالیب خانی گەڕیدەی هیندی–کەدوای رووداوەکە سەردانی کەربەلای کردووە– دەگێڕێتەوە کەخەڵکی، عومەر ئاغای فەرمانداری شارۆچکەکە تاوانبار دەکەن، کەدەستی لەگەڵ وەهابییەکاندا تێکەڵ کردبێت،و ژێر بەژێر نامەی بۆنووسیبن،و بەرگریی لەشارەکەیان

[265] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل215.



نەکردووە، ئەوەی راستی بێت هەر کەهەستی بەمەترسی کرد، بەبێ هیچ بەرگرییەك، بۆگوندێکی نزیکی کەربەلا هەڵهاتووە. دواتر سولەیمان پاشا کوشتی. ئەبو تالیب دەڵێت، لەکەربەلا چاوی بەپووری–کەربەلای بکم–و چەند ژنێکی دەرباری دەکەوێت، کەوەهابییەکان هەموو سامانیانیان بەتاڵان بردبوو،و بەپێی توانایی، یارمەتیدابوون. دواتر ئەبو تالیب دەڵێت، وەهابییەکان پێنج هەزار مرۆڤیان کوشتو دەهەزاریان بریندار کرد...[266].

## پەلاماردانی نەجەف:

وەهابییەکان لەکاتێکدا کەربەلایان بەجێهێشت، کەبەهۆی سەرکەوتنیانو دەستکەوتەکانیانەوە خۆشحاڵ بوون،و دەیانگوت:(ئەگەر لەسەر حەق نەبووینایە، سەرنەدەکەوتین)[267]. دواتر روویان کردە نەجەف، بۆئەوەی هەمان کاری بەسەردا بهێنن، بەڵام لەوەدا سەرکەوتوو نەبوون، چونکە خەڵکی نەجەف خۆیانیان بۆئامادەکردو پیاوانە بەرگرییان لەشارەکەیان کرد. یەکێك لەوانەی بەچاوی خۆی رووداوەکەی نەجەڤ بینیوە، دەڵێت:( کاتێ سعوود هات بۆنەجەف،و دەوری گرتو شەڕە تفەنگ لەهەردوولاوە دەستی پێکرد، پێنج...لەخەڵکی نەجەف کوژران،و زۆر لەسەر خەڵکی نەجەف دەکەوت، ئەگەر بهاتبایەو وەکو کەربەلایان

[266] ئەبو تالیب خان(رحلات في آسيا وأوربا وأفريقيا) ل74. لەزاری ستیڤن لۆنکریکەوە(سەرچاوەی پێشوو) ل 215(پەراوێز).

[267] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل74.

بەسەردا بهێنایە، لەکوشتن و بڕین، یان وەکو ئەوەی بەسەر مەکەو مەدینەیاندا هێنا، بۆیە کەیبانوو و پیرەژنەکان هانی جەنگاوەرانیان دەداو دەچوونە ناویانەوەو دەیانگوت: شەرم ناکەن دەستدرێژی بکرێتە سەر ژنەکانتان و سامانتان زەوت بکەن و ئابڕووتان بچێت. هەموویان لەئەمیری بڕواداران(عەلی) دەپاڕانەوە، و بەگریانەوە روویان کردە خودا، و پەنایان بردە بەر پارێزەری دراوسێ و ئەویش پاراستنی و شکستی بەریاکاران داو پەرتەوازەی کردن، و گورزەکانی بەراشکاوی دەبینرا).[268]

دوای ئەوەی وەهابییەکان لەدەوروبەری نەجەف کشانەوە، خەڵکی نەجەف بەپەلە، گەنجینە بەهادارەکەی مەزاریان گواستەوە بۆکازمییە، لەترسی ئەوەی نەبادا، جارێکی دیکە وەهابییەکان بێنەوەو، دەست بگرن بەسەریدا، وەکو ئەوەی بەسەر گەنجینەکەی حوسێن لەکەربەلادا هێنایان- بەڵام دوای پێنج ساڵ دووبارە وەهابییەکان هاتنەوە بۆ نەجەف-بەڵام بەدەستی بەتاڵ، وەکو جاری پێشوو بەناکامی گەڕانەوە.

[268] جەعفەر مەحبووبە(ماضي النجف وحاضرها)-نەجەف 1958-ب1 ل326.



## کاریگەریی رووداوەکە لەسەر شیعر:

رووداوی کەربەلا کاریگەرییەکی زۆری لەسەر گەلی عیراق هەبوو- بەتایبەتی لەسەر شیعەکان- و کاریگەرییەکەی لەسەر شیعر گەلێ روون بوو. ئیبراهیم وائیلی دەڵێت:(...کارێکی سروشتی بوو، کەئەم رووداوە شاعیرانی شیعە بهەژێنێت، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی دژی شارێك ئەنجام درا کەمەزاری ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی لێیەو مەزارەکە تالان کراو رووخێنراو گەلێکی تیادا کوژرا، کەپیاوانی ئایینی و منداڵ و ژنانیان تیادابوو. شاعیران بۆئەم رووداوە شیعریان دانا، وەکو بڵێی نوێکردنەوەی کارەساتەکەی حوسێن بێت، کەلەگەڵ براو خوشك و کوڕو هەوادارانیدا لەکەربەلا شەهید کرا، و بۆی گریان و رقیان لەوەهابییەکان گەورەتربوو، و هەڕەشەیان لێکردن و مشتومڕیان لەگەڵدا کردن...).[269]

ناودارترینی ئەو شاعیرانەی ئەو رووداوە هەژاندیانی، حاجی هاشم کەعبی و حاجی محەممەد رەزا ئەزری، و دواتر شاعیر حوسێن کوڕی سولەیمان حەکیمی حیللی بوون. هەروەها لەشاعیرە سوننییەکانیش عوسمان کوڕی سەنەدی بەسری، کەوەهابییەکانی بەگومڕا دەزانی، و داوای دەکرد بەگژیدا بچنەوە بەناوی ئایینەوە، چونکە بەپێی ئەو، لەرێگەی راست و گوێڕایەڵی سوڵتان لایان دابوو.

[269] ئیبراهیم وائیلی(الشعر السياسي العراقي في القرن التاسع عشر)-بەغدا 1961-ل 123.

شاعیرێکی عیراقی دیکە هەیە، هەڵوێستێکی دووفاقیی بەرامبەر بەوەهابییەکان وەرگرت، ئەویش سەید عەبدولجەلیل تەباتەبائیی خەڵکی بەسرە بوو، ئەم شاعیرە یەکێك بوو لەبازرگانانی مرواری، و زۆرجار کارەکەی ناچاری دەکرد سەردانی کوێتو ئەحساو بەحرێنو ئەوناوچانە بکات، کەئیبن سعوود داگیری کردبوون. کاتێ لەبەسرە بوایە دژی وەهابییەکان بوو، و کاتێ لەقەڵەمڕەوی ئەواندا بوایە، پشتگیری لێدەکردن. بەهەرحاڵ ئەو تەنیا شاعیری عیراقی بوو کەستایشی بزاڤی وەهابی کردو بەزیندووکەرەوەی ئاییینی دانا و بەشانوباڵی پایەکانیدا هەڵیدەداو بەسەرکوتکەری بیدعەی دادەنا، و بەمەیش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو شاعیرانەدا نەبوو، کەئەو سەردەمە لەگەڵ سعوودییەکاندا بوون. لەساڵی 1810دا، نێردرا بۆلای سعوودی کوڕی عەبدولعەزیز، و لەبەردەمیدا شیعرێکی خوێندەوە، تیایدا ستایشی کرد، و ئەمەیش دوو دێڕ لەو شیعرەیە:

جمعت شتات المكرمات سجية ... فسدت الورى مجدا وفقتهم فخرا
وظاهرت دين اللّه بالبيض والقنا ... وبرهانك القرآن والسيرة الغرا[270]

[270] سەرچاوەی پێشوو، ل141–145.



## کاریگەریی ڕووداوەکە لەسەر ئێران:

کاتێ هەواڵی ڕووداوەکەی کەربەلا بەشا فەتح عەلی قاجار گەیشت، خەفەتێکی زۆری پێ خوارد، و ماتەمینیی لەسەرانسەری ئێراندا ڕاگەیاند، و خۆیو دارودەستەکەی جلی ڕەشیان پۆشی، و لەسەرانسەری ئێراندا ڕێورەسمی ماتەمینی بەڕێوەچوو.

شا نارەزامەندییەکی توندی بۆحکومەتی بەغدا نارد، و ئاسەواری ئەو ڕووداوەی خستە ئەستۆی، و بەکەمتەرخەمیی تاوانباری کردن، لەبەرگریکردن لەکەربەلا، لەکاتێکدا لەنیازی وەهابییەکان ئاگادار بوونە. شابەچەندین وشە، بەراشکاوی ڕوونی کردەوە، کەسوورە لەسەر پێکهێنانی سوپایەکی گەورە، بۆتۆڵەسەندنەوە لەوەهابییەکان، و لەسەر ڕێگەیەوە، پەلاماری بەغدا دەداتو داگیری دەکات. سولەیمانی گەورە ئەو بەئاگاهێنانەوەیەی بەدەست گەیشت، لەکاتێکدا سەری لەگوێی قەبردا دەلەرزی، بۆیە نەیتوانی وەڵامی بداتەوە. بەڵام لەپڕ ڕوسیا پەلاماری سنووری باکووری ئێرانی دا، و تۆڵەسەندنەوەکەی لەبیر بردەوە.[271]

[271] ئەحمەد عەلی سۆڤ(سەرچاوەی پێشوو) ل82.

## داگیرکردنی حیجاز:

دوای رووداوەکەی کەربەلا، وەهابییەکان کەوتنە بیری داگیرکردنی حیجاز،و لەمانگی نیسانی ساڵی 1803دا-واتە ساڵێك دوای رووداوی کەربەلا-توانییان مەکە داگیر بکەن،و لەبەهاری ساڵی دواتردا، مەدینەیان داگیر کردو مزگەوتی پێغەمبەریان وێران کردو هەرچی تیادابوو تالآنیان کرد، کەدیاریی پاشاکانی هیندو میسرو سەلجوقییەکان‌و عوسمانییەکان بوو،[272] دەڵێن سعوود رەوانەی هیندی کردووەو لەوێ فرۆشتوویەتی.[273]

لەوەرزی حەجی ساڵی 1806دا، وەهابییەکان هەندێ لەسرووتەکانی حاجییانییان رەتکردەوەو هەوڵیان دا قەدەغەی بکەن، بەوەی کەبیدعەن‌و بەپێچەوانەی سوننەتەوەن. حاجییە میسری‌و شامییەکان لەگەڵ خۆیاندا پەرچەمیان دەهێنا، سعوود پرسیاری لەسەرپەرشتیاری میسرو شامی حەجی کرد:(ئەم داروتەختانە چییە لەگەڵ خۆتاندا دەیهێنن‌و پیرۆزی دەکەن؟! کاتێ وەڵامیان دایەوە کەئەو

[272] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل94.

[273] یەکێك لەو گەنجینانەی بەتالآن بران، پارچە ئەڵماسێك بوو، کەنرخی گران بووە، بەناوی(الكوكب الدرّي)، بەڵام دواتر لەلایەن ئیبراهیم پاشاوە گێردراوەتەوە، کاتێ بۆشەڕی وەهابییەکان هاتووە بۆحیجاز،و تاشەڕی یەکەمی جیهان لەوێ بووەو دوای ئەوە نەماوە،و شەریف حوسێن، فەخری پاشای سەرکردەی تورکی تاوانبار کردووە بەدزینی-خودا دەزانێت چی بەسەر ئەو ئەڵماسەدا هاتووە!



پەرچەمانە هێمان بۆیەکڕیزیی خەڵکەکە،و نەریتێکی کۆنیانە، پێیانی گوت:( لەمەودوا ئەو کارە مەکەن،و ئەگەر ساڵی داهاتوو لەگەڵ خۆتاندا بیهێنن، دەیانشکێنم). هەروەها گوتی نابی تەپڵ‌و زوڕناو ئەو جۆرە شتانە لەگەڵ خۆتاندا بهێنن، کەکردووتانە بەخوو.

لەوەرزی حەجی داهاتوودا، کاتێ کاروانی حاجییانی شام‌و تورکیا گەیشتنە نزیکی مەدینە، فرمانیان پێدرا، بگەڕێنەوە بۆئەو شوێنەی لێوەی هاتوون. ئەمیری حەجی شام عەبدوڵڵا عەزەم نارەزامەندیی دەربڕی، بەڵام بێ سوود بوو،و حاجییەکان کەشەکەتی حەوت حەفتە رێگە بوون، ناچاربوون بەبێ ئەوەی چاویان بەمەکەو مەدینە بکەوێت بگەڕێنەوە بۆدیمەشق.[274] دەگێڕنەوە ئەوساڵە وەهابییەکان پەرچەمی میسرییان سووتاندووە،و ئاگاداری خەڵکەکەیان کردووە، کەئەوەی ریشی تاشیبێت، بۆی نییە بچێتە ناو دوو حەرەمەکەوە،و لەوکاتەوە، خەڵکی میسرو شام پێیان لەحەج بڕی.[275]

[274] عەبدوڵڵا فیلبی(سەرچاوەی پێشوو) ل118.

[275] حافیز وەهبە(جزيرة العرب في القرن العشرين)-قاهیرە 1946-ل 217.

## ڕێژەی کۆمەڵایەتی:

مێژوونووس ئیبن بیشری نەجدی-کەبۆخۆی ئەو باری نەهامەتییەی بینی کەدانیشتوانی درعییەی پایتەختی وەهابییەکان، بەدەستییەوە دەیانناڵاند، بەرلەوەی بزاڤەکەیان ڕابگەیەنن، و چۆن بارودۆخیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە-دەڵێت:(لەسەرەتادا، نەهامەتییانم بینی، و دواتر لەسەردەمی سعووددا، چۆن گوزەرانیان وەرچەرخانی بەسەردا هات، پارەی زۆر، پیاوی زۆر، چەکی زاخاودراو بەزێڕو زیو، ئەسپی ڕەسەن، جلی نایابو شتومەکی دیکە، کەلەشومارو باسکردن نایەن. ڕۆژێکیان لەشوێنێك کەپێی دەڵێن(الباطن) سەیری بازاڕێکم کرد، پیاوان لەلایەكو ژنان لەلایەکی دیکەوە، و زێڕو زیوو چەكو حوشترو مەڕو ئەسپو جلی نایابو گۆشتو گەنمو هەموو جۆرە خۆراکێکم بینی، و تاچاو بڕی دەکرد هەر بازار بوو، و گوێم لەدەنگی فرۆشیارو کڕیار دەبوو، فرۆشتمو کڕیم، وەکو ئاپوورەی هەنگ بەیەکدا دەچوون.)[276]

دەتوانین بڵێین ئەو خۆشگوزەرانییەی پایتەختی وەهابییەکان بەخۆوەی دەبینی، هەموو پایتەختەکانی دیکەیش، لەسەردەمە جیاوازەکاندا، بەخۆیانەوە دەیانبینی کەداگیرکەر بوون، بەڵام دەبێ ئەوە فەرامۆش نەکەین، ئەو خۆشگوزەرانییە، لەسەر حیسابی کارەساتو

---

[276] ئیبراهیم فەسیح حەیدەری(عنوان المجد في بيان أحوال بغداد والبصرة ونجد)-بەغدا 1962-ل 233.



نەهامەتیی ئەو وڵاتانەوە بوو، کەداگیر دەکران. لێرەدا ڕێژەی کۆمەڵایەتی بەجوانی دەردەکەوێت، ئەوانەی چێژیان لەو خۆشگوزەرانییە وەردەگرت، دەبوا ستایشی ئەو دەوڵەتە بکەن، کەبۆیانی دەستەبەر دەکرد، و بڵێن ئەوە باشترین دەوڵەتە کەخەڵکی دەیبینن، لەکاتێکدا خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکان، بۆچوونێکی دیکەیان لەسەر ئەو دەوڵەتانە هەبوو، بەپێچەوانەوە بەقێزەونترین دەوڵەت لەجیهاندا هەژماریان دەکرد. هەرلایەنەو لەسۆنگەیەکەوە دەیڕوانییە ئەو دەوڵەتە، و بۆچوونی خەڵکیش لەسەرەتای بوونەوە، هەر وەها بووە، و نهێنییەکی گرنگ لەنهێنییەکانی مێژوو، خۆی تیادا حەشارداوە!

# بەشی هەشتەم

## مەمالیك لەدوای سولە یمانی گەورەوە

لەبەشی پێشوودا، سەردەمی کێشمەکێشی یەکەمی سەردەمی مەمالیکمان تاوتوێ کرد، کەئەو ماوەیە لەساڵی 1762وەوە، لەدوای مردنی سولەیمان پاشا(ئەبو لەیلە)وە، بۆماوەی هەژدە ساڵ بەردەوام بوو، و تیایدا مێملێیی لەسەر دەسەڵات، لەنێوان مەمالیکدا توند بوو، و بەبەشداریی دانیشتوانی گەڕەکەکانی بەغدا، و هەوڵ دەدەین لەم بەشەدا، ماوەی دووەمی کێشمەکێشەکە تاوتوێ بکەین، کە لەدوای مردنی سولەیمان پاشای گەورە، لەساڵی 1802وە دەست پێدەکات.

## مشتومڕ لەسەر جێنشینی:

سولەیمانی گەورە، دوای خۆی سێ کوڕی بچووکی بەجێ هێشت، سەعیدو سالحو سادق، و چوار زاوا، عەلی پاشای کەهییەو سەلیم ئاغاو داوود ئاغاو نەسیف ئاغا، و بەر لەمردنی هەموویانی کۆکردەوە- لەگەڵ محەممەد بەگ شاوی کەپلەی(باب العرب)ی هەبوو-و وەسیەتی کرد، دوای خۆی، عەلی پاشای کەهییەی زاوای دەسەڵاتی بەدەستەوە بێتو



لەسەری رێکبکەون، و ئاگاداری کردنەوە کەجیاوازیی وکێشمەکێش لەناو خۆیاندا نەهێڵن، بەپێی گێڕانەوەی یوسف کوڕی دیمتریی مەقدسیی بازرگان، کەبەزاراوەی ناوخۆیی گوتوویەتی، کەلەو سەردەمەدا، لەبەغدادا نیشتەجێ بووە:(ئەگەر یەکدڵ بنو خۆشەویستی لەنێوانتاندا هەبێت، ئەوا بێگانە ناتوانێت زەفەرتان پێبهێنێتو دەوڵەت لەدەستی خۆتاندا دەبێت، بەڵام ئەگەر بەربەرەکانیی یەکترتان کرد، ئەوا وەزیرە نامۆکان دێنو دەوڵەتو خێزانتان لێدەگۆڕن...)[277]

ئەم ئامۆژگاریو بەئاگاهێنانەوەیە سوودی نەبوو. زۆری نەخایاند، دوابەدوای مردنی سولەیمانی گەورە، ئاژاوە بەغدای گرتەوە. لۆنکریك دەڵێت: لەو کاتەدا سولەیمان پاشا گیانی دەدا، یان سەعاتێك بەر لەمردنی، ئەحمەد ئاغای سەرۆکی ئینکشاری دەستپێشخەریی کرد لەکۆکردنەوەی ئەوەی لەتوانایدا بوو، لەخەڵکی بازاڕ، و دەستی گرت بەسەر قەڵاداو خۆی تیادا قایم کرد، سەرای دایە بەرتۆپ، و کاتێ خەڵکی گوێیان لەگرمەی تۆپ بوو، بەپەلە دوکانەکانیان داخست، و شەقامەکان پڕبوون لەچەکدار، و دۆخەکەیش رۆژ دوای رۆژ ئاڵۆزتر دەبوو، و دەرئەنجامیش نادیاربوو.[278]

وادیارە، ئەحمەد ئاغا دەستی تێکەڵ کردبوو لەگەڵ زاوای دووەم سەلیم ئاغادا، دەیویست لەبری عەلی پاشا، کەوالی کۆچکردوو وەسیەتی

---

[277] یەعقووب سەرکیس(مباحث عراقیة)-بەغدا 1948-ب1 ل54.

[278] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)- وەرگێڕانی جەعفەر خەیات-بەغدا1962-ل 220-221.

کردبوو ببێت بەوالی، خۆی شوێنی بگرێتەوە، لەولایشەوە محەممەد بەگ شاوی دەیویست عەلی پاشا ببێت بەوالی. گومانی ئەوە دەکرێت، کەمشتومڕی نێوان ئەم دوو پیاوە، یەکێ لەفاکتەرە گرنگەکانی هەڵگیرسانی ئەم ئاژاوەیە بووبێت.

یوسف مەقدسیی بازرگان، بەزاراوە خۆماڵییەی خۆی، ئەو ئاژاوەیە دەگێڕێتەوەو خۆی شایەتحاڵی بووە، و لێرەدا بەشێکی زۆر لەو وەسفەی بڵاو دەکەینەوە، کەگوزارشت لەبارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمە دەکات:

(...لەرۆژی دووەمدا–واتە دوای مردنی والی سولەیمانی گەورە– لەشاردا جاڕ درا کەعەلی پاشا ئاسایشی شار دەپارێزێت، و دەبێ هەموو کەسێك پابەندی پیشەکەی خۆی بێت، بەڵام یەنگجارییەکان، هەر لەیەکەم سەعاتی مردنی والییەوە، روویان کردە قەڵاو کۆنترۆڵیان کرد، چونکە هەر لەسەردەمی حکومەتی ئاماژە پێکراوەوە، لەدەستیدا بووە، و یەنگجارییەکان رۆڵیان نەبووە، و پێشتریش لەدەستیاندا بووە، و ئێستا دەرفەت رەخساوە بۆئەوەی وەریبگرنەوە. رۆژ دوای رۆژ، خۆپیشاندانیان ئەنجام دەداو زیاتر دەبوون. ئەو نەوەیەی ئاگاداری سەردەمەکانی سەرەتای نەزانی نەبوو، دەیویست بەچەکەوە خۆنمایی بکات، و مەیخۆری دەستی پێکرد، کە لەسەردەمی وەزیری ناوبراودا، سەرخۆشێکت لەسەر شەقامەکاندا نەدەبینی. ئەگەر کەسێك دوژمنایەتیی هەبوایە، تۆڵەی دەسەندەوە، و چیتر گوێیان بەدەسەڵات نەدەدا، و ئەو ئەحمەد ئاغایەی



شەوو رۆژ بەوڵاتدا دەگەڕا، زۆرجار بەخۆگۆڕین، و زۆرجار وەکو خۆی، بۆزەمینە خۆشکردن بۆئاژاوە...

(دووەم رۆژیش هەتا بەیانیی پێنجشەممەی 19ی جەمادیی رێکەوتی 4ی ئەیلوول، دەرکەوت کەئەوان عەلی کەهییەیان ناوێت، چونکە چەند رەفتارێکیان لێبینی، بەمەبەستی گرتنی قەڵاکە، وشتەکە بەو شێوەیە نەبوو، بەڵام لەهەمان رۆژدا، گوتیان کەئاغای ناوبراو لەکەهییە پاشا توڕەبوو، ئەویش لای ئەو دەرچوو، و ئیتر هەموو وڵات وروژا، و یەنگجارییەکانی مەیدان و شۆریجە و لاتولووتەکانی بەغدا، کەوەستای تاڵان و بڕین بوون، و چەند رۆژێك بوو چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد، هەموویان دوای کەوتن، بەڵام گەڕەکی شێخ و گەڕەکەکانی دەروازەی ناوەراست دوای نەکەوتن، هەزار بەهەزار بەلای سەرادا رەتدەبوون، و لەهەمموولایەکدا سەنگەریان لێدا، و لەدوای نیوەڕۆوە تابەیانی بەتفەنگ و بەتۆپ بەربوونە گیانی یەکدی، لەقەڵاوە بەسەر سەرادا، وئەوانیش لەسەنگەرەکانی سەراوە وەڵامیان دەدانەوە.

(بەیانیی رۆژی هەینی سەلیم بەگ وەکو قایمقام هات و لەسەرادا دایاننا، و بانگەوازیان بۆکرد، بەڵام بازاڕەکان و زۆربەی خاوەن دوکانەکان، لەترسی تاڵان سامانەکانیان برد بۆخانەکان. لەم سێ شەوەدا، یەنگجەرییەکان بەشەو دەستدرێژییان کردە سەر مەسیحی و جوولەکەکان، لەپێناوی پارەدا، و توانیان پارە لەهەندێکیان وەربگرن.

(بەیانیی رۆژی شەممە، هەموو خەڵکەکە چۆڵیان کرد، تەنیا ئەو دوو گەڕەکە ناوبراوە نەبێت، و ئاغای ناوبراو خۆی توڕە کرد، کەدەیەوێت

کەهییە بەگو محەممەد بەگ بکوژێتوماڵیان تاڵان بکات، بەر لەعەسر، شەڕ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، و تۆپبارانیش لەقەڵاوە بەسەر سەرادا دەستی پێکرد، و تاشەویش داهات، هەر شەڕ بەردەوام بوو. بەڵام یەنگجەرییەکانو هەوادارانیان دەرفەتیان بۆرەخسا، هێشتا شەڕ لەمەیداندا بەردەوام بوو، دەستیان کرد بەتاڵان کردنی دوکانەکان، دوکان نەما لەو هەموو دوکانەی ئەوناوە کەلەژمارەکردن نەدەهاتن، نەشکێنرێتو تاڵان نەکرێتو تەنانەت قوفڵەکانیشیان بەتاڵان برد.

(بەڵام محەممەد بەگ، لەبەری کەرخەوە، ئەحزەری کەهییە عەلی پاشای نارد بۆلای، لەکەشتییەك لەدەریاچەوە، و پێیگووت مەترسە، و فرمانی بەعەکیلو عەرەبی جبوور دا بەشەو چوونە ناو کەشتییەکانەوەو هاواریان کرد: لەچاوی تۆ ئەی عەلی پاشا! و لەگەڵ تاقمێك لەکۆسەکاندا پەلاماری سەنگەرەکانیان دا، بەشێك لەوبازاڕەی دەچێتەوە سەر مەیدانیان سووتاند، بۆئەوەی لەدوکانەکانەوە، کەمینیان بۆدانەنێن، و بەئاگرەوە پەلاماریان دا، و ئەوانەی لەپێشەوەی کەمینەکاندا بوون، لەترسی ئاگرەکە هەڵهاتن، و ئەوانیش دوایان کەوتنو هاواریان دەکرد بەسەریاندا، تادڵیان داکەوت لەکاتێکدا شمشێرەکانیان بەدەستەوە بوو، ئەو چەند هەزارە بڵاوەیان لێکرد، لەپێشی هەموویانەوە ئاغا هەڵهاتو خۆی شاردەوە، هێشتا تۆپەکان لەقەڵاوە تۆپبارانیان دەکرد، چونکە هێشتا کۆمەڵێ لەیەنگجەرییەکان مابوون، بەکۆسە حوسێنی سەرۆکیانەوە، کەپیاوێکی بازرگان بوو، گەلێ خۆی بەزل دەزانی.



(دوای نیوەڕۆ، زانایانو موفتی لەگەڵیاندا، سنجق–واتە پەرچەمی شێخ عەبدولقادر–یان هەڵگرتو بەرەو قەڵا ڕۆیشتن، چونکە ئەوان بەوکارەی ئاغاو دارودەستەکەی رازی نەبوونو گوتیان:هەرکەسێك یارمەتیی ئاغا بدات لەلادانەکەی، ئەوە کوفری کردووە، چونکە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانڕەوا ئەرکە. کاتێ لەقەڵاکەوە بینییانن، و ئەو تاقمەیان بینی کەعەکیل تاروماریان کردن، گەلێ ترسان. سەربازەکانو عەکیلییەکان لەبەردەم دەروازەی قەڵاکەدا کۆبوونەوە، ودەرگا بچووکەکەیان دایەبەر تۆپ، و کردیانەوەو چوونەوە ناوەوە، و ئەوانەی لەوێدابوون، لەدیوارەکانەوە خۆیان فڕێدایە خوارەوە، و هەندێکیان خۆیان فڕیدایە ناو ئاوەکەوەو، یان بۆسەر زەوی، و هەندێکیان خۆیان دابەدەستەوە، و ئەوانی دیکەیش بۆی دەرچوون.

(بەیانی ئەمڕۆ یەکشەممە، بەر لەسپێدە، دوای ئەوەی عەرەبەکان ئەو کۆمەڵەیان شکاند، تاقمێکیان هەڵیانکوتایە سەر گەڕەکی جوولەکەکانو چەند ماڵێکی جوولەکەیان تاڵان کرد، بەڵام هاوارێکی گەورە رووی دا. بەڵام کەهییە عەلی پاشا، لەوبەر گەڕایەوەو لەسەراکەیدا دانیشت...ئەوسا فرمانی دا بڕۆن ماڵەکەی تاڵان بکەن–واتە ماڵی ئەحمەد ئاغا–تەنیا لەماوەی یەك سەعاتدا، ماڵەکەی بوو بەوێرانە، و ژنەکانی هەڵهاتن، و سەربازەکان لەماڵەکەی کەنیزەکانیان گرت، و دەستیان گرت بەسەر پارەو پووڵیدا. لەوڵاتدا جاڕ درا: هەرکەسێ ئەو ستەمکارە بگرێتو بیهێنێت، و هەواڵی لەسەر بدات،ئەوا بەهەزار زێڕ خەڵات دەکرێت. دواتر

کەسوکارو هەوادارانی گرت. رۆژی دوایی بەیانی دووشەممە، لەکاتێکدا جارچی جاری دەدا، یەکێك لەمەمالیکیان بینی کۆیلەیەکی رەشپێستی هەیە، بردیان بۆسەرا، و فرمانی دا لێیبدەن، دانی بەوەدا نا لەماڵێکدایە لە(رأس القریة)، هاتن و لەماڵێکدا کەهەواداری بوون، دەریانهێنا. تا هەر ستەمکارێك پەندی لێوەربگرێت، چونکە تەنیا بینینی کەپەلکێشی دەکەن، خۆی دەبێتە پەندێك بۆهەر ستەمکارێك، و بەپێی پەتی و سەری رووتەوە، وەکو مردوو هەڵیانگرت، کەخەڵکێکی زۆر بەرودوایان گرتبوو، کاتێ گەیشتنە بەردەم عەلی پاشا، لەسەرا، بەدەستی خۆی دوانی پیاکێشا، و بڕیاری دا سەری لەلەشی جودا بکەنەوە، لەسەراوە رایانکێشا بەرەو ناوەڕاستی مەیدان. هەرکەسەو بەخەنجەر یان شمشێر پیایاندا دەکێشا، و کۆتاییەکی شوومی هەبوو، و فرمانی دا بچنەوە بەشتەکانیدا. ئەمەیش دەرئەنجامی ئەوانەیە کەبەزەیی لەدڵیاندا نییە![279]

[279] یەعقووب سەرکیس(سەرچاوەی پێشوو)ب1 ل54–58.



## لایەنی مەزهەبی:

ئەو وەسفەی ئاماژەمان پێکرد، سەبارەت بەیوسفی بازرگان، ئەوە دەگەیەنێت کەکێشمەکێشەکە، سەرەتا لەنێوان مەمالیك و ئینکشارییەکاندا بوو–یان" هەرجارێ خۆی واتەنی، لەنێوان کۆسەکان و یەنگجەرییەکاندا بوو–دواتر دانیشتوانی گەڕەکەکانی بەغدا چوونە ریزیانەوە. ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە یوسفی بازرگان، لایەنێکی گرنگی لەو کێشمەکێشە فەرامۆش کردووە، کەئەویش لایەنی مەزهەبییە، لەکاتێکدا هەندێ لەمێژوونووسان، بەتایبەتی یاسین ئەلعومەری، بەروونی ئاماژەیان بەو لایەنە کردووە، کەشیعەکانی بەغدا پشتی ئەحمەد ئاغای سەرۆکی ئینکشارییەکانیان گرت، لەکاتێکدا سونییەکان لایەنی عەلی پاشا کەهییەیان گرت. لێرەدا بۆخوێنەر، دەقی وتەکەی یاسین ئەلعومەری لەکتێبی(غرائب الأثر)، سەبارەت بەو رووداوە دەهێنینەوە:

(...محەممەد بەگ شاوی و کۆمەڵێ لەخەڵکی سوننە لەبەغدادا راست بوونەوەو پەرچەمی شێخ عەبدولقادری گەیلانییان هەڵگرت، و پەلاماری قەڵایان داو داگیریان کردو یەنگجەرییەکان و رافزییەکان رایانکرد، و ماڵی جوولەکەکان و ماڵی هەندێ لەموسڵمانە رافزییەکان و بازاڕەکان تالان کران، و عەلی پاشا لەدیجلە پەڕییەوەو هاتە ناو سەراوە...). دواتر دوای گێڕانەوەی کۆتایی رووداوەکە گوتی:(عەلی پاشا

دەستی کرد بەکوشتنی رافزییەکانو دەستی گرت بەسەر سامانی دەوڵەمەندەکانیاندا...)[280]

گومانم بۆئەوە دەچێت، کەئەمە تەنیا رووداوە کەکێشمەکێشێکی مەزهەبی لەخۆدەگرێت، بەدرێژایی سەردەمی مەمالیك، ئەوەی زانراوە سەبارەت بەو هەموو شەڕەگەڕەکانەی، لەو سەردەمەدا روویان دەدا، هیچ جۆرە مۆرکێکی مەزهەبییان پێوە نەبوو، چونکە شیعەکان خۆیان لەهیچ نیارێك نەدەدا، پەیوەندیی بەسیاسەتەوە هەبوایە، شەڕەکان تەنیا لەنێوان سونییەکانی خەڵکی بەغدادا بوون، چونکە تەنیا ئەوان بۆیان هەبوو خۆیان لەقەرەی مشتومڕ لەکاروباری دەسەڵاتدا بدەن.

ئەو پرسیارەی لێرەدا رووبەرووما دەبێتەوە،ئەوەیە: هۆی سەرهەڵدانی مۆرکی مەزهەبی تەنیا لەم رووداوەدا، نەك لەرووداوەکانی دیکەی سەردەمی مەمالیکدا چی بوو؟

پێموایە چەندین هۆکاری جۆراوجۆر لەپشتی ئەوەوە بوون، کەدوانیان گرنگ بوون، یەکەمیان ئەوەبوو ئەحمەد ئاغای سەرۆکی ئینکشارییەکان خۆی شیعەبوو،و نووسەری (أعیان الشیعة) بەمجۆرە وەسفی دەکات:(سەیدێکی پاكو پایەبەرزە، لەبنەماڵەی پاکی پێغەمبەرو عەلەوی‌و فاتیمییە).[281] دیارە ئەحمەد ئاغا پەیوەندییەکی تۆکمەی بەشیعەکانی بەغداوە هەبوو،و خۆشیدەویستنو خۆشیان دەویست، کاتی

[280] لەماڵەکەی (غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر)-مووسڵ1940-ل62-63.

[281] موحسین ئەمین(أعیان الشیعة)-دیمەشق1938-ب7 ل347.



رووداوەکە، لەدژی عەلی پاشا کەهییەی دوژمنی، پەنای پێبردن،و ئەوانیش بەدەمیەوە هاتن.

بەڵام فاکتەری دووەم، ئەوەیە کەعەلی پاشا کەهییە، هێندە خۆشەویست نەبوو لەنێوان شیعەکاندا، بەهۆی کەمتەرخەمیکردنی لەپارێزگاریی لەکەربەلا، لەکاتی پەلاماری وەهابییەکاندا،و دەبێ لێرەدا، ئەوە فەرامۆش نەکەین کەرووداوی بەغدا، چوار مانگ دوای رووداوەکەی کەربەلا رووی دا، واتە هێشتا خەڵکەکە ئەوەیان لەدڵدا دەرنەچووبوو.

یاسین ئەلعومەری دەڵێت، کەمحێدین کوڕی عەرەبی پێشبینیی ئەو رووداوەی کردبوو، کە لە(الشجرة النعمانية)دا بەعەرەبی دەڵێت:(...نبأ قد ظهر، طبق مافي الخبر... الحامل للسداد، يقتل في بيت المهيب...)، ژمارەی وشەی(نبأ) لەژمارەی پیتەکاندا، یەکسانە بەژمارەی (أحمد)،و ژمارەی(الحامل) یەکسانە بەژمارەی(على)، بەڵام مەبەست لە(بيت المهيب) مزگەوتە کەدواتر عەلی پاشای تیادا کوژرا.[282]

[282] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل63.

## هاتنەوەی وەهابییەکان:

کەسێکی بەرەچەڵەك ئەفغانی، بەناوی مەلا عوسمان لەبەغدادا نیشتەجێ بوو، دەڵێن خۆی نەزری ئیسلام کردبوو، و بڕیاری دابوو سەرۆکی وەهابییەکان بکوژێت،[283] ئەوەیش دەگێڕنەوە کەگوایا خەڵکی کەربەلابووە، و لەوکاتەی وەهابییەکان داگیریان کرد لەوێ بووە، و بەچاوی خۆی بینیویەتی، کەچۆن ژن و منداڵەکانیان سەربڕیوەو سوێندی خواردووە تۆڵەیان بسەنێتەوە.[284] هەرچۆنێك بێت، مەلا عوسمان ڕۆیشت بۆدرعییەی پایتەختی وەهابییەکان، بەجلوبەرگی دەروێشانەوە، و تێکەڵیان بووە، تائەوەی لێی دڵنیا بوون، و متمانەیان پێی پەیدا کردووە، لەریزی سێیەمدا ، ڕاستەوخۆ لەپشتی ئەمیر عەبدولعەزیزی کوڕی سعوودەوەنوێژی جەماعەتی دەکرد. لەرۆژی هەینی-کۆتایی ساڵی 1803دا-لەکاتی رکوعدا، هەل دەقۆزێتەوەو خۆی دەدا بەسەر ئەمیردا، و بەتیغ لەپشتی دەدات و سکی دەبڕێت، و هەر بەوەیشەوە ناوەستێ، بەڵکو عەبدوڵلای برای ئەمیریش دەداتە بەرتیغ، کەلەپاڵ براکەیدا نوێژی دەکرد، بەقووڵی برینداری دەکات، بەڵام ئەگەرچی برینەکەی سەخت بوو، بەڵام بەشمشێرەکەی هەڵدەکوتێتە سەر بکوژەکەو دەیکوژێت.[285]

[283] ڕەسووڵ کەرکووکلی(دوحة الوزراء)-بەیرووت-ل227.

[284] عەبدوڵلا فیلبی(تأریخ نجد)-وەرگێڕانی عومەر دیراوی-بەیرووت-ل 103.

[285] سەرچاوەی پێشوو،ل103.



دوای عەبدولعەزیز، سعوودی کوڕی شوێنەکەی دەگرێتەوە، و ئەمیش پێی وابوو، کەکوشتنی باوکی بەدەسکیسەی والی بەغدا بووە، بۆیە بڕیار دەدات تۆڵەی لێبسەنێتەوە. لەوەرزی بەهاری ساڵی داهاتوودا، کاتێ کەخێڵی زەفیر لەبیاباندا، بەدوای لەوەڕدا پەرشوبڵاو بووبوونەوە، کوڕی سعوود پەلاماریان دەدات، و تالآنیان دەکات، و دواتر روو لەبەسرە دەکات، خۆی دەگەیەنێتە بەشی باشووری، و زۆریان لێدەکوژێت، و پەلاماری تاقمێك لەمونتەفیق دەدات، کەبەسەرۆکایەتیی مەنسووری کوڕی سامیر ئەلسەعدوون لەنزیکی بەسرەدا بوون، و هەندێکیان لێدەکوژێت و سەرۆکەکەیان یەخسیر دەکات.

دواتر دەچێت بۆکۆشکی دورەیهەمییە-کەسەرچاوەی ئاوی خەڵکی زوبێر بوو-تێکیدەدات و هەموو ئەوانەیش دەکوژێت کەلەوێ بوون. دواتر روودەکاتە شارۆچکەی زوبێرو گەمارۆی دەدات، و ویستی دانیشتوانی شارۆچکەکە بترسێنێت، بۆیە فرمانی بەدارودەستەکەی خۆی دا، لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا، هەموویان بەیەکجار تەقەیان لێبکەن، و کاتێ خەڵکی زوبێر ئەوەیان بیست ترسان و ژنەکانیان چوونە سەربان، و هاتوهاواریان لێهەستا و هەندێ ژنی دووگیان منداڵیان لەبارچوو، بەڵام خۆیان گرت و ئابڕووی خۆیان پاراست. ئابڵۆقەکە ماوەی دوانزە رۆژ درێژەی کێشا، وەهابییەکان بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیان دروێنەکرد، کەئەوکاتە پێگەیشتبوو، و هەموو گۆڕو مەزارەکانی دەرەوەی دیوارەکەیان رووخاند،

وەکو مەزاری تەڵحەو حەسەنی بەسری،[286] دوایی گەڕانەوە بۆشوێنی خۆیان.

سوڵتان داوای لەعەلی پاشا کرد، کەهەر دەبێ شەڕی وەهابییەکان بکات، دیارە عەلی پاشا حەزی بەوە نەدەکرد، یان دەیزانی توانای ئەو شەڕەی نییە، هەروا دەستیدایە نمایشکردن لەبەرامبەر وەهابییەکان، کەهیچ سوودی نەبوو.

ئەو سەردەمە ئەوە بڵاوبووەوە کەمحەممەد بەگ شاوی‌و عەبدولعەزیزی برای بەلای بڕوای وەهابییدا دەشکێنەوە،و نامە لەگەڵ سعووددا ئاڵوگۆڕ دەکەن، بۆیە عەلی پاشا فرمانی دا هەردووکیان بکوژن، بۆیە خێڵی عوبێد دەستیاندایە شۆڕش،و شۆڕشەکە بەوە گەورەتر بوو، کەخێڵی عوبێد رێککەوت لەگەڵ عەبدورەحمان پاشای باباندا، کەئەویش هاوپەیمان بوو لەگەڵ ئێراندا،و ئەمەیش بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندیی نێوان عیراق‌و ئێران،و دواتر بەرپابوونی شەڕ لەنێوانیاندا،و دەرئەنجام سوپاکەی عەلی پاشا لەبەرامبەر سوپای ئێراندا بەتوندیی شکا.[287]

---

[286] عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين) بەغدا 1954–ب6 ل161.

[287] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(داوود باشا والي بغداد)–قاهیرە1968–ل45.



## پەلاماردانی نەجەف:

لەکۆتایی نیسانی ساڵی1806دا، هەواڵ بەخەڵکی نەجەف گەیشت، کەوەهابییەکان بەڕێوەن بۆداگیرکردنی، زۆربەیان شارەکەیان بەجێهێشت، لەترسی ئەوەی نەبادا، ئەوەیان بەسەردا بێت کەوەهابییەکان بەر لەچوار ساڵ، بەسەر کەربەلایاندا هێنا. لەنەجەفدا، جگە لەدووسەد کەس کەتوانای هەڵگرتنی چەکیان هەبوو، کەسی تیادا نەما.

شێخ جەعفەر جەناجی کەسەرۆکایەتیی مەزهەبیی ئەو شارەی لەئەستۆدا بوو–نووسەری کتێبی(كشف الغطاء)–بەرگریی لەشارەکە کرد‌و هەندێ لەهاوڕێکانی لەپیاوانی ئایینی،و دەستی کرد بەکۆکردنەوەی چەك‌و ئامادەکردنی ئامرازەکانی بەرگری. لەو شەوەی کەوەهابییەکان دەوری شارەکەیان دابوو، شێخ جەعفەر بۆخۆی سەرپەرشتیی کاروباری بەرگری دەکرد،و فرمانی دا دەروازەکانی شار دابخەن،و بەردی گەورەی لەپشتی دەروازەکان دانا،و بۆهەر دەروازەیەك چەند جەنگاوەرێکی دانا،و تەنیا پشتی بەجەنگاوەرانی نەجەف نەبەست، بەڵکو چەکی بەسەر تەلەبەکانیشدا دابەش کرد.

یەکێك لەو زانایانەی ئامادەی رووداوەکە بوون–سەید جواد عامیلی، نووسەری کتێبی(مفتاح الكرامة)–بیرەوەرییەکانی خۆی تۆمار کردووە، لەکۆتایی بەشی پێنجەم لەکتێبەکەیدا، دەڵێت:(ئەم بەرگە لەیەکەمی مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی 1221دا تەواو بوو، لەگەڵ تێکچوونی بارودۆخەکەو سەرقاڵ بوون بەوەی تووشمان بوو، لەلایەن مەلعوونێکی بیانی لەسەرزەمینی نەجد، لەئاییندا بەهەوەسی خۆی

بیدعەی کرد، و خوێنی موسڵمانانی حەڵاڵ کردو مەزاری ئیمامە پیرۆزەکانی رووخاند... و لەساڵی 1221، لەشەوی نۆیەم لەمانگی سەفەر، بەرلەسپێدە بەسەعاتێك، لەناکاو پەلاماریدداین لەنەجەفدا،، تەنانەت هەندێ لەیاوەرانی بەسەر دیوارەکەیشدا سەرکەوتن، ئەوەبوو کەراماتی ئەمیری بڕواداران-عەلی کوڕی ئەبوتالیب- دەرکەوت، و زۆرێك لەسوپاکەی کوژران و بەناکامی گەڕایەوە، و سوپاس بۆخودا.[288]).

## کوژرانی عەلی پاشا:

دەسەڵاتی عەلی پاشا پێنج ساڵی خایاند، و پڕبوو لەدڵەڕاوکێ و ترس، و لەکۆتاییدا بەفێڵ کوژرا، تاقمێك لەکۆسەکان، کەپیاوێك بەناوی مەدەد بەگ سەرکردەیان بوو کوشتیان، ئەم پیاوە لەعەلی پاشاوە نزیك بوو، بەڵام رق و کینەی خۆی شاردبووەوە. لەسپێدەی رۆژێك لەساڵی 1807دا، کاتێ عەلی پاشا نوێژی بەیانی دەکرد، لەمزگەوتدا مەدەد بەگ پەلاماری دا-کەلەپاڵیدا نوێژی دەکرد-خەنجەرەکەی کرد بەکەلەکەیدا، و والی لەناو خوێنی خۆیدا گەوزا، و بکوژو دارودەستەکەی بەپەلە لەمزگەوتەکە هەڵهاتن.

بکوژەکان پەنایان بردە بەر ماڵی سەعید بەگی کوڕی سولەیمانی گەورە، ئەویش دەریکردن و دەرگای بەروویاندا داخست، ئەوسا روویان

[288] جەعفەر مەحبووبە(ماضي النجف وحاضرها)-نەجەف 1958-ب1 ل327.



کردە ماڵی نەسیف ئاغا، ئەویش پێشوازیی لێکردن و داڵدەیانی دا، و دیاربوو ئەو دەیویست ئەو دەرفەتە بۆخۆی بقۆزێتەوە، ناردنی بۆماڵی نەقیب، سەید رەمەزانی سەرپەرشتیاری ئەوقافی شێخ عەبدولقادرو نەقیب سەرقاڵی گەڕان لەگوندەکاندا بوو، بکوژەکان چوونە ماڵەکەی و خۆیان تیادا حەشار داو بڕیاریان دا بەرگریی لەخۆیان بکەن.

هەر لەو کاتەدا، هەواڵەکە بەسولەیمان پاشا کەهییە گەیشت- کەکوڕی خوشکی والیی کوژراو بوو- فرمانی دا ماڵی نەقیب بەتۆپی بچووك تۆپباران بکەن، ئەوەیش بکوژەکانی ناچار کرد دەرچن لەماڵەکە.[289] رەسووڵ کەرکووکلی دەڵێت: بکوژەکان لەگەڵ نەسیف ئاغادا، خۆپیشاندانێکیان رێکخست، بەرەو سەرا بەڕێ کەوتن، مەبەست لەو خۆپیشاندانە، دانانی نەسیف ئاغابوو، بەبریکاری والی، بەڵام پیاوماقوڵان و زانایان خێرا دەنگییان بەکەهییە سولەیمان پاشا داو لەشوێنی والیی کۆچکردوو دایان نا، و لەبەر ئەوەی کەهییە لەناو خەڵکیدا خۆشەویست بوو، بۆیە هەموان، بەهەموو چینەکانەوە پشتیان گرت، کاتێ خۆپیشاندانەکەی نەسیف ئاغا لەسەرا نزیکبووەوە، سەربازەکان و خەڵکی بۆیان دەرچوون و بڵاوەیان پێکردن و دوایان کەوتن، هەندێکیان بەرەو رووبار رایانکردو بەهۆی حەسیرو پەلاشەوە، بۆبەری کەرخ پەڕینەوە.[290]

[289] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل75.
[290] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل240.

یاسین ئەلعومەری دەگێڕێتەوە، کەنەسیف ئاغا پەڕییەوە بۆبەری کەرخ، بۆئەوەی خەڵکی هان بدات بۆیارمەتیدانی بکوژەکان، بەڵام گوێیان پێ نەداو پەلاماریان داو کوشتیانو گوریسیان بەست بەقاچییەوەو بەکۆڵانەکاندا رایانکێشاو پەڕانیانەوە بۆبەری رەسافەو خەڵکی تەماشایان دەکرد[291]...

پێدەچێت ئەو دەست بەکاربوونە خێرایەی کەهییە سولەیمان بەدەرکردنی بکوژەکان، بووە هۆی ئەوەی بەغدا لەدووبەرەکیو ئاژاوە رزگار بکات،و ئەگەر ئەوە نەبوایە، رەنگە ئاژاوەیەکی خوێناوی بەغدای بگرتایەتەوە،و دانیشتوانی گەڕەکەکان ببوونایە بەدوو بەشی دژ بەیەکدی–هەندێك پشتگیرییان لەسولەیمان پاشاو هەندێك پشتگیرییان لەنەسیف ئاغا بکردایە– وەکو ئەوەی بەهۆی کێشمەکێشی نێوان دەسەڵاتداران لەسەردەمی مەمالیکدا رووی دەدا.

[291] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل75.



## والیی نوێ:

کاتێ دۆخەکە لەبەغدا ئارام بووەوە، پیاوماقووڵانو زانایانو سەرانی مەمالیك کۆبوونەوەو سولەیمان پاشایان بەقایمقام دانا–واتە بریکاری والی–بەپێی رێورەسمی رەچاوکراو لەوحاڵەتانەدا،و داواکارییەکیان نارد بۆسوڵتانو ئاگاداریان کردەوە لەرووداوەکە،و داوایان لێکرد فرمانێك دەربکاتو سولەیمان پاشا بکات بەوالی. کاتێ داواکارییەکە گەیشتە ئەستەنبوڵ، پیاوانی دەوڵەت کۆبوونەوەو بڕیاریان دا ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە، بۆئەوەی بەغدا لەدەسەڵاتی مەمالیك رزگار بکەن، بەڵام هەر زوو، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بۆچوونی خۆیان گۆڕی:

یەکەم: باڵیۆزی فەرەنسا لەئەستەنبوڵ یاداشتێکی پێشکەش بەبابی عالی کرد، تیایدا هاتبوو:(بارودۆخی بەغدا ئاڵۆزەو هێزی سولەیمان پاشا لەوپەڕیدایە، بۆیە بەرژەوەندیی دەوڵەت لەوەدایە، بکرێت بەوالی. ئەمیش بەئەرکی خۆی دەزانێت کەراوبۆچوونی خۆی، بەشێوەیەکی دۆستانە، بەبابی عالی بگەیەنێت.)

دووەم: پیاوانی دەوڵەت لەئەستەنبوڵ دەترسان والییەك لەغەیری مەمالیك دابنرێت،و ئەوسامەمالیك لەدەوڵەت یاخی ببن.

سێیەم: لەبەغداوە داواکارییەکی دیکە گەیشت، دووبارە زانایانو پیاوماقووڵان داوای ئەوە دەکەن سولەیمان پاشا بکرێت بەوالی،و

دەگێڕنەوە ئەو بڕە پارەیەی سولەیمان پاشا لەگەڵ داواکارییەکەدا ناردی، لەم بارەوە ڕۆڵێکی یەکالاکەرەوەی گێڕا.[292]

دواتر سولەیمان پاشا فرمانی بۆدەرکرا، و بوو بەوالیی بەغدا، و ئەم والییە بە(سولەیمانی بچووك) ناوبانگی دەرکرد، بۆئەوەی لەسولەیمانی گەورە جیابکرێتەوە، و دواتر نازناوی(کوژراو)ی بەسەردا بڕا، چونکە ئەویش کوژرا، بەڵام کوشتنەکەی گەلیٚ خراپترو لەکوشتنی عەلی پاشای خاڵی، سەرسووڕهێنەرتر بوو.

کاتیٚ سولەیمان پاشا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتن تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، و هەموو مێژوونووسان لەسەر ستایشکردنی سەردەمی دەسەڵاتەکەی کۆکن، چونکە هەروەکو دەیگێڕنەوە پیاوێکی دادپەروەر بوو، میهرەبان بووە لەگەڵ خەڵکیدا، و کاری باشی ئەنجام دا، لەهەندیٚ دامودەزگای دادو باجدا، بەڵام لەلایەکی دیکەوە لەخۆبایی بوو، و-کاتیٚ بیویستایە کارێك ئەنجام بدات- گوێی بەوە نەدەدا، خەڵکی رقی لێهەڵبگرن. پێموایە لەشێوەی ئەو گەنجانەبووە، کەئەزموونیان لەژیان وەرنەگرتووەو، و پێیان وایە، دەبیٚ ژیان بەپێی بیرکردنەوەی ئەوان بێت، یان بەوجۆرە بێت کەئارەزووی دەکەن، بەبیٚ رەچاوکردنی سروشتی شتەکان.

[292] ساتیع حوسەری(البلاد العربية والدولة العثمانية)-بەیرووت1960-ل58-059



سولەیمان فایەق، لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو پیاوە رەوشتی بەرز بوو، و هەڵسوکەوتی جوان بوو، و لەسەرخۆو، پابەندی دادپەروەری و سەخاوەتمەندی بوو، بەڵام پیاوێکی بیٚ ئەزموون بوو، لای عەلی پاشای خاڵی گەورە بووبوو، و شتێکی ئەوتۆ لە رۆژگارو گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکانی فێرنەبووبوو، و وێڕای ئەوەی بۆیەکەم جار بەپۆستی کەهییە لای عەلیی پاشا دامەزرابوو، کەتووشی بوغرابوونی کردبوو، و پۆستی وەزارەتی وەرگرت، بەمەیش هێندەی دیکە تووشی لووت بەرزی بووبوو، و شەیدای خۆی بووبوو، هەروەکو بڵێی ئەو بەغدای گرتبێت، زۆری نەبرد خەڵکی بەچەوتی و لادان تاوانباریان کرد، و بەوەی بەلای مەزهەبی وەهابییەکاندا بایدابووەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کەبیروباوەڕێکی سەلەفی هەبوو.)[293]

دیارە نەیارەکانی، کەبەهۆی ریفۆرمکارییەکانی ئەوەوە، لەبەغدادا زیانیان بەرکەوتبوو، ناویان دەزڕاندو تۆمەتی وەهابییان دەدایە پاڵی، و لەو سەردەمانەدا، ئەو تۆمەتە گەلیٚ قێزەون بوو بەلای دەوڵەتەوە،[294] بۆیە رۆژ بەرۆژ پەیوەندیی ئەستەنبوڵ لەگەڵیدا خرابتر دەبوو.

ساتیع حوسەری هەندیٚ لەو تۆمەتانە دەگێڕێتەوە کەپیاوانی دەوڵەت لەئەستەنبوڵ، ئاراستەی سولەیمانی بچووکیان کردبوو، و

[293] سولەیمان فایەق(تأريخ بغداد)-وەرگێڕانی موسا کازم نەوڕەس-بەغدا1962-ل37.

[294] وەکو تۆمەتی نازیزم، لەعیراقی سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی و تۆمەتی کۆمۆنیزم، لەسەردەمی دواتردا وابوو.

بەنموونەی داتەپیویی دەوڵەتی عوسمانیی ئەو سەردەمەی دەزانێت. بەوە تاوانباریـــان کـــرد کـــە(بنـــەماکانی دەســـتگرتن بەســـەر ســـامان)ی هەڵوەشاندبووەوە، و ئەو باجانەی هەڵوەشانبووەوە کەدادوەران دیارییان دەکرد لەسەر ئەو کەسانەی داوایان هەبووە، ئەگەر بهاتایە مووچەیان بۆببڕایەتەوە، و لەسێدارەدانی لەناو چوارچێوەی سزای شەرعیدا سنووردار کردبوو، و دەیانگوت گوایابەم کردەوانەی خۆی، دژایەتیی ڕێوشوێنە بنچینەییە بڕیار لەسەر دراوەکانی دەوڵەتی کردووە، و گوایا لەژێر کاریگەریی ئەو زانایانەی بەغدادا، دەستی داوەتە ئەو کارانە کە بەلای مەزهەبی وەهابیدا بایانداوەتەوە. ئەحمەد جەودەت پاشای مێژوونووسی تورکی سەبارەت بەکردەوەکانی سولەیمانی بچووك دەڵێت: گومانی تیادا نییە ئەم کردەوانە نیشانەی نیاز پاکیین، بەڵام ئەستەمە بۆ والییەك سەرەڕۆیانەو لەخۆوە دەست بداتە ئەو کارانە، و بەتایبەتی پووچەڵ کردنەوەیان لەکاتێکدا، لەهەموو هەرێمەکانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی کاریان پێدەکرا، کەبەدەربڕینی نارەزامەندیی لەسەر(ستەمی وڵاتەکەی) بەتیلماژەیەکی ناوەڕۆکی هەژمار دەکرا، وێڕای ئەوەی بەپەیڕەویی کردن لەوەهابییەکان دادەنرا، کەدەبوا نکۆڵی لێبکاتو بەگژیدا بچێتەوە[295]...

[295] ساتیع حوسەری(سەرچاوەی پێشوو) ل64.



## پەلاماردانەکەی حاڵەت ئەفەندی:

پیاوانی دەوڵەت لەئەستەنبوڵ، بەرامبەر بەسولەیمان پاشا گەیشتە لووتیان، و لەدەرفەتێك دەگەڕان بۆئەوەی لەپۆستی والی بەغدا لایببەن، و کاتێ ئەم دەرفەتەیان بۆرەخسا، کەسولەیمان پاشا خۆی بۆهێرشێکی گەورە ئامادەکرد، بەرەو ئۆرفەو ماردین، بەمەبەستی تەمێکردنی خێڵە یاخی بووەکانی ئەو ناوچانە لەباکووردا، چەندین داواکاری گەیشتە ئەستەنبوڵ، لەلایەن دانیشتوانی ئەو ناوچانەی سوپاکەی پیادا ڕەتدەبوو، کە لەدەستی کاری کوشتنو بڕین بەدەستی سەربازەکانەوە، سکاڵایان هەبوو،[296] لەراستیدا ئەم سکاڵایانە هیچ سەرنجی پیاوانی دەوڵەتی ڕانەدەکێشا، ئەگەر لارییان لە سولەیمان پاشا نەبوایە، گەلێ جار نامەی سکاڵاو گازەندەکردن، لەهەموو هەرێمەکانەوە دەگەیشت، بەڵام چارەنووسیان تەنیا سەبەتەی خۆڵ بوو.

پیاوانی دەوڵەت سیفەتێکی خراپی دیکەیان لەسولەیمان پاشادا دۆزییەوە، ئەویش ئەوەبوو کەوەکو پێویست پارەی ڕەوانەی ئەستەنبوڵ نەدەکرد، ئەوەیان کرد بەپاساوێك بەدەستییانەوە، بۆکارکردن لەپێناوی لەسەر کارلابردنی. پیاوێکی تابلێی کەڵەکبازو سەر بەپیلانیان نارد بۆلای، ئەویش حاڵەت ئەفەندیی ئال سەرۆکی نووسەران بوو، کاتێ ئەم پیاوە گەیشتە بەغدا، سولەیمان پاشای لەنێوان دووکاردا سەرپشك کرد: یان

[296] ئەحمد عەلی سۆفی(المماليك في العراق)-مووسڵ 1952-ل123-124.

ئەوەتا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك پارە ڕەوانە بکات، یان دەست لەپۆستی والیی بەغدا هەڵبگرێت.

دیارە سولەیمان پاشا هێندە بایەخی بەوتەکانی حاڵەت ئەفەندی نەدا، هەروەکو بڵێی پشتی بەهێزی خۆی لەبەغدا بەستبێت، چونکە سوپایەکی ڕێکوپێکی دامەزراندبوو، هەروەها توانیبووی، لەرێگەی دادپەروەریو ریفۆرمکارییەکانیەوە، خۆشەویستیی خەڵکەکە بۆلای خۆی رابکێشێت. حاڵەت ئەفەندیش دەرکی سەرچاوەی هێزەکەی ئەوی کردبوو، بۆیە وایبەباش زانی بگەڕێتەوە بۆموسڵ، و لەوێوە چاڵی بۆ هەڵبکەنێت.

ئەوەی لەم بارەوە، پێویستە ئاماژەی بۆبکەین، ئەوەیە کەسولەیمان پاشا، لەکاتی هێرشەکەی بەرەو باکوور، بەموسڵدا ڕەتدەبێت، بەباشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی موسڵدا نەکردبوو، و دڵی ئەمیرەکانی ئەو ناوچەیەی شکاندبوو، و داوای لەهەموو خێڵەکانی ئەو دەڤەرە کردبوو، شەڕی دانیشتوانی موسڵ بکەنو گوندەکانیان تالان بکەنو خوێنیان بڕێژن،[297] بۆیە خەڵکی موسڵ یەکجار رقیان لەسولەیمان پاشا دەبووەوە، و هەوڵیان دەدا نێوانی ئەوو حاڵەت ئەفەندی تێکبدەن، و هانیان دەدا شەڕی لەگەڵدا بکات.

حاڵەت ئەفەندی بۆپەلاماردانی بەغدا، سوپایەکی گەورەی پێکەوە نا، و خەڵکی موسڵیش چوونە ریزیەوە، هەروەها خێڵی تەی، شمامك، عوبێد، عەززە، و بەیات، و هەروەها عەبدورەحمان پاشای بابان لەگەڵ تاقمێك لەکوردەکان چوونە پاڵی. ئەم سوپا تێکەڵو پێکەڵە پێشڕەویی کرد، تاگەیشتە(خورما ئاباد)–واتە خەرنابات–ی نزیکی بەعقوبە، و

[297] یاسین عومەری(سەرچاوەی پێشوو) ل93.



سولەیمان پاشایش لەوێ سوپایەکی پێکەوە نابوو، هەردوو سوپاکە، بەمەبەستی شەڕ کردن بەرامبەر یەك وەستان.

## شەڕەکانی بەغدا:

لەکاتێکدا سولەیمان پاشا بەسەرکردایەتی سوپاکەیەوە، نزیکی خەرنابات بوو، لەبەغدادا شەڕی ناوخۆ لەجۆرە باوەکەی هەڵگیرسا، و یەکێك لەئاغا ئینکشارییەکان، بەناوی عەبدورەحمان ئاغا موسڵی–باپیرە گەورەی بنەماڵەی ئۆرفەلیی ناوداری ئیستای بەغدا بوو–فیتی ئەو شەڕەی دا. ئەم پیاوە پەیوەندیی بەسوپای سوڵتانیو حاڵەت ئەفەندیی سەرۆکەکەیەوە هەبوو، ئەوەبوو موسڵاوییەکانی دانیشتووی بەغدای لەخۆی کۆکردەوەو بەرامبەر بەسولەیمان پاشا رق ئەستووری دەکردن، و تائەوەی توانی بەیارمەتیی ئینکشارییەکانو دانیشتوانەکە، پەلاماری قەڵاکە بداتو داگیری بکاتو سەرۆکی ئینکشارییەکانی تیادا بکوژێت.

کاتێ سولەیمان پاشا ئەو ڕووداوەی بەغدای بیست، خێرا هەندێ لەهێزەکانی بۆرەوانە کرد، و توانی قەڵاکە بگێڕێتەوە، و بەوەیش کۆنترۆڵی شارەکەی کرد، ئیتر دوای ئەمە کەوتە منەکردنی موسڵاوییەکان بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لێیان، فرمانی دا هیچ موسڵاوییەك لەبەغدادا دانەنیشێت، تەنانەت ئەگەر چل ساڵیش نیشتەجێی بووبێت، دواتر نزیکەی بیست پیاویانی دەستگیر کرد، و شەلاقیاندانو زیندانی کردن، بەوەیش موسڵاوییەکانی بەغدا نەمان، و زۆربەیان لەوشارە هەڵهاتن.[298]

[298] سەرچاوەی پێشوو، ل111.

## کوژرانی سولەیمان پاشا:

حاڵەت ئەفەندی هەلی سەرقاڵ بوونی سولەیمان پاشای بەخەڵکی بەغداوە قۆستەوە، و هێزەکانی بەرەو بەغدا پێشڕەوییان کردو لەدووریی سەعاتە ڕێیەکەوە، لەئەعزەمییە خێوەتیان هەڵدا. سەیر ئەوەبوو، سولەیمان پاشا لەو بڕوایەدا بوو، ئەو هێرشەی کرابووە سەری، بەبێ ئاگاداریی سوڵتان بوو، و لەژێر سەری بنەماڵەی جەلیلیو دانیشتوانی موسڵدا بوو، بۆیە دادوەری بەغداو پیاوماقووڵێکی خەڵکی موسڵی دانیشتووی بەغدا، بەناوی حاجی ساڵح ئاغای نارد، بەمەبەستی دانوستان، لەگەڵ حاڵەت ئەفەندیدا، بەڵام بێ سوودبوو.

لەدوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجەمی تشرینی یەکەمی ساڵی 1810دا، شەڕی یەکالاکەرەوە، لەنێوان هەردوو سوپاکە، لەنزیکی ئەعزەمییەدا رووی دا، و دەڵێن دەمەو ئێوارە، شەڕەکە بەسەرکەوتنی ئاشکرای سولەیمان پاشا کۆتایی هات، و شەو متمانەی تەواوی بەوە هەبوو کەسەرکەوتنی کۆتایی هەربۆئەوە، بەڵام سپێدەی ڕۆژی دواتر هەرکە لەخەو هەستا، بینی کەسەربازەکانی پشتیان تێکردووە، و بەتاریکی گەڕاونەتەوە بۆبەغدا، بەبیانووی ئەوەی کەفرمانیان بۆدەرچووە، و نایانەوێت داوای جێنشینی موسڵمانان بشکێنن.

تەنیا سی پیاو لەگەڵ سولەیمان پاشادا مانەوە، ئەویش رووی کردە باشوورو لەدیالە پەڕییەوە، و لەوێیش بەدەستی عەرەبەکانی خێڵی دەفافیعەی سەر بەشەمەری تۆقە کوژرا، و بکوژان کەللەسەرەکەیان هێنا بۆ حاڵەت ئەفەندی، و ئەویش فرمانی دا کەللەسەرەکە پاك بکەنو لەرێگەی موسڵەوە، رەوانەی ئەستەنبوڵی بکەن. کاتێ کەللەسەرەکە بەموسڵدا رەتبوو، خەڵکەکە زۆریان پێخۆش بوو، و ڕۆژی رەتبوونی کەللەسەرەکە بەموسڵدا، بوو بەرۆژێکی دیار.[299]

## ئاژاوەیەکی دیکە:

کاتێ بەسەرکەوتوویی حاڵەت ئەفەندی هاتە بەغداوە، فرمانێکی سوڵتانی پێبوو، بەبێ ناو، و دەسەڵاتی ئەوەی پێدرابوو بەو ناوە پڕی بکاتەوە کەخۆی دەیەوێت، و دواتر عەبدوڵڵا ئاغای توتنچی دەستنیشان کرد، کەپیاوێکی بەڕێز بوو لەمەمالیك.

مانگێك بەسەر ئەوەدا رەتنەبوو، تا لەبەغدا ئاژاوەیەکی نوێ سەریهەڵدا، بەفیتی عەبدورەحمان ئاغا، کەهەروەکو ئاماژەمان بۆکرد، ئاژاوەی یەکەمیش هەر بەفیتی ئەو هەڵگیرسا. ئەم پیاوە شانازیی بەوەوە دەکرد، کەدژی والیی پێشووی ئەو کارەی ئەنجام دا، و دەیویست لەدەستنیشانکردنی والیی نوێدا دەستی هەبێت، و لەراستیدا رازی نەبوو لەدانانی عەبدوڵڵا توتنچی، و حەزی دەکرد لەشوێنەکەی، سەعید بەگی کوڕە گەورەی سولەیمانی گەورە دابنرێت، کە لەوکاتەدا، تەمەنی نۆزدە ساڵە بوو.

عەبدورەحمان ئاغا پەیوەندیی بەو کەسانەوە کرد کەجێگەی متمانەی بوون، بەمەبەستی هەڵگیرساندنی شۆڕش، دواتر شۆڕشی

---

سەرچاوەی پێشوو، ل117.

راگەیاند بەپشت بەستن بەو ئینکشارییانەی لەگەڵیدا بوون،و چەکداران لەدانیشتوان پەیوەندییان پێوەکرد،و بەرەو قەڵا پێشڕەوییان کرد، بەمەبەستی داگیرکردنی. ترس بەغدای داگرت،و دوکاندارەکان شتومەکی دوکانەکانیان بردەماڵەوە، لەترسی ئەوەی نەبادا تالآن بکرێن،و والیی نوێ داوای کۆمەکی لەخێڵی جبوورو عەقیل لەدانیشتوانی کەرخ کرد، نزیکەی سەد چەکدار بۆئەوێ پەڕینەوە،و شەڕ بۆماوەی پێنج سەعات بەردەوام بوو،و لەکۆتاییدا یارانی عەبدورەحمان ئاغا شکان، چوونە ماڵەکانیانەوەو دەرگایان لەسەرخۆیان داخست. بەڵام عەبدورەحمان ئاغا پەنای بردە بەر باڵیۆزی بەریتانیا، ئەویش نەیتوانی داڵدەی بدات، بۆیە ئاغا ناچاربوو، بەغدا بەجێ بهێڵێت.

ئەوەی لەم بارەوە پێویستی بەئاماژە بۆکردنە، ئەوەیە کەیاسین ئەفەندیی مێژوونووسی موسڵاوی، کاتێ لەگێڕانەوەی ئەم رووداوانە دەبێتەوە، ئەوە فەرامۆش ناکات–وەکو نەریتی خۆی– بگەڕێتەوە سەر ئەوەی دەڵێت:(...محو قد قرب، لمن يضطرب، فتنة تقوم وقتال يدوم، تطفأ عن قريب، من رأي مصيب) واتە، ئەوەی تێکبچێت پێشبینییەکی راستی محێدینی کوڕی عەرەبی بگێڕێتەوە. ئەو لەکتێبی(الشجرة النعمانية)دا ، لەناوچوونی نزیکە، ئاژاوەیەك بەرپا دەبێت،و کوشتار بەردەوام دەبێت، زوو بەزوو دادەمرکێتەوە، ئەوە راوبۆچوونێکی راستە. ئەم دەستەواژانە بەبۆچوونی ئەلعومەری، بەپێی ژمارەی پیتەکان، ئاماژە بەکوشتنی سولەیمان پاشاو بوونی عەبدوڵڵا پاشا بەوالیو چەند رووداوێکی دیکە دەکەن.[300] لەم سەردەمەدا، پیاوێکی وەکو ئەلعومەری شك نابەین، تاوەکو پێشبینییەکانی کوڕی عەرەبی، سەبارەت بەرووداوەکانی ئەم سەردەمەمان بۆراڤە بکات:

[300] سەرچاوەی پێشوو،ل121



## پەلاماری وەهابییەکان:

هێشتا بەغدا سەرقاڵی رووداوە خوێناوییەکانی خۆی بوو، هەر بەو شێوەیەی ئاماژەمان بۆکرد، فوراتی ناوەراست کەوتبووە ژێر هەڕەشەو گوڕەشەی وەهابییەکانەوە، تەنانەت شوانەکانیش نەیاندەتوانی روو لەبیابان بکەن، لەترسی مێگەلەکانیان نەبادا لەلایەن وەهابییەکانەوە تالآن بکرێن.[301]

سەید جوادی عامیلی بیرەوەرییەکانی خۆی لەو رۆژانەدا، لەدوادوایی بەرگی حەوتەم لەکتێبی(منهاج الكرامة)دا، بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:(عەرەبەکانی عونەیزە–ئەوانەی بڕوایان بەمەقالەی دەرەکیی وەهابییەکان هەبوو–گەمارۆی نەجەف و مەزاری حوسێنیان دا،و رێگەکانیان گرت و زیارەتکەرانی حوسێنیان تالآن کرد، دوای گەڕانەوەیان لەزیارەتی نیوەی شەعبان،و هەموویانیان بەکۆمەڵ کوشت،و زۆربەی کوژراوەکان عەجەم بوون،و دەڵێن ژمارەیان سەدو پەنجا کەس بووە، یان کەمتر...تاقمێك لەعەرەبەکان لەحیللەدا مانەوە، نەیانتوانی سەردانی نەجەف بکەن. هەندێکیان رۆژوویان لەحیللە گرت،و هەندێکیان روویان لەحەسەکە کرد. ئێمە ئێستا هەر دەڵێی گەمارۆدراوین،و عەرەبەکان هێشتا هەر لەوناوەدا ماونەتەوە، رەنگە لەکوفەوە، دوو فەرسەخ لەشوێنی

[301] یوسف کەرکووش حیللی(تأريخ الحلة)–نەجەف1965–ب1 ل132–133.

حوسێنەوە دووربن. خەزاعیل ترسنۆك‌و ناكۆكن، بنەماڵەی بعێج‌و بنەماڵەی جەشعەم شەڕیانە، هەروەها والییەكی دیكە هاتووە بۆبەغدا،و لەگەڵ والیی پێشوودا مشتومڕیانە. هەردووكیان خەریكی ڕێگە گرتنن. بۆیە عونەیزە كەڵكەڵەی ئەوە كەوتۆتە سەری، ئەم دەوروبەرە بگرێت، هیچ دەسەڵاتێك نییە).[302]

## كوژرانی توتنچی:

دەسەڵاتی عەبدوڵڵا پاشای توتنچی لەبەغدا، تەنیا دووساڵ‌و نیو درێژەی كێشا،و ئەو ماوەیەی بەترس‌و دڵەڕاوكێ بەسەر برد، هەردەم لەسەعید بەگ‌و حزبەكەی دەترسا، چونكە زۆربەی مەمالیك بەلای سەعید بەگدا دەیانشكانەوە‌و سۆزی وەفادارییان بۆی هەبوو، بەهۆی سولەیمانی گەورەی باوكییەوە.

لەكۆتایی ساڵی 1812دا، سەعید بەگ لەبەغدا هەڵهات‌و پەنای بردە بەر حەمود سامیری شێخی مونتەفیق لە(سوق الشیوخ)، والی عەبدوڵڵا پاشا داوای لەشێخ حەمود كرد سەعید بەگ بدات بەدەستەوە، بەڵام شێخ وەڵامی دایەوە(مردن لەوە باشترە دراوسێكەم بەدەستەوە بدەم)،[303] عەبدوڵڵا پاشا چارەیەكی نەما، لەوە زیاتر كە سوپایەكی گەورە پێكەوە بنێت‌و روو لە(سوق الشیوخ) بكات.

[302] جەعفەر مەحبووبە(سەرچاوەی پێشوو) ب1 ل327-328.

[303] عوسمانی كوڕی سەنەدی بەسری(مطالع السعود بطیب أخبار الوالي داوود)-كورتكردنەوەی ئەمین حەلوانی- قاهیرە1371هـ-ل 116.



شێخی مونتەفیق، بۆیارمەتیدانی سەعید بەگ نزیكەی بیست هەزار چەكداری لەخێڵەكان كۆكردەوە،و كاتێ سوپای والی گەیشتە نزیكی(سوق الشیوخ) شەڕێكی قورس لەنێوانیاندا رووی دا،و والی توانی بەزەبری تۆپەكانی، خێڵەكان بشكێنێت،و پەرتەوازەیان بكات،و تەنیا سی چەكدار لەگەڵ سەعید بەگ، لەگۆڕەپانی شەڕەكەدا مانەوە.

والی چاری نەبوو، دەبوا دوا هەڵمەت بەرێتە سەر دوژمنەكەی‌و بەتەواوی بەسەریدا سەربكەوێت، لێرەدا ئەوەی بەسەردا هات، كەپێشتر بەسەر سولەیمانی بچووكدا هات، ئەوەبوو زۆربەی سەركردەكانی هەڵگەڕانەوە‌و بایاندایەوە بەلای سەعید بەگدا، بەوپاساوەی پیاوچاكیی‌و باشەی سولەیمانی گەورەی باوكیان بیركەوتەوە،و دەیانەوێت بۆراگەیاندنی وەفادارییان بۆی، یارمەتی كوڕەكەی بدەن.[304] بنەماڵەی قەشعەمیش رایانكرد، كەلەگەڵ والیدا هاتبوون‌و لەپاڵیدا شەڕیان دەكرد.[305] تەنیا دووسەد كەس لەدڵسۆزانی والی لەگەڵیدا مانەوە.

خێڵەكان دابارینە سەر سەربازگەكەی والی، بەتەواوی تاڵانیان كرد،و والی‌و تاهیر ئاغای كەهییەی بەدیل گیران‌و پەلكێشی(سوق الشیوخ)كران، لەوێ كوژران‌و كەللەسەرەكەیان فڕێدایە بەرپێی سەعید بەگ.[306]

[304] رەسووڵ كەركووكلی(سەرچاوەی پێشوو)ل259.

[305] عوسمانی كوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو)ل 117.

[306] ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو)ل141.

## سەعید پاشا:

کاتێ دادوەری بەغدا، ڕووداوەکەی مونتەفیق و کوژرانی والی بیست، یەکسەر پاشایەتیی بۆسەعید پێشنیار کردو نووسراوی ئاراستەی ئەستەنبوڵ کرد، بۆئەوەی ڕەزامەندیی ئەوێ وەربگرێت. لە16ی ئایاری ساڵی 1813دا، بەیاوەریی حەمود سامیری شێخی مونتەفیق، سەعید پاشا هات بۆبەغدا.[307] خەڵکی بەغدا بەگەرمی پێشوازییان لێکرد. دواتر لەسەرا کۆبوونەوەیەکی کرد بەئامادەبوونی دادوەرو موفتی و سەرکردەکان و پیاوماقوولان، و بڕیاریان دا بکرێت بەبریکاری والی، تائەو کاتەی فرمانی سوڵتانی دەگات، بەمەبەستی دانانی بەوالی.[308] لەکۆتاییی حوزەیراندا، فرمانی دانانی بەوالی بەغدا گەیشت، لەگەڵ ئەوەی پلەی وەزیری پێبەخشرا.

سەعید پاشا کاتێ دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، تەمەنی بیست و دووساڵ بوو، و پێشتر لەوبوارەدا کاری نەکردبوو، بەڵکو پیاوێکی خۆشگوزەران بوو لەجۆری ئەوکوڕانەی بەناز گەورە دەبن، لەدونیادا، جگە لەخۆشگوزەرانی و رابواردن و شانازیکردنی پڕوپووچەوە هیچ نازانن.

[307] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل233.
[308] ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل142.



ئیبن سەنەدی بەسری دەڵێت: سەعید پاشا بوو بەبووکەشووشەی دەستی حەمودی شێخی مونتەفیق، وەکو منداڵ بەدەستی سەرپەرشتیارییەوە، سەعید پاشا هەموو گوندەکانی باشووری بەسرەی پێ بەخشی، کەنزیکەی یەك لەسەر سێی داهاتی عیراقی هەبوو، و زەمانە بەدەم بنەماڵەی مونتەفیقەوە پێکەنی، و شارو گوند گوێڕایەڵیان بوون، و شاعیران لەهەموو شوێنێکەوە، ڕوویان تێکردن، و خەڵاتی وایان وەردەگرت، کە بنەماڵەی عەبباسیش خەڵاتی وەهای نەدابوونێ و لەکۆڕوکۆبوونەوەکاندا، لەڕادە بەدەر، تەنیا گوێت لەستایشکردنیان دەبوو، بەجۆرێ پاشاکانیش واستایش نەدەکران. بنەماڵەی مونتەفیق بوغرابوون و دەستدرێژییان دەکردە سەر سامانی هەموان، بەتایبەتی خەڵکی بەسرە، هەندێکیان بەرۆژی نیوەڕۆ هەڵیاندەکوتایە سەر ماڵان–ئەوە شەوان باڵەولاوە بوەستێ–وهەرچییەك دەستییان پێبگەیشتایە دەیانماشییەوەو بەئاشکرا لەبازاڕدا دەیانفرۆشت، و خاوەنەکەی نەیدەتوانی ورتەی لەدەم بێتە دەرەوە، و ئەوەی سکاڵای لای شێخ حەمود بکردایە، گوێی لێنەدەگیرا، چونکە حەمود تەنیا پشتگیریی لەستەمکار دەکرد.[309]

[309] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل119.

## هەڵگەڕانەوەی خێڵەکان:

لەکاتێکدا دەڤەری بەسرە لەژێر دەسەڵاتی حەمودی شێخی مونتەفیق و خێڵەکەیدا بوو، ئاژاوە لەناوچەی فوراتی ناوەڕاستدا بڵاوبوووەوە، خێڵی خەزاعیل و زوبێد لەدەوڵەت یاخی بووبوون و ڕێگەیان دەگرت و کاروانەکانی نێوان حیللەو کەربەلا و نەجەفیان تالان دەکرد، ئەمەیش هانی خێڵەکانی دیکەی وەکو شەمەرو جەربا و زوفەیری دەدا یاخی ببن. بەم جۆرە ئاژاوەو ڕێگەگرتن لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبووەوە، تەنانەت تالان کردن و بڕین گەیشتە کازمییەو دەوروبەری کەرخ، و خەڵکی لەگیانی خۆیان و سامانیان دەترسان.[310]

ئەوەی دۆخەکەی زیاتر شێواند، ئەوەبوو کەچل هەزار گەشتیاری ئێرانی-کەهاوسەرەکەی شایش لەنێوانیاندا بوو-لەلایەن خێڵەکان لەکەربەلادا گەمارۆ دران، و سەروماڵیان کەوتە مەترسییەوە، و خێڵەکان چاوەڕوانی ئەوە بوون زیارەتکەرەکان لەکەربەلا دەرچن، بۆئەوەی زەفەریان پێ بەرن، سەعید پاشای والی لەوە ترسا، نەبادا گەشتیارە ئێرانییەکان زیان ببینن، و حکومەتی ئێران ئەوە بقۆزێتەوە بۆئەوەی هەڕەشە لەعێراق بکات، یان داگیری بکات، و ئەوسا دەوڵەت بەهۆی کەمتەرخەمییەوە، گلەیی لێدەکات.[311] سەعید پاشا هیچ چارەیەکی نەدۆزییەوە، ئەوە نەبێت، کەداود

[310] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل222.

[311] عوسمان کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل120.



ئاغای مێردی خوشکەکەی بکات بەکەهییە، ئەگەرچی پێشتر بەهۆی هاشوهووشیەوە، پۆستی دەفتەرداری لێ سەندبووەوە.

دواتر داود ئاغا بوو بەوالی بەغدا-هەروەکو لەبەشی ئایندەدا باسی دەکەین-بەراستی یەکێك بوو لەو پیاوە لێهاتوانە، توانی بەتوندی گورز لەخێڵە یاخی بووەکان بوەشێنێت و تاروماریان بکات، و گەشتیارەکانی لەکەربەلا رزگار کرد، دواتر لەگەشتەکەیان بۆ نەجەف و گەڕانەوەیان بۆ کازمییەو دواتر بۆئێران، پاسەوانی بۆتەرخان کردن، دواتر شێخ زوبێدی لابردو لەشوێنەکەیدا شافوڵڵا شەلالی ناسراو بە (شفەللەح)ی دانا.

## ڕێورەسمی ڕەتبوونی سەعید پاشا:

جیمس بکنگهامی گەڕیدەی بەریتانی لە16ی تەممووزی ساڵی 1816دا گەیشتە بەغدا، ئەو کتێبەی لەسەر گەشتەکەی نووسی، وەسفی ڕێوڕەسمی ڕەتبوونی بەبەردەم یەکێك لەدەروازەکانی بەغدا-کەپێدەچێت دەروازەی باکوور بێت، کەئەمڕۆ بە(باب المعظم)ناسراوە-دا دەکات و دەڵێت:

(لەگەڵ خۆرهەڵهاتندا، گەیشتینە بەردەم دەروازەی شارەکە، و لەدەرەوەیدا، ژمارەیەکی زۆر لەسواری عەرەب و تورك، بۆنمایشکردن کۆبووبوونەوە، هەروەها ژمارەیەکی زۆریش لەپیادە لەبەردەمیاندا کۆبووبوونەوە، کەگاردی پاشایان پێکدەهێنا، کەچاوەڕوانی گەڕانەوەی پاشا بوون، کە لەوەرزشی بەیانیانی ، بەسەر ئەسپەکەیەوە بگەڕێتەوە...

(لەو کاتەدا، ئەو کەسایەتییە هات و تاقمێك لەپاسەوانەکانی لەپێشیەوە بوون، کەلەمەمالیکە جۆرجییەکان پێکهاتبوون، و باشترین جلوبەرگیان لەبەردابوو، بەسوارییی ئەسپی جوان و رەسەن و بەتفاق، دواتر تاقمێکی دیکە هاتن لەسەربازە پیادەکان، تفەنگی ئینگلیزییان هەڵگرتبوو، بەجلوبەرگی سەربازییەوە، لەوانەی گاردی بەریتانی دەیانپۆشی، بەڵام تاقیلەی فەرووی گەورەیان لەسەر کردبوو، بەڵام رەوتیان ئەوەی دەردەخست کەشلوشێواون. دەنگی تەپڵ و دووزەلە، تەنیا ئامێری مۆسیقا بوون، کەدەنگێکی ناشایستەیان لێوە دەهات، وەکو بڵێی شتێك نەیدەتوانی ئەو دڵەراوکێیە بڕەوێنێتەوە کەرەتبوونی پاشا، بەلای ئەوانەوە دروستی دەکرد کەدەیانبینی، و بێگومان ئەوەیش رووداوێکی ترسناك بوو.

(لەنزیکی دەروازەکەدا، دوو چایخانەی گەورە هەبوو، سەدان تەماشاکەر لەوێ دانیشتبوون، کەچی دووکەڵ لەهیچ نێرگەلەیەك هەڵنەدەستا، و پیاڵە چایەك بەکەس نەدرا، و لەو چرکەساتە ترسناکەدا، کەس ورتەی لەدەم نەدەهات، هەموو ئەوانەی ئامادەبوون، لەشوێنی خۆیان هەستان، خۆی بۆپێشەوە دادەنووشتان، یان دەستیان بۆدەمیان بەرز دەکردەوە، دواتر بەرێزەوە، دەستیان بۆناوچەوانیان، دواتر بۆسەر دڵیان دەبرد. ئەگەرچی پاشا کەمتر سەیری ئەملاوئەولای دەکرد، و سەیری پێشەوەی دەکرد، بەڵام بەجوانیی وەڵامی سڵاوەکانی دەدایەوە. هەموو شتێك بەجوانی بەڕێوە دەچوو).[312]

[312] جیمس بکنگهام(رحلتي الى العراق)–وەرگێڕانی سەلیم تەها تکریتی–بەغدا1968–ل 183–184.



## لابردنی داود ئاغا:

نابی خانمی دایکی سەعید پاشای والی، گەلێ رقی لەداود ئاغابوو، ئەگەرچی مێردی کچەکەی بوو–رەنگە هەر لەبەر ئەوە رقی لێیبووبێت، کەخەسووی بوو–کاتێ داود ئاغا پۆستی کەهییەی وەرگرت، نابی خانم زۆر ئاڵۆزبوو، و سەرزەنشتی کوڕەکەی کرد، لەبەر ئەو دامەزراندنە، کاتێ کوڕەکەی سەردانی دایکی خۆی کرد، ویستی وەکو نەریتی پەیڕەوکراو دەستی ماچ بکات، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو دەستی بداتێ و بەگلەییەوە گوتی: چۆن داود دەکەیت بەکەهییە، لەکاتێکدا تۆباش دەزانیت، ئەوو لێکچووەکانی، لەدێرزەمانەوە دوژمنی منن، دەبێ هەرئێستا لاییببەیت، ئەگینا من نابینی و شیرم لەتۆ حەرام بێت، نەتۆ کوڕی منی و نەمن دایکی تۆم. سەعید پاشا ناچار بوو داود لەسەر کارەکەی لاببات،[313] بەمەیش پیاوێکی لێهاتووی لەدەست دا، دەکرا لەکاتی تەنگانەدا، بەکەڵکی بێت.

نابی خانم ویستی حاجی عەبدوڵڵا زاهیریی بکات بەکەهییەی کوڕەکەی. ئەم پیاوە پۆستێکی بەرزی هەبوو، لەسەردەمی سولەیمانی گەورەی مێردیدا، دواتر دەستی لەکار کێشایەوە، و لە شاری بوشەهری

[313] سولەیمان فایەق(تأريخ المماليك في بغداد)–وەرگێڕانی محەممەد نەجیب ئەرمەنازی–بەغدا 1961–ل 44–45.

ئێراندا نیشتەجێ بوو، ناردی بەدوایدا، و کاتێ گەیشتە بەغدا، بۆئەوەی سەردانی بکات لەدەروازەی حەرەم، لەنێوانیاندا باسوخواسێکی خۆش رووی دا، کەبارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسیی بەغدای ئەو سەردەمەمان بۆوێنا دەکات. بۆیە بەباشمان زانی، بەشێك لەو باسەیان لێرەدا، بڵاوبکەینەوە، کەبەزاراوەی خۆماڵیی، لەکتێبی(تذکرة الشعراء)ی عەبدولقادری شەهرەبانیدا هاتووە.

نابی خانم بەم جۆرە دەکەوێتە ئاخافتن لەگەڵ حاجی عەبدوڵڵا زاهیریدا:(من دەمەوێت سەروکاری ئیشەکانی کوڕەکەم سەعید پاشا بکەم، لەسەرجەم کاروبارە حکومییەکاندا، لەسەر ئاستی دەرەوەو ناوخۆدا، و تۆیش دەبیت بەکەهییەی دەسەڵاتداری ئەو، هەروەکو من لەسەردەمی باوکیی خوالێخۆشبووی سولەیمان پاشا، و تۆ لەدڵسۆزانیت، و لای خوالێخۆشبوو چۆن بوویت، لای کوڕەکەیشی هەروابە، پێویستە ئەرکەکانت لەگەڵ کوڕەکەیدا جێ بەجێ بکەیت و سەروکاری ئیشەکانی بکەیت، لەهەموو روویەکەوە). حاجی وەڵامی نەدایەوە، و کاتی زۆری بۆهێنا، داوای لێبوردنی لێکرد، لەوەرگرتنی پۆستەکە، و دەستی کرد بەخستنە رووی جیاوازییەکانی سەردەمی سولەیمانی گەورەی مێردین و رۆژگاری سەردەمی کوڕەکەی، لەو بارەوە پێیگوت:(...خوالێخۆشبوو ئەفلاتوونی سەردەمی خۆی بوو، دەوروبەری ئاوەدان بوو، پیاوگەلێکی هەبوو دڵسۆزانە خزمەتیان دەکرد-کەمترینیان من بووم-ئێمە راوتەگبیرمان لەو وەردەگرت، کەسمان نەماندەتوانی، بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت لەو، قسەبکەین، چونکە ئەو خاوەنی راوبۆچوون بوو...لەسەردەمی ئەودا، زاناو شاعیرو پیشەساز زۆربوون، و کاڵا فراوان بوو، وڵات ئاوەدان بوو...چەتە لەناو وڵاتدا کەم بوونەوەو مزگەوتەکان ئاوەدان کرانەوەو چاکسازی کران،



بەهۆی ژمارەی زۆری نوێژکەرانەوە، و حوجرەکان پڕبوون لەتەلەبە، و مەلهاکان لەوڵاتدا کەمبوونەوە-دیارە نەك بەهۆی دەسەڵاتەوە، بەڵکو لەلایەن خوداوە بوو-تەنانەت ئەگەر کەسێك بیویستایە ئاهەنگی خەتەنەکردن بگێڕێت یان شایی بکات، نەدەچوو ئامێری مۆسیقا لەمەلهەکان بهێنێت، لەبەر ئەوەی شەرمی لەخەڵکی دەکرد، بەڵکو نانی دروست دەکرد، یان مەولوودی تیادا دەخوێنرایەوە، یان قورئانی تیادا دەخوێنرا... و ئەگەر ئێوەیش دەتانەوێت دەست بەکاروبار بکەم و سیاسەتی حکومەت لەپۆستی کەهییەدا بەڕێوەببەم، ئەوە پێویستی بەسەرۆك هەیە، چونکە ئەمڕۆ هەروەکو بینیم، کاروباری ئەفەندیمان سەعید پاشا بەدەستی چەند کارمەندێکەوەیە، کەلەدەوری کۆبوونەتەوە، لەژێر سەرپەرشتیی خۆیدا).[314]

نابی خانم پاساوهێنانەوەکەی پەسەند نەکرد، و بەتوندی سووربوو لەسەر داواکەی، ئەوەبوو لەکۆتاییدا بەزۆر پۆستی کەهییەی پەسەند کرد، و توانی کاروباری حکومەت بەجوانی هەڵسوڕێنێت، بەڵام ئەوە تەنیا نزیکەی چوار مانگ درێژەی کێشا، چونکە والی عاشقی غوڵامێکی جوانی خەڵکی بەغدا بوو، بەناوی(حەمادی علوجی) و بەتەواوی والی خستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، والی هەر ئەوەندەی پێدەکرا، کاتەکانی خۆی لەپاڵ ئەودا بەسەر ببات. حاجی عەبدوڵڵا هەوڵی دا ئامۆژگاریی والی بکات، بەڵام سوودی نەبوو، ئەوەبوو داوای دەست لەکار کێشانەوەی کرد لەپۆستەکەی و لەماڵەوە گۆشەگیر بوو، و چیتر نەکەوتە ژێر کاریگەریی سووربوونی نابی خانمی دایکییەوە.

[314] عەبدولقادر شەهرەبانی(تذکرة الشعراء)-بەغدا1936-ل 47-48.

## شێوانی بارودۆخەکە:

حەمادی علوجی نازناوی(ابن أبو عقلين)ی لێنرا، بەلاّم هۆکاری ئەو نازناو لێنانە نادیارە، هەندێ دەڵێن باپیرە گەورەی لەگوندی (بعقلين)ی شامەوە هاتووەو خەڵکی بەغدا ئەو ناوەیان کردووە بە(أبو عقلين)، دیارە ئەم وشەیە، لەناو بەغدادییەکاندا بەکار دەهێنرا، و بەکەسێکیان دەگوت، کەخۆی گیرۆدەی گرفت بکردایە.

هەرچۆنێك بێت، وادیارە حەمادی علوجی هەندێ زیرەکیو سامو جوانیی تێدابوو، و رۆژ بەرۆژ زیاتر بەسەر سەعید پاشای والیدا زاڵ دەبوو، و توانی لەپۆستەکاندا بەرزتر ببێتەوە، تاگەیشتە پۆستی کەهییەو ئیتر ببڕو بکوژ خۆی بوو، و ستایشکەری زۆر بوون.

سولەیمان فایەقی مێژوونووس سەبارەت بەپەیوەندیی سۆزداری لەنێوان والیو حەمادیدا دەڵێت:( بەلاّم خۆشەویستی ئەو بۆحەمادی ئاغا، ئەو خۆشەویستییە بوو، کەگەیشتە پلەی عیشق، و بووبەباسی هەموان، و سەرەڕایئەو جوانییەی کەهەیبوو، بۆیە خەڵکی بەلادانی سێکسی تاوانباریان کرد، و هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نەبوو، تائەو تۆمەتە پووچەڵ بکاتەوە)[315].ئەم پەیوەندییە گومان لێکراوە، بارودۆخی عیراقی شێواند، چونکە والی سەرقاڵی عیشقەکەی خۆی بوو، و کاروباری دەسەلاّتی پشت

[315] سولەیمان فایەق(تأريخ بغداد) ل57.



گوێ خست، بەمەیش ئاژاوەو بشێویی لێرەو لەوێ بلاّو بووەوە، شارۆچکەی مەندەلجین لەحکومەت یاخی بوون، و ئەفسەری سەرپەرشتیاری شارەکەیان دەرکرد، هەروەها دوژمنایەتیی نێوان دانیشتوانی نەجەف توند بوو، و بوون بەدوو بەشەوە(شمرت)و (زفرت)و کەوتنە کوشتاری یەکدی، و ئاگری دەمارگیریی خێڵەکایەتی بۆکەربەلا تەشەنەی کردو دوژمنایەتی لەنێوانیاندا دروست بوو، و شەڕ لەنێوانیاندا بەرپا بوو.[316]

ورەی مەمالیك لەبەغدادا دابەزی، هەروەکو بڵێی بەلایانەوە ئاسان نەبوو کەسێکی ئاسایی لەخەڵکی بەغدا ببینن، و کوڕی علوجی سەر بەچینی دەسەلاّتدار بوو، کەتەنیا ئەوان بۆیان هەبوو خۆیان لەکاروباری بەڕێوەبردنی بالاّ هەڵقورتێنن، تائەوەی دەستی دەگەیشتە ئەوەی پارێزگارەکان لەسەر کار لاببات و ئەوەی خۆی دەیویست لەشوێنیان دایدەنا,داود ئاغا بوو بەسەرۆکی ئۆپۆزسیۆن، و بێزارەکان لەمەمالیكو کەسانی دیکە، لەدەوری کۆبوونەوە. لەئەیلوولی ساڵی 1816دا، داود ئاغا توانی بەدزییەوە، بەغدا بەجێ بهێڵێت، لەگەڵ دووسەد کەس لەیارانی، و رۆیشت بۆکەرکوك، و لەوێ مەحموود پاشای بابانی بینی، پێشوازیی لێکراو کۆمەکی پێکرا. لەوێ بزاڤەکەی وردە وردە نەشونمای کرد، و زۆربەی ئاغاکانی بەغدا، چوونە ریزییەوە.

[316] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو)ل269.

## داود فرمانی پێدەگات:

کاتێ داود ئاغا لەسلێمانی بوو توانی فرمانێك لەسوڵتان وەربگرێت، بۆئەوەی ببێت بەوالی بەغدا، لەبری سەعید پاشا. بۆئەم کارە پیاوێك لەئەستەنبوڵ یارمەتی دا، کەدەسەڵاتی هەبوو، ئەویش حاڵەت ئەفەندیی گەورەی نووسەران بوو، کەپێشتر شتێکمان دەربارەی زانی. ئەم پیاوە هەوڵی زۆری دا، تاوەکو سەعید پاشا لەپۆستی والی بەغدا لابرێتو داود ئاغا بچێتە شوێنی.

لەم مەسەلەیەدا، شتێکی خۆش دەربارەی حاڵەت ئەفەندجی دەگێڕنەوە، کەلێرەدا دەیگێرینەوە. قەرزاری پیاوێکی جوولەکەی خەڵکی بەغدا بوو، کەلەئەستەنبوڵ نیشتەجێ بوو، بەناوی حسقێل، حسقێل برایەکی هەبوو لەبەغدا، ناوی عزرا بووو دەیویست لای سەعید پاشا بەسەرپەرشتی بانق دایبمەزرێنێت، حسقێل داوای لە حاڵەت ئەفەندی کرد، لەو بارەوە هەوڵی بۆبدات، بەڵام سەعید پاشا گوێی بەهەوڵەکانی نەدا، بەمەیش حاڵەت ئەفەندی تورە بوو،و بۆدەرفەتێك دەگەڕا تۆڵەی لێبسەنێتەوە.[317]

[317] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل230.



سەرۆکی بانق لەبەغدا کەناوی ساسۆن بوو،[318] لەلایەن حەمادی علوجیو نابی خانمەوە پشتگیری دەکرا، بۆیە لابردنی لەسەر کارەکەی هەروا ئاسان نەبوو، مادامێك سەعید پاشا لەدەسەڵاتدا بێت، حاڵەت ئەفەندی لەگەڵ داود ئاغا رێککەوتن کەیارمەتی بدات لەوەی ببێت بەوالی بەغدا، لەبەرامبەر ئەوەی بیکات بەسەرۆکی بانق لەلای خۆی.[319]

دەگێڕنەوە،عزرا لەلایەن خۆیەوە، کارێکی کرد حاڵەت ئەفەندی بەمرازی خۆی بگات، کاری ئەو کارمەندانەی کەلەبواری لێدانی دراودا کاریان دەکرد، پشتگوێ خست،و لەبری ئارمی سوڵتانی، ناوی سەعید پاشای لەسەر هەندێ لەدراوەکان دانا،و دواتر هەندێ لەو دراوانەی نارد بۆحسقێلی برای لەئەستەنبوڵ، ئەویش لەرێگەی خۆیەوە ناردی بۆحاڵەت ئەفەندی، کەبووە بەڵگەیەکی بەهێز بەدەستییەوە، بۆمەبەستی خۆی،و بەبەرپرسانی ئەستەنبوڵی راگەیاند، کەسەعید پاشا، لەبری ناوی سوڵتان بەناوی خۆیەوە، دراو لێدەدات.

لەو کاتەدا، پیاوماقووڵانی کەرکوكو هەندێ لەئەمیرانی کورد کۆبوونەوە،وداواکارییەکیان نارد بۆسوڵتان، داوای ئەوەیان لێکرد، داود ئاغا بکات بەوالی بەغدا، لەکاتێکی گونجاودا داواکارییەکە گەیشتە ئەستەنبوڵ،و حاڵەت ئەفەندی کردی بەئامرازێك بۆ بەدەست هێنانی فرمانی خوازراو.[320]

[318] ساسۆن باپیرە گەورەی نووسەری بەناوبان ئەنوەر شائۆلە،و باوکی داود ساسۆنی خاوەن کۆمپانیایەکی بازرگانی گەورەیە لەبەریتانیا، کەلقێکی لەبەغدایە.

[319] ریچارد کۆك(بغداد مدینة السلام) وەرگێڕانی فوئاد جەمیل ومستەفا جواد-بەغدا 1967- ب2 ل129.

[320] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل231.

## لێکدانەوەکەی ئیبن سەنەد:

ئەوەی باسمان کرد سەبارەت بەچۆنیەتیی دەستەبەر کردنی فرمانی بەوالی بوونی داود ئاغا لەبەغدا، زۆربەی مێژوونووسان لەسەری تەبان، بەڵام ئیبن سەنەدی بەسری، هەوڵ دەدات خۆی لێیان جیابکاتەوە، لەوبارەوە، هەروەکو بڵێی دەیەوێت چاکەیەك لەگەڵ داوددا بکات، بەلێکدانەوەیەکی دیکە، لەپێگەی بەرز بکاتەوە.ئەوەیش لەبیر نەکەین، کەئیبن سەنەد، مێژووەکەی لەسەر داوای داود و لەپێناوی ستایشکردنی ئەودا نووسیوە.

ئیبن سەنەد لەوەسفکردنی دەرچوونی داود لەبەغدادا دەڵێت:(...کاتێ گەیشتە کەرکوك، لەگەڵ دووسەد کەس لەهەوادارانی، نامەی بۆ ئەستەنبوڵ نووسی،و ئاگاداری کردنەوە، لەهەڵسوکەوتی خراپی سەعید پاشاو توندیی سیاسەتەکەی،و لاساییکردنەوەی قەیرانی مەمالیك، بەرامبەر سارانشینەکان، کەستەمکارن‌و کاریان بڕین‌و جەردەییە،و لەکۆڕوکۆبوونەوەکانیاندا، شانازیی پێوە دەکەن. داود پاشا بەسێ زمانی تورکی‌و عەرەبی‌و فارسی شیعرو پەخشانی دەنووسی، ڕەوانبێژانی هەر سێ زمانەکە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن. کاتێ نامەکانی گەیشتە دەوڵەت، سەریان سوڕما، لەڕوانبێژییەکەی‌و شێوازی نووسینی لەبواری سیاسیدا،و گەیشتنە ئەو بڕوایەی، ئەوەی بتوانێت بەو شێوەیە بنووسێت، ئەوا شایستەی ئەوەیە سەرۆکایەتی پێبسپێردرێت،و ئەو لەپێشترە تاکاروباری سیاسی لەئەستۆ بگرێت. لەسەدە ڕابردووەکاندا، بەلای دەوڵەتەوە واباو بوو، توانایی‌و لێهاتوویی هەر کەسێك بەئاستی توانایی لەنووسین‌و پرسیارو وەڵامدانەوەی بنجبڕدا بەستراوەتەوە...).[321]

دوور نییە نامەکانی داود بۆئەستەنبوڵ کاریگەریی نەبووبێت، بۆبەدەستهێنانی فرمانەکە، زمان لووسی هێشتا کاریگەریی هەیە لەسەر زۆرێك لەخەڵکی، لەم ناوچەیە لەجیهاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، دەبێ هەوڵەکانی حاڵەت ئەفەندی‌و حسقێل‌و عزرا، لەو ڕێگەیەدا لەبیر نەکەین. چونکە نامەکان چەندە دەنگدانەوەی خۆیان هەبێت، هەرگیز ناتوانن کاریگەربن.

## کوژرانی سەعید پاشا:

کاتێ فرمان بەدەستی داود ئاغا گەیشت–کەبەپاشا بووبوو– داروودەستەکەی بۆبەغداو سەرانسەری عێراق نارد، بۆئەوەی پڕوپاگەندەی بۆبکەن، دواتر لەکەرکوکەوە بەهێزەکانی‌و ئەو کوردانەی دوای کەوتن، بەرەو بەغدا ڕۆیشت. دەڵێن سەعید پاشا هەستی بەمەترسیی هەڵوێستەکەی کرد، بۆیە بەباشی زانی مل بەفرمانەکە بدات‌و بەغدا بەجێ بهێڵێت، بۆئەوەی سەری سەلامەت بێت، بەڵام حەمادیی دۆستی، پەشیمانی کردەوەو هانی دا خۆڕاگر بێت،و مل بەفرمانی سوڵتان نەدات.[322]

[321] عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو)ل124–125.

[322] ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل154.

سەعید پاشا داوای لەحەموود شێخی مونتەفیقی هاوپەیمانی خۆی کرد یارمەتی بدات، ئەویش بەهانایەوە هات، و بەهەزارو پێنج سەد سوارەوە هات بۆبەغدا، و لەبەری کەرخ خێوەتیان هەڵدا. لە7ی کانونی دووەمی 1817دا، شەڕێکی قورس لەنێوان هەردوو لادا بەرپابوو، لەدەرەوەی دیوارەکە، بەرووی (باب المعظم)دا، و تۆپەکانی قەڵا رۆڵێکی گرنگییان بینی لەشەڕەکەدا، هەروەها سوارەکانی مونتەفیق لەناکاو پەلاماریان دا، و بەوەیش سەرکەوتنیان بۆسەعید پاشا دەستەبەر کرد، داود پاشا ناچار بوو، بەمەبەستی حەوانەوەو خۆئامادە کردنەوە، بەهێزەکانیەوە بەرەو باکوور، لەبەغدا دوور بکەوێتەوە.[323]

سەعید پاشا پێی وابوو، مەترسیی لەسەر بەغدا نەماوە، بۆیە رێگەی دا بەشێخی مونتەفیق لەگەڵ سوارەکانیدا بەرەو دیاری خۆیان بگەڕێنەوە، و دەروازەکانی بەغدا کرانەوە، و ئارامیو ئاسایش بۆدانیشتوان گەڕایەوە. بەڵام ئەوە زۆری نەخایاند، چونکە بوونی داود پاشا لەگەڵ هێزەکانی، هەڕەشە بوون لەسەر بەغداو نرخی خواردەمەنی تیایدا بەرەو بەرزبوونەوە دەچوو، تاوایلێهات نرخی وەزنەیەك گەنم گەیشتە سی قروش،[324] هەوادارانی داود پاشا لەناو بەغدادا پڕوپاگەندەیان لەبازاڕو چایخانەکاندا دەکردو خەڵکییان بۆ شۆڕش هان دەدا.

یەکەمین بڵێسەی شۆڕش لەگەڕەکی (باب الشیخ) دەرکەوت، چەندین خۆپیشاندان دەستی پێکرد، هەڵگرانی دەفو پەرچەم لەپێشەوە

[323] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل237.
[324] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل267.



دەبینران، کەبەدەست نالەباریی گوزەرانو بەرزی نرخەکانو چەتەو رێگرانەوە هاواریان دەکرد، دواتر ئاژاوەو بڕینو دزی بڵاو بووەوە، و دەسەڵاتداران ئەوەی بیانویستایە ئەنجامیان دەدا، بەبێ ئەوەی لەکەس بترسن، بەمەیش والی ناچار بوو خۆیو هەوادارانی، خۆیان لەقەڵادا قایم بکەن، و هەڵوێستی بەرگریی کردن لەوێدا وەربگرن.[325] بشێویی ماوەی پێنج رۆژ بەردەوام بوو، کەتیایدا دەنگی تۆپ، و تەقەی فیشەكو هۆسەی عەقیلییەکانو سروودی ئینکشارییەکان دەبیسترا.[326]

لەکاتێکدا بارودۆخەکە بەو شێوەیە ئاڵۆز بوو، سەعید پاشا زانی کەحەمادی ئاغا بریندار کراوە، و لەیەکێك لەژوورەکانی ناوەوەی قەڵاکەدا کەوتووە، بەپەلە خۆی پێ گەیاندو دڵی دایەوە، و لەژوورەکە، لەگەڵیدا مایەوەو بەجێی نەهێشت، بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات لەدەرەوە چی روودەدات. ئەوسا پیاوماقووڵانی بەغداو زانایانی کۆبوونەوەو کۆنووسێکیان نووسیو ناردیان بۆداود پاشا، تیایدا هانیان دەدا، هەرچی زووترە خۆی بگەیەنێتە بەغدا، بۆئەوەی خەڵکەکەی لەو نەهامەتییە رزگار بکات.

لە20ی شوباتی 1817دا، داود پاشا هاتە ناو بەغداوە، خەڵکەکەی بەگەرمی پێشوازییان لێکرد، و لەهەموو لایەکەوە دەنگ بەرز بووەوە:(بەخێر بێیتەوە)[327]...سەید علێویی سەرۆکی ئینکشارییەکان

[325] رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل275–276.
[326] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل238.
[327] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل241.

بەدوای سەعید پاشادا دەگەڕا، بۆئەوەی بیکوژێت، بینی لەکۆشی دایکیدایە، تەورێکی لێدا، یەکسەر ملی پەڕاند، بەبێ ئەوەی گوێ بەلالانەوەو پاڕانەوەو هاوار هاواری دایکی بدات، سەری لەبەردەمیدا خل بووەوە، لەکاتێکدا لاشەکەی بەدەستییەوە مایەوە.[328] حەمادی ئاغایش دەستگیر کراو دواتر کوژرا، دوای ئەوەی بۆماوەیەکی زۆر، بەتوندی ئەشکەنجە درا.[329]

سولەیمان فایەق-کەخۆی لەرووداوەکەدا بوو- بەم جۆرە دەیگێڕێتەوە:(...هەرکەسێ گوێی لەم رووداوە بوایە، خەمو پەژارە دایدەگرت، تەنانەت جگە لەوەی من ئەوسا گەنج بووم، بەلام هەر جارێ ئەو رووداوەم بیر دەکەوتەوە، خەفەتم پێی دەخوارد، و سەرەرای سەفەر کردنم بۆئەستانەو، و ئەوەی لەگەڵ داود پاشادا بووم، بەلام تەنانەت لەئامادەبوونی ئەویشدا، خەمو پەژارەی خۆم بەهۆی ئەو رووداوەوە نەدەشاردەوە. تەنانەت جارێکیان لەکۆڕێکی داود پاشادا، ئەو رووداوەیان گێڕایەوە، کەپیاوماقوولێکی سەر بەروبێعییەکان ئامادەی بوو، و کەس لەئامادەبوان خۆی بۆنەگیراو هەموو دایان لەپرمەی گریان. داود پاشا ویستی بەرگری لەخۆی بکاتو پاساو بۆکردەوەکەی خۆی بهێنێتەوە، بەلام نەیتوانی و بێدەنگ بوو، و بێدەنگییەکەی بەڵگەیە بوو بۆکەمتەرخەمی خۆی لەو بارەوە).[330]

[328] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل238.

[329] عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ل59.

[330] سولەیمان فایەق(سەرچاوەی پێشوو) ل59.



خوێنەر دەتوانێت تەماشای ئەو کەسانە بکات کەچۆن هەست بەئازار دەکەن، بەهۆی بەلایەکەوە کەتووشی یەکێك لەچینەکەیان بوو، کەلەباوەشی دایکیدا کوژرا، هەرجارێ ناویان دەهێنا، دەگریان، هەروەکو بلێی لەدونیادا، تەنیا ئەو کارەساتە رووی دابێت، لەکاتێکدا رۆژانە هەزاران بەلا، بەسەر زەحمەتکێشەکاندا روو دەدات، کەکەسیان نییە گوێ لەسکالاکانیان بگرێت، یان بۆحاڵیان فرمێسك بڕێژێت-ئای کە مرۆڤ چەندە بەدە!

# بەشی نۆیەم

## داود پاشا

بەدرێژایی سەردەمی عوسمانی، لەرووی کاریگەریی فیکرو کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەی بۆداود پاشا هەڵکەوت، بۆهیچ والییەکی دیکە هەڵنەکەوت، تاسەردەمانێکی دواتر عیراقییەکان لەیادیان نەکردو باسی باشەو خراپییەکانیان دەکرد، و تائێستایش لەعیراقدا کەسانێك هەن، کەخاوەنی پێگەی بەرزن، و بەڵگەیان بەدەستەوە هەیە، کەئاماژە بەوە دەکات، کەکۆیلەی ئەو بوونەو شانازیشی پێوە دەکەن، یان لانی کەم شەرمی لێناکەن.

## پەروەردەکردنی داود پاشا:

پەروەردەبوونی داود پاشا جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ پەروەردەبوونی مەمالیکەکانی دیکەدا نییە، ئەو خەڵکی تەفلیسە لەجۆرجیا، لەساڵی 1767دا لەدایکبووە، و لەتەمەنی سیانزە ساڵیدا



لەدایکوبابی دەفڕێنرێت، یەکێك لەبازرگانانی کۆیلە دەیهێنێت بۆبەغدا، بەمەبەستی فرۆشتنی، یەکێك لەپیاوماقووڵانی بەغدا کەناوی مستەفا بەگ روبەیعی بوو کڕی، و ئەویش دوای چەند رۆژێك، لەبەر هۆیەك کەنازانین چییە فرۆشتییەوە، ئیتر داود پاشا ئەم دەستو ئەو دەستی پێکرا، تالەکۆتاییدا بەردەستی والی سولەیمان پاشای گەورە کەوت، ئەویش خستییە ریزی مەمالیکەوەو وەکو ئەوان، وەکو لەو سەردەمەدا باوبوو، خستییە ژێر مەشقەوە.

دیارە داود پاشا مێردمنداڵێکی بەهرەدار بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا بلیمەت بوو، و توانایییەکی باشی هەبوو لەبەکارهێنانی چەکدا، سەرنجی سولەیمان پاشای بۆلای خۆی راکێشا، و کردی بەنووسەری تایبەتی خۆی، دواتر پلەی بەرزکردەوە، و کردی بەسکرتێری خۆیو یەکێك لەکچەکانی خۆی لیٚ مارەبڕی.[331] ئەمەیش کارێکی نائاساییو سەرسووڕهێنەر نەبوو، لەسەردەمی مەمالیکدا، چەند جارێك ئەوە رووی دابوو، دواتر ئەوە لەناو هەندیٚ لەعیراقییەکاندا بوو بەباو، کەئەگەر یەکێکیان دڵی بەسەر منداڵێکدا بچووایە، دەیکرد بەهاورێی خۆیو لەخۆی دووری نەدەخستەوە، و کەگەورە دەبوو، کچێکی خۆی پێدەدا.

هێنانی کچی سولەیمان پاشا لەلایەن داودەوە، ئیرەیی کەهییە عەلی پاشای ورووژاند، کاتیٚ کەهیە، دوای سولەیمان پاشا بوو بەوالی،

[331] ئەحمەد عەلی سۆفی(المماليك في العراق) مووسڵ 1952–ل191.

داود ناچار بوو، دەست لەکاری حکومی هەڵبگرێت،و پەنا بباتە بەر مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بۆئەوەی بخوێنێت،و بەدرێژایی دەسەڵاتی عەلی پاشا، لەوێدا مایەوەو سەرقاڵی خوێندنی زانستی ئایینیو زمان بوو. ئەو ماوەیە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، لەسەر پێکهێنانی کەسایەتیی داود،و وای لێکرد کاتێ دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، لەگەڵ سەردەمی والییەکانی دیکەدا جیاوازیی هەبێت.

دوای ئەوەی عەبدوڵڵا پاشا توتنچی لەساڵی1811دا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، پۆستی بەرێوەبەری کاروباری دارایی بەداود پاشا دا. ئەوەی سەرنج راکێشە، ئەوەیە کاتێ پۆستی نوێی وەرگرت، دەستی لەخوێندنو وانە وتنەوە لەمزگەوتی شێخ هەڵنەگرت، هەروەکو بڵێی دەیویست بۆخەڵکی بسەلمێنێت، کەدونیا رەفتاری ئایینیی ئەوی نەگۆڕیوە، لەقووناق–واتە ئەو فەرمانگەیەی کاری تیادا دەکرد– وانەی ئایینیی دەگوتەوە،و تەلەبە ئامادەی وانەکانی دەبوون،و دوای نوێژی عەسر وانەی دەگوتەوە. کاتێ بوو بەوالی، لەحەفتەیەکدا دووجار وانەی دەگوتەوە، بەیانیانی پێنجشەممە کتێبی بوخاری،و بەیانیانی شەممە کتێبی بەیزاوی دەگوتەوە.



## پەیوەندیی بەخێزانەکەیەوە:

هەر لەوکاتەوەی داود پۆستی گەورەی بەدەستهێنا لەبەغدادا، ئیتر پەیوەندیی بەخێزانەکەیەوە پەیدا کرد، بۆیە دەبینین لەگەڵ ئەوەی دەبێ بەوالیی بەغدا، یەکێك لەبراکانی سەردانی دەکات. لەمانگی ئایاری ساڵی1817دا، ئەم برایەی گەیشتە بەغدا، داود پاشا لەناو خێزانەکەی خۆیدا داینا. ئەم برایەی مەسیحی بوو، تەنیا بەزمانی گورجیو ئەرمەنی قسەی دەکرد، ناوی گیو بوو. داود ناوەکەی گۆڕی کردی بەسولەیمان، بەبێ ئەوەی ئایینەکەی بگۆڕێت. لەمانگی ئابی هەمان ساڵدا، بەرەو وڵاتەکەی خۆی، بەغدای بەجێهێشت، دوای ئەوەی بیست هەزار قروشی لەسلێمانییەوە بۆتەرخان کرا

گەڕیدەی بەریتانی سێر کیێر بۆرتەر دەگێرێتەوە، کەکاتێ گەیشتۆتە بەغدا، لەتشرینی یەکەمی1818دا، لەگەڵ کۆنسوڵی بەریتانیا میستەر ریچ، سەردانی والی داود پاشای لەبارەگاکەی خۆی کردووە، کاتێ داود پاشا زانی لەگەشتەکەیدا، بەجۆرجیادا رەتبووە، سۆزی بزواوەو، سەبارەت بەوڵاتەکەیو کەسوکارەکەی هەواڵی پرسیوە، ئەویش ئاگاداری کردۆتەوە، کەدایكو باوکی نیشتەجێی تەفلیسن، ئەویش دەخوازێت نامە بۆفەرمانڕەوا روسەکەی جۆرجیا بنووسێت، بۆئەوەی

چاوی لێیان بێت. داود پاشا نامەکە دەنووسێت، لەگەڵ دیارییەکی بەهاداردا، دەینێرێت، بەڵام دیارییەکە بەدەستییان ناگات، چونکە کوردەکان لەنزیکی ماردین، کابرا رووت دەکەنەوە.

## کێشەی خێڵەکان:

لەکۆتایی شوباتی ساڵی1817دا، داود پاشا لەبەغدادا دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت، گرنگترین کێشە کە لەیەکەم ساڵی دەسەڵاتیدا رووبەرووی بووەوە، کێشەی خێڵەکان بوو، و بەدەستی چارەسەرکردنییەوە، ماندوو بوو، و ئەگەر بارودۆخەکە یارمەتیی نەدایە، ئەوا سەری تیادا دەچوو.

لەبەشی پێشوودا بینیمان، کەچۆن کێشمەکێش لەسەر دەسەڵات لەنێوان مەمالیك، لەپانزە ساڵی رابردوودا توند بوو–دوای کۆچیی دوایی سولەیمانی گەورەوە، تاسەردەمی دەسەڵاتی داود پاشا–و خێڵە عیراقییەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە، و ئەوەیش دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆیان، کۆنترۆڵی رێگاوبانەکانیان کردو رێگەیان بەکاروانەکان دەگرت، و دەیاندا بەسەر یەکدیدا، و باجیان لەسەر یەکدی دادەنا، و ئەمەیش وایکرد کەکۆمەڵگەی عیراق، بەشێوەیەك کەلەتوانادا نەما، بەدەستی دەسەڵاتی خێڵەکایەتییەوە بناڵێنێت.



رەسووڵ کەرکووکلی دەڵێت:(لەسەروبەندی ئەو ئاژاوەیەدا کەسەرانسەری وڵاتی گرتبووەوە، زۆربەی خێڵەکان یاخی بووبوون، کاتێ داود پاشا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، هەموو خێڵەکان لەخۆیانەوە ملیان دا، تەنیا خێڵی بنەماڵەی تەمیمو شەمەرو باویو ریفاعیو نەجادەو بنەماڵەی عومەیر نەبێت، ئەوانە لەناو خۆیاندا رێککەوتن، و لەشوێنێکی نزیکی مەحموودییە کۆبوونەوەو لەوێوە پەلاماری کاروانچییان دەدا، ئەگەرچی لەحکومەتیشەوە نزیك بوون...).[1] داود پاشا سێ جار پەلاماری ئەو خێڵانەی دا، و توانی پەرتەوازەیان بکاتو دەست بەسەر سامانو مەڕومالاتیاندا بگرێت.

دوای ئەوەی داود پاشا لەشەڕەکانی لەگەڵ خێڵە یاخییەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئیتر وایزانی دەتوانێت نەریتیی داگیرکاریی لەنێوان خێڵەکاندا بەتەواوی بنبڕ بکات، و رەنگە لەوەدا ویستبێتی لاسایی وەهابییەکان بکاتەوە، فرمانێکی گشتیی بۆخێڵەکان دەرکرد، تیایدا پەلاماردانی یەکدی قەدەغەکرد(چونکە موسڵمانن، و ئیسلامیش رێگە بەداگیرکاریی نادات). داود پاشا ویستی ئەم فرمانە بەزۆر بسەپێنێت، هەرکە بیستی یەکێك لەهۆزەکانی شەمەر پەلاماری خێڵی حەدیدینی داوە، یەکسەر هێزێکی نارد بۆتەمێکردنی ئەوخێڵە دەستدرێژیکەرە، و لەسزای ئەوەدا، پێنج سەد حوشتریان لێیان سەند. دواتر هێزێکی دیکەی نارد

[1] رەسووڵ کەرکووکلی(دوحة الوزراء) وەرگێڕانی موسا کازم نەورەس–بەیرووت، ل277.

بۆتەمێکردنی بنەماڵەی یەسار لەفوراتی ناوەڕاست، دوای ئەوەی پەلاماری یەکێك لەخێڵەکانیان دابوو.

ئەوەی داود پاشا ئەنجامی دا، بەمەبەستی ڕێگەگرتن لەپەلاماردانی خێڵەکانی بۆسەر یەکدی، وەکو ئەوە وابوو، کەحەسەن پاشا، لەساڵی 1704دا ئەنجامی دا،و ئەوەی کەنازم پاشایش لەساڵی 1910دا کردی، بەڵام هەر هەموویان لەوکارەدا شکستیان هێنا. دیارە خێڵەکان ناتوانن دەست لەنەریتی داگیرکاری‌و پەلاماردان هەڵبگرن، مەگەر بەوەی دەست بدەنە پەلاماردانیکی دیکە، کە لەوی پێشوو دەستکەوتی زیاتر هەبێت، هەروەکو ئەوەی بەلای هۆزەکانی نەجدییەوە، لەسەروبەندی بزاوتی وەهابییەکاندا رووی دا–هەروەکو چۆن لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان بۆکرد–چونکە ئەوان لەشەڕکردن لەپێناوی خوداو داگیرکردنی کافرانەدا، هێندە دەستکەوتیان هەبوو، کەقەرەبووی ئەو پەلامارو داگیرکارییە بچووکانەیان بۆبکاتەوە، کەپێشتر لەسەری راهاتبوون.

---

عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(مطالع السعود) کورتکردنەوەی ئەمین حەلوانی–قاهیرە1371ھ–ل131–132.



## کێشە لەگەڵ ئێراندا :

گەلێ جار ناوچەی کوردستان دەبووە مایەی کێشەی نێوان ئێران‌و عیراق، ئەگەر لەنێوان ئەمیرە کوردەکاندا، لەسەر دەسەڵات مێملێ دروست ببوایە، ئەوا هەندێکیان خێرا خۆیان دەگەیاندە لای حکومەتی ئێران،و داوای یارمەتی لێدەکرد، بۆبەگژاچوونەوەی دوژمنەکانیان،و ئێرانیش ئەو دەرفەتەی دەقۆستەوە،و هێزی دەنارد بۆیارمەتی ئەم یان ئەو لایەنانە، کەئەوەیش دەبووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا، ئەمە لەکۆتایی ساڵی1817دا رووی دا–واتە بەر لەوەی ساڵی یەکەمی دەسەڵاتی داود پاشا کۆتایی پێبێت.

بەهەر حاڵ، دەتوانین بڵێین، کەعیراق لەساڵی 1805وە، هەڕەشەی داگیرکردنی لەسەربوو، لەلایەن ئێرانەوە، کاتێ کەشازادە محەممەد عەلی میرزا کرا بەفەرمانداری کرماشان. ئەم پیاوە بەخاوەن کەسایەتییەکی بەهێز،و تەماعکارو دڕندە ناوی دەرکردبوو، هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، سوپاکەی لەسەر شێوازی ئەوروپی ڕێکدەخست‌و بەشێوازێکی نوێ ئامادەی دەکرد،و خەریکبوو لەسەردەمی سەعید پاشادا، پەلاماری عیراق بدات، ئەگەر باڵیۆزی بەریتانیا، لەئێران

نەکەوتایەتـە نێوانـەوەو شـای والێنەکردایـە ڕێـز لەسـنوورە کۆنـەکان بگرێت.

لەسـەرەتای1818دا، شـازادە کێشـەیەکی قۆسـتەوە کـە لـەنێوان میرەکانی باباندا رووی دا، کەلایەنێکیان داوای یارمەتییان لێکردبوو، سێ سوپای رەوانـە کـرد بەمەبەسـتی داگیرکردنـی بەغـدا: یـەکێکیان لەبـەری سلێمانییەوە، بەسـەرکردایەتی محەممـەد عـەلی ئاغـا بـەیاتی،و دووەمیـان لەبەری مەندەلییەوە، بەسەرکردایەتی حەسەن خانی فەیلی، سێیەم لەبەری بەدرەو جەسانەوە، بەسەرکردایەتی کەڵهوڕ عەلی خانو کەلب عەلی خان.

لەم کاتەدا، کەهەڕەشە لەسەر بەغدا هەبوو، سادق بەگی برای والیـی پێشوو رایکردو پەنای بردە بەر شـەفلەح شـەلالی شـێخی زوبێـد، هـەروەکو بلێی هەمان کار ئەنجام بدات، کەبراکەی لەسـەردەمی والـی عەبدوڵلا پاشا توتنچیدا ئەنجامی دا، کاتێ پـەنای بـردە بـەر شـێخی مونتـەفیق، هـەروەکو ئـەوەی لەبەشـی پێشـوودا باسمان کرد. شـێخ شـەفلەح پێشـوازیی لێکـرد، هـەروەها جاسم شـاویش چووە ریزیانـەوە، کـەداود پاشا منـەی کوشـتنی دەکرد، بەمـەیش هێزێکـی خێڵەکایـەتیی گـەورەی پێکـەوەنا،و دەسـتیکرد بەپەلاماردانی گوندو شارەکانو ڕێگاوبانی بەکاروانو کەشتییەکانی نێوان بەغداو بەسرە، لەسەر شێوازی(دەست بوەشێنەو رابکە)هەڵچنیبوو.

ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)وەرگێڕانی جەعفەر خەیات– بەغدا1962–ل243.

ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل159.



ئـەو ڕۆژانـە ناهـەموارترین ڕۆژگـاری داود پاشـا بـوون، لەهەموولایەکـەوە مەترسـی رووی تێکردبـوو، بـەڵام بـەرنگارییان بـووەوەو سـەلماندی کـە لەوپیاوانەیـە، کەلـەکاتی تەنگانـەدا، توانییـەکانیان دەدرەوشـێتەوە. داود پاشا هەسـتی بـەوە کـرد کـەناتوانێت، لەیـەك کاتـدا لەگـەڵ هێزەکـانی ئێـرانو خێڵەکانـدا بجـەنگێت، ئەوەبوو پـەنای بـردە بـەر گزی،و شێوازی(دووبەرەکی دروست بکە، سوود دەبینی)ی لەگـەڵ خێڵـە یاخیبووەکانـدا گرتەبـەر، کـە بـەوە تـوانی دوان لـەدوژمنانی شـێخ شـەفلەح شـەلال، کـەململانێیان دەکـرد لەسـەر سـەرکردایەتی بەسـەریدا باڵادەسـت کـرد، کەعـەلی بەنـدەرو شـبیب دەروێـش بـوون، ئـەم دوو پیـاوە لەگـەڵ هەوادارەکانیانـدا، توانییـان بەسـەر شـەفلەحدا سـەربکەونو هێزەکـانی تارومار بکەن، ئەوو سادق بەگو جاسم شاوی رایان کردو پەنایان بردە بەرخێڵەکانی عەفەج لەفوراتی ناوەڕاستدا.

دوای ئـەوەی داود پاشـا، لـەم بەرەیـەوە پشـووی دا، رووی کـردە سـوپای داگیرکـەری ئێـران. دیـارە تـوانی رەزامەنـدیی شـازادە بەدەسـت بهێنێتو پـەیمانی ئاشـتیی لەگەڵدا ببەسـتێت، رەزامەنـدیی لەسـەر هـەموو مەرجەکانی شازادە دەربڕی، لەپێناوی ئاشتیدا، کەهێشتنەوەی مـەحموود پاشای بابان، بەفەرمانڕەوای سلێمانی یـەکێك لـەو مەرجانـە بوو. دوای چـەندین نامـە گۆڕینـەوو دانوسـتان کـەدوو مـانگی خایانـد، لەکۆتاییـدا ئاشـتی لەنێوانیانـدا بەرقـەراربوو، بـەڵام ئاشـتییەکی تەمـەن کـورت بـوو، درێژەی نەکێشا، هەروەکو ئاماژەی پێدەکەین.

عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(داوود باشا والي بغداد)–قاهیرە 1968–ل167–168.

## شۆڕشێکی خێڵەکیی دیکە :

دوای ئـەو سـەردەمە پـڕ لەنەهامەتییـە، داود پاشـا تـەنها بۆچـەند مانگێـك پشـووی دا. لـەپاییزی 1818دا، لـەبیابانی شـامەوە، خێڵکـی سارانشین، بەناوی سقوور هـاتن، کەسـەر بەعـەنزە بوون، گەیشتنە نزیکی موسـەییەب، و دەسـتییان دایـە ئـاژاوەگێڕیو چـەتەگەری، داود پاشـا هێزێکی سەربازیی بەسەرکردایەتی بەڕێوەبەری داراییەکەی بەناوی یـەحیا ئاغـا نـارد بۆیـان، و لەشـوێنێك لـەرۆژئاوای موسـەیەبدا، بـەخێڵی سـقوور گەیشت، خێڵەکە گاڵەیان پێکردو شکاندیان.

تـازە هـەواڵی ئـەو شـکانە بڵاوبـووەوە، کەتووشـی سـوپای حکومـەت هـات، تاهەنـدێ لەخێڵـەکان بەچاوقایمییەوە، یاخیبوونیـان دژی حکومـەت راگەیانـدو دەسـتیان کـرد بەچـەتەگەری. لـەباکووردا، مەشـکوور زویـنی شـێخی شـەمەر ، هـەروەها خێڵـەکانی عەفـەجو جلیحـەو بنەماڵـەی فەتلـە لەباشووریشـدا، یـاخیبوونی خۆیـان راگەیانـد، خێڵـی زوفـەیریش کەوتنـە هەڕەشـەو گوڕەشـە لەگەشـتیارانی مـەزارە پیرۆزەکـان لـەنێوان نەجـەفو کەربـەلادا، و ڕێگـەیان پێـدەگرتن، و عـەباس حـەدادی سـەرۆکی زەقـرەت



لەنەجەف، پەلاماری دوژمنـەکانی خۆیـان، شـەمرەت دەدا، بۆئەوەی هـەموو نەجەف بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

داود پاشـا جموجـوڵی سـەرکوتکەرانەی خـۆی لـەباکووردا دەسـت پێکـرد، کەهییـە بەڕێزەکـەی خـۆی محەممـەد ئاغـای، بـەهێزێکی گـەورەوە رەوانـەی خێڵـی شـەمەر کـرد، و کەهییـە دوای هـەژدە سـەعات ڕێگـەبڕین، توانی لەپڕ بدات بەسەر خێڵەکەدا، و خێڵەکە رایانکردو هەرچی سامانیان هەبوو، بۆسوپاکە بەجێیان هێشت. دەستکەوتی سوپا لـەو کاتـەدا، هەشت هەزار سەر مەڕو پێنج سەد حوشترو دووسەد بەچکە حوشتربوو، وێڕای خێوەتو شتومەکەکانیان.

ڕۆژی یەکەمی مانگی تشرینی دووەمی 1818، کەهییە محەممەد ئاغـا هێزەکـانی خـۆی، لەبەغـداوە بـەرەو فـوراتی ناوەڕاسـت جوڵانـد، بۆتـەمێکردنی خێڵـە یاخیبووەکـان لەوناوچـەیەدا، لەوهێرشـەیدا هەنـدێ لـەکوردەکان بەسـەرکردایەتیی عەبـدوڵڵا پاشـای بابـان، و خێڵـی عـەقیلی کەرخی، لەگەڵیدا بوونو خێڵی خەزاعیل، وبنەماڵەی بەعیجیش یارمـەتییان پێشـکەش کـرد. لـەنزیکی شارۆچـکەی کەفـەل، کەهییـە گەیشـت بەسـەرۆکەکانی سـقوور، کـەژمارەیان هـەژدە کـەس بـوو، لەوانـە حەمـدان قعێشـیشو ئـیبن هـوزال زەیـد حەمیـدی، و شـێخی عـەقیل کەوتـە نێـوان کەهییەو ئەوانـەوە، لێبـوردنی بۆدەستەبەر کـردن. ئـەوان لەگـەڵ کەهییـەدا ڕۆیشـتن تاگەیشـتنە کوفـە، لـەوێ کەهییـە فرمـانی دا بیـانگرنو بەدەسـت بەسـتراوی رەوانـەی بەغـدا بکـرێن. شـێخی عـەقیل لەمـە تـوڕە بـوو، کەوتـە

عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين)–بەغدا1954،ب6، ل257.

هـاوار کـردن و نـارەزایی دەربـڕین، چـونکە ئـەو لەنێوانیانـدا بـوو، بـەڵام هاتوهاوارەکانی بێ سوود بوو.

دوای ئەوە کەهییە رووی کردە خێڵەکانی عەفەج و بنەماڵـەی فەتلـە، لەگەڵیاندا کەوتە شەڕی توندەوە-بەتایبەتی لەدەوروبەری قەڵای شخێر غانم-کەکەهییە تیایدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، سوپاکە هەزار تەغار گـەنمی دەسـتکەوت، هـەروەها پـەنجا هـەزار قروشـی وەکـو سـزا بەسـەر جلیحەو بنەماڵـەی فەتلـەدا سەپاند، و وەرگرتنی ئەو باجانـەی لەئەستۆی خەزاعیل نا.

## کێشەی عەبباس حەداد:

عـەباس حـەداد، هـەر لەناوەکەیـەوە دیـارە، سـەرەتا خـەریکی ئاسنگەری بوو، کاتێ وەهابییەکان، لەساڵی 1802دا، پەلاماری نەجەفیان دا، نـاوی لـەناو زومـرەی ئازاکانـدا درەوشـایەوە، کەبـەرگرییان لەشـارەکە کردو لەمەترسی رزگاریان کرد. دواتر شێخ جەعفەر کاشیف غیتا داوای یارمـەتی لێکـردو کـردی بەسـەرکردەی کۆمـەڵێ لاوی چـەکدار، بۆئـەوەی لەسەر پێ بن، لـەکاتی هـەر دەستدرێژییەك کەبکرێتـە سەر شارەکە. دیارە هێزەکەی عەباس حەداد، لەگـەڵ تێپـەڕبوونی رۆژدا گەشـەی کـرد، تا وەکو پۆلیسی جێبـەجێکاری لێهات بۆشێخ جەعفەر، لەچوارچێوەی شارەکەدا، فرمانەکانیان رادەپەڕاند، و لەجێبەجێکردنی بڕگەکانی شەرع تیایدا، ئەگەر

عەبدولعەزیز نەوار(سەرچاوەی پێشوو)ل104.

عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو) ب6 ل262.



شێخ بیویستایە کەسێك بانگ بکات، یان سزای بدات، حەدادی دەنارد بۆکاری پێویست.

رۆژێکیـان ژنێـك بـەناوی (دایکـی سـەعد) هـات بـۆلای شـێخ-کەخوشـکی سـەید محەممـەدی سـەرۆکی گونـدی رەحبـە بـوو- سـکاڵای لەدەستی براکـەی هـەبوو، کەنەیدەهێشـت خـۆی و خوشـکەکەی شـووبکەن، ئەگەرچـی داواکـاری زۆریـان هـەبوون کەئـەوەیان بـەجۆرێك لەگـەوادی دەزانـی و پێیـان خـۆش نـەبوو، تەنانـەت جووتبـوونی زینـدەوەریش لەماڵەکەیـدا رووبـدات. شـێخ، حـەدادو ئەلەوجەلـەکانی نـارد بـۆلای سـەید مـەحموود، داوای لێکـرد لەئەنجومـەنی شـەرعدا ئامـادە بێـت، بـەڵام سـەید مـەحموود ملـی بـەفرمانی شـێخ نـەدا، ئەمـەیش بـووە هـۆی ئـەوەی شـەڕ لەنێوان ئەوو حەدادا رووبـدات. دواتـر سـەید مـەحموود لـەو سـەروبەندەدا کوژرا، گومانی ئەوە دەکرێت کەبەدەستی حـەداد کوژرابێت. ئەمـەیش وای لەمـەلا محەممـەد تـاهیری کلیلـداری نەجـەف کـرد، داوای خـوێنی سـەید مـەحموود بکـات، لەبـەر ئـەوەی لـەخاڵوانی بـوو. ئەمـەیش زەنگێـك بـوو، بۆهەڵگیرسانی کێشە بەناوبانگەکەی نەجەف لەنێوان زەقرەت و شەمرەتدا-ئەوان سەر بەکلیلدارو ئەمانیش سەربە حەداد بوون-بەمەیش دانیشتوانی نەجـەف بـوون بـەدوو بەشـی دژبەیەکـەوە. گـەلێ جـار، لەسـەر سـەربانی مزگەوت و خانووە بەرزەکانەوە، شەڕە تفەنگییان دەکرد.

کـاتێ داود پاشـا دەسـەڵاتی لەبەغـدادا وەرگـرت، عـەباس حـەداد بەهەڵەداوان خۆی پێ گەیاند، و خۆی فڕێدایە ماڵەکەیەوە، داوای لێدەکرد بەرەسمی بیکات بەفەرمانڕەوای نەجەف، داود پاشا ئەو داوایەی پەسەند

جەعفەر مەحبووبە(ماضي النجف وحاضرها)-نەجەف1958-ب1 ل330-334.

کردو هەرچی ویست پێیدا.[*] بەڵام عەباس حەداد ئەو پیاوەتییەی لەبەرچاو نەبوو، کەداود پاشا لەگەڵیدا کردی، چونکە بینیمان لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا شۆڕشی ڕاگەیاند، هەر ئەوەندە کەهەواڵی شکانی سوپای حکومەتی، لەبەرامبەر خێڵی سقووردا پێگەیشت. کەهییە، ساڵح ئاغای کوردی لەگەڵ دووپەل لەسوپای بۆنارد،و بەکوژرانی حەداد کۆتایی بەکێشەکە هات. ساڵح ئاغا کەللە سەرەکەی حەدادی نارد بۆکەهییە، ئەویش لەلای خۆیەوە، ناردی بۆداود پاشا.

## شادیی سەرکەوتن:

دوای ئەوەی کەهییە محەممەد ئاغا لەتەمێکارییەکانی بووەوە، لەفوراتی ناوەڕاستدا، سی پەلی لەسەربازەکانی خۆی،و چل پەل لەخێڵی عەقیلی لەوناوەدا نیشتەجێ کرد، بۆپارێزگاریی لەئاسایش و کۆکردنەوەی باج، دواتر گەڕایەوە بۆبەغدا. لەسەرەتای ساڵی1819دا بوو کەکەهییە گەیشتە بەغدا،و بەگەرمی پێشوازیی لێکرا،و داود پاشا خەڵاتی کرد.

لەو ساڵەدا، داود پاشا دەستی کرد بەدروستکردنی مزگەوتی گەورە، کەدواتر بەمزگەوتی حەیدەرخانە ناسرا،و تائێستا ماوەو لەسەر شەقامی ڕەشیدە، نزیکی گۆڕەپانی مەیدان، کە بەگەورەترین مزگەوتی بەغدا دادەنرێت. دیارە داود پاشا ئەم مزگەوتەی بەمەبەستی سوپاس کردنی خودا دروست کرد کە لەورۆژە ڕەشانە ڕزگاری کرد.

---

[*] یەعقووب سەرکیس(سەرچاوەی پێشوو) ب2 ل342–343.



ساڵی1819 بەبێ وەی ڕەت بوو بەسەر داود پاشادا، بەڵام لەکۆتایی ئەو ساڵەدا، هەواڵ بەبەغدا گەیشت کەخێڵەکانی دلێم خەریکە یاخی دەبن، بەهاوکاریی لەگەڵ زەوبەع و جەمیلەو ئەلبوعیسادا. لەکۆتایی ساڵی1820دا، کەهییە محەممەد ئاغا هێزەکانی لەبەغداوە بەرەو خێڵەکانی دلێم جووڵاند، کاتێ پێیان گەیشت، شەڕێکی توند بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، لەنێوانیاندا ڕووی دا، شێخ ڕەسووڵ کەرکووکلی کەهاوچەرخی ئەو ڕووداوانە بوو، بەم جۆرە وەسفیان دەکات:( دوای ئەوەی ماوەیەکی کورت بەسەر شەڕەکەدا ڕەتبوو، هێزەکانی کەهییە سەرکەوتن بەسەریاندا،و تاروماریان کردن،و زۆریان لێیان کوشت،و زۆربەی ئەوانەی خۆیان فڕێدایە ئاوی فوراتەوە، لەکاتی شکستەکەیاندا، خنکان،و ئەوانیش دەستیان گرت بەسەر سامان و مەڕومالاتەکانیاندا،و ژن و منداڵیان برد،دواتر ڕوویان لەخێڵەکانی جەمیلەو زەوبەع و ئەلبوعیسا کرد، لەبەر ئەوەی بەنهێنی پەیوەندییان بەخێڵەکانی دلێمەوە هەبوو، بەرەو ناوچەی شفاسە ڕاویاننان،و سەرکەوتن بەسەریاندا،و دوای ئەوەی سزایان دان و هەرچی باج و سەرانە هەبوو کەلەسەریان کەڵەکە بووبوو، لێیان وەرگرتن و گەڕانەوە. دوای ئەم ڕووداوە، دۆخەکە ئارام بووەوە،و ئاشتی باڵی بەسەر بەغدادا کێشاو شاعیران، بەهۆی باشیی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، ستایشی والییان کرد[*]).

دیارە داود پاشا ویستی شادیی ئەو ساڵە دووهێندە بێت، بۆیە بڕیاری دا تۆرسۆن یوسف بەگی کوڕی، بەهۆی تەواوکردنی حەوت ساڵ لەتەمەنی، خەتەنە بکات. بۆماوەی حەوت ڕۆژ ئاهەنگیان گێڕا، لەهەموو

---

[*] ڕەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل291–292.

لایەکەوە خەڵکی بۆپیرۆزبایی دەهاتن، و خێوەتێکی گەورە لەگۆڕەپانی سەرادا هەڵدرا، و سفرە بۆهەموان رازێنرایەوە. لەگەڵ(خوا بیپارێزێدا)زیاتر لەهەزار منداڵی بێ سەرپەرشت خەتەنە کران، و پاشا دیاریو خەڵاتی بەزانایانو پیاوماقووڵان دا. شاعیران ئەم دەرفەتەیان قۆستەوەو شیعریان بۆپیرۆزبایی لەپاشاو ستایشکردنی هۆنییەوە، کەبریتی بوون لەساڵح تەمیمیو فەوزی مەلا محەممەد ئەمینو عەبدوڵڵا بەسریو عوسمانی کوڕی سەنەدو...هتد.

## ناکۆکی لەگەڵ میستەر ریچدا:

لەساڵی1820دا، ناکۆکیی نێوان داود پاشاو کۆنسوڵی بەریتانیا میستەر ریچ توند بوو، و بۆئەوەی لەبنەوانی ئەم ناکۆکییە تێبگەین، دەبێ هەندێ بۆدواوە بگەڕێینەوە، تاشتێك لەژیانی میستەر ریچ تاوتوێ بکەین، دوای ئەوەی لەساڵی 1808دا کرا بەکۆنسوڵ لەبەغدادا.

دەتوانین بڵێین میستەر ریچ یەکەم کەس بوو توانی نوێنەری بەریتانیا لەعێراقدا بسەپێنێت، و لەو کارەدا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا، تاوایلێهات کەسایەتیی ئەو لەکەسایەتیی داود پاشا بەهێزتر بوو، چونکە خەڵکی دەیانزانی والییەکان زوو بەزوو دەگۆڕێن، یان یەکدی

عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل266.



دەکوژن، بەڵام میستەر ریچ، بەبێ گۆڕان لەپۆستەکەیدا دەمێنێتەوە. بۆیە خەڵکی متمانەیان بەبەڵێنەکانی پاشاو داروودەستەکانیان نەدەکرد، ئەگەر گەرەنتیی میستەر ریچی لەگەڵدا نەبوایە، و پێیان دەگوت باڵیۆز-کەزاراوەیەکی ئیتاڵییە بەمانای کۆنسوڵ-ئیتر ناوی باڵیۆز کەوتە سەر هەموو زمانێك لەبەغدادا.

ئەو شێوازانەی ریچ گرتییە بەر بۆپشتگیریکردن لەنوێنی لەکۆمەڵگەی بەغدادا، ئەوەبوو پشتی بەرواڵەتی زەرقو بەرقو ئەتەکێت دەبەست، ئەوەی دەزانی کەمرۆڤ لەم کۆمەڵگەیەدا، بەپێی پابەندبوونی بەوئەتەکێتو رێورەسمانەوە رێزی لێدەگیرێت، بۆیەجلوبەرگی ئالاو والای بۆپاسەوانانی کۆنسوڵگەرییەکەی تەرخان کرد، لەکاتی هاتنە دەرەوەو گەڕانەوەی باڵیۆز بۆبارەگاکەی، بەتەپڵو جووقەوە، بەڕێ دەکرا، و زۆرجار تەماشاکەران لەخەڵکی بەغدا، لەم بەرو ئەو بەری شەقامەکاندا دەوەستان، و سەریان لەو رێوڕەسمە سووڕ دەما.

کاتێ داود پاشا لەبەغدا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، میستەر ریچ لەرێورەسمێکدا ئامادە بوو، بۆئەوەی پیرۆزبایی لەوالی بکات، بەهۆی پۆستی نوێیەوە، بەو مەزەنەیەی ئەویش وەکو والییەکانی دیکە وایە، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بۆی دەرکەوت، کە بەهەڵەدا چووە.

لەساڵی1820دا، داود پاشا لەپڕ باجی سەر هاوردەو ناردەی کاڵای بەریتانیای دووهێند کرد، کاتێ میستەر ریچ نارەزایی دەربڕیو

کلۆدیوس جیمس ریچ(رحلة ریج في العراق عام 1820)وەرگێڕانی بەهادین نووری-بەغدا1951-ل20.

گـوتی کەبەریتانییـەکان مـافی دیاریکراویـان هەیـە،و ئەسـتەنبولٚ بڕیـاری لەسـەرداوە، داود پاشا گـوتی، ڕێگـە بـەهیچ مـافێکی ئـەوروپی لەبەغـدادا نـادات. خێـرا ریـچ کاردانـەوەی هـەبوو، بەرامبـەر ئـەو کـارەی داود پاشـا، ئــەوەبوو فرمــانی بەجێگرەکــەی لەبەســرە دا ڕێگــە بــەو کەشــتییانەی لەهیندەوە دێن، نەدات لەبەندەری بەسرەدا لەنگەر بخەن، هـەروەها فرمـانی پێـدا، ڕێگـە بـەو کەشـتییانەیش نـەدات ئـەویٚ بـەجیٚ بهـێڵن، کەپێشـتر گەیشتوونەتە ئەویٚ.[*] دواتر ریچ رایگەیاند کە بەنیازە بۆبۆمبی بڕوات، بۆئەوەی ئەو کێشەیە لەگەڵ بەرپرسـان لـەویٚ تـاوتویٚ بکـات، بـەڵام داود پاشا ڕێگەی پیٚ نەداو فرمانی بەسـەربازەکانی دا، بارەگـای کۆنسـۆڵگەریی گەمارۆ بدەن.

ئـەو سـەردەمە، بارەگـای کۆنسـۆڵگەری لەسـەر ڕووبـاری دیجلـەبوو، لەبـەری رەسـافە-نزیکـی پـردی ئـەحراری ئێسـتا-و یـەختێکی چـەکدار لەنزیکیدا دەوەستا، بۆپارێزگاریکردنی. داود پاشا لەبەرامبـەری، لەوبـەری ڕووبارەکەوە، تۆپێکی دابەست، بۆئەوەی لـەکاتی پێویستدا کۆنسـۆڵگەری تۆپباران بکات. ریچ لەبەرامبەر ئەو کارەدا دەستەوەستان نەوەستا، بـەڵکو ویســتی بۆخــەڵکی بەغــدای بســەلمێنێت، کەهێشــتا هــەر ئــەو بــاڵیۆزە بەدەسەڵاتەیە کەمتمانەیان پێی هەبوو.

ریـچ بڕیـاری دا ، بـەو پاسـەوانانەی لەبەردەسـتیدا بـوون، بـەرگریی لەکۆنسـۆڵگەرییەکە بکـات. بەرێکـەوت لەوکاتـەدا، ژمارەیـەك لەئەفسـەرانی کۆمپانییایـەکی هینـدی میـوانی کۆنسـۆڵگەری بـوون،و ریـچ راوێـژی بـەوان کـرد، سـەبارەت بـەپلانی بـەرگری. بارەگاکـەی کـرد بەچـەند بلۆکێکـەوە،و

[*] محەممەد کوڕی ئەحمەد حوسێنی(رحلة المنشي البغدادي)-وەرگێڕانی عەبباس عەزاوی-بەغدا1948-ل18.



هێزەکـەی بەسـەریاندا دابـەش کـرد،و دەوروبـەری قـایم کـرد،و بۆخـۆی سەرپەرشـتیی پێگـەکانی بـەرگریی دەکـرد، وەکـو چـۆن سـەرکردەیەکی سەربازیی گەورە سەرپەرشتی شەڕێکی چارەنووسساز دەکات، یان وەکو ناپلیۆن چۆن چاوەڕوانی واترلۆیەکی دیکەی دەکرد.[*]

دیارە داود پاشا دەرکی بەوە کرد کەئەم دەستپێشخەرییە، رەنگـە کێشـەی نێودەوڵـەتی لێبکەوێتـەوە، بۆیـە بەمەبەسـتی دانوسـتان، هەنـدیٚ لەکارمەندەکانی نارد بۆلای ریچ، ئەویش بەتوڕەییەوە پێشوازیی لێکردن،و گاڵۆکی لیٚ بەرزکردنەوە، دواتر بەسووکایەتی پێکردنەوە، دەریکردن. داود پاشـا شـاندێکی دیکـەی بـۆلای ریـچ نـارد، کـە لەسـکرتێرو بەڕێوەبـەری خەزێنــە عــەزرە پێکهــاتبوو، ئــەم شــاندە ســەرکەوتنی بەدەســت هێنــا، لەئەرکەکەیـدا،و لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتن، داود پاشـا ڕێگـە بـەریچ بـدات لەعیراق دەربچێت،و لەبەرامبـەردا ریـچ یاداشـتنامەیەك بنووسێت،و تیایـدا دان بـەوەدا بنێت کەبەباشـی مامەڵـەی لەگەڵدا کـراوە،و بـەئارەزووی خـۆی عیراق بەجیٚ دەهێڵێت.[*]

سەید محەممەد ئاغا مەنشی-کەلای ریچ نووسەر بوو- دەڵێت ریـچ توانـایی ئـەوەی هـەبوو دەسـت بەسـەر بەغـدادا بگرێـت، لـەو ڕووداوەدا، چونکە ئینکشارییەکان‌و پیاوماقووڵان‌و خەڵکی بەغدا هەواداری ئەوبوون، بەڵام ئەو کارەی نەکرد، چونکە ئاشتیخواز بوو،و حەزی بەئاژاوەو بشێوی نەدەکرد.[*]

[*] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(سەرچاوەی پێشوو)9ل210.
[*] سەرچاوەی پێشوو، ل211.
[*] محەممەد کوڕی ئەحمەد حوسێنی(سەرچاوەی پێشوو) ل20.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت، کەریچ پەیوەندیی توندوتۆڵی بەئینکشاریو پیاوماقوولانی بەغداوە هەبوو،و هەر ئەوان بەڵێنی ئەوەیان پێدابوو، لەکاتی کێشمەکێش لەگەڵ والیدا یارمەتی بدەن، لەمەوە، ئەوەمان بۆروون دەبێتەوە کەریچ پلانێکی سیاسی درێژخایەنی دارشتبوو، لەپێناوی ئەوەی عیراق بخاتە ژێر نۆرێنی بەریتانیاوە، بەڵام داود پاشا، هەموو هەوڵەکانی بەبادا دابوو،و ناکامی کرد.

هەرچۆنێك بێت، ریچ لە11ی ئایاری 1821دا بەغدای بەجێ هێشت،و بەیەختێکی تایبەت دوای هەشت رۆژ گەیشتە بەسرە، لەوێوە سواری کەشتییەکی بەریتانیا بوو، بەمەبەستی بوشەهر، لەوێوە بۆشیراز رۆیشت، بۆبینینی شوێنەواری(تەختی جەمشید) کەلەو شوێنەوە نزیك بوو. ریچ بەهۆی نەخۆشیی کولێراوە، کە لەپڕ لەشیرازدا بڵاوبووەوە، گیانی لەدەست دا.

حکومەتی بەریتانیا کابتن تەیلەری لەشوێنی ریچ، لەکۆنسۆڵگەریی بەغدا دامەزراند، ئەم پیاوە پێشتر ئەرکی جێگری کۆنسۆڵی لەبەسرە لەئەستۆدا بوو. تەیلەر سیاسەتێکی رێك پێچەوانەی ریچی لەگەڵ داود پاشادا گرتەبەر، بەجۆرێ لەجۆرەکان، نێوانیان خۆش بوو.

## نەخۆشیی کولێرا:

پێشتر ئاماژەمان بەبڵاوبوونەوەی نەخۆشیی کولێرا کرد لەشیرازدا، کەبووە هۆی مردنی میستەر ریچ، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەئەم نەخۆشییە لەهیند، لەرێگەی کەشتییەوە گەیشتە ئەو ناوچەیە، سەرەتا لەشارەکانی کەنداو، وەکوبەندەر عەبباسو بوشەهردا بڵاوبووەوە، دواتر لەسەرەتای مانگی ئابیساڵی1820دا گەیشتە بەسرە. دیاربوو خەڵکی عیراق ماوەیەکی زۆربوو، لەو نەخۆشییە دووربوون، چونکە ئەوان زیاتر سەروکاریان لەگەڵ نەخۆشی تاعووندا هەبوو،و کاتێ نەخۆشیی کولێرا هات، دەستەپاچەبوون،و نەیاندەزانی چۆن چارەسەری بکەن،و ناویان نا(هەوای زەرد)و (ئەبو زۆعە). ئیبن سەنەد کەلەو کاتەدا نیشتەجێی بەسرە بووە، بەم جۆرە وەسفی نەخۆشییەکە دەکات:

(لەوساڵەدا، نەخۆشییەکی گەورە لەبەسرەدا بڵاوبووەوە، خەریك بوو هەموو خەڵکی بەسرە لەناو ببات، زۆربەی ماڵەکان کەسیان تیادا نەماو قوفڵ دران،و رێگاوبانەکان پڕبوون لەلاشەی مردووەکان، بەبێ ئەوەی بناسرێنەوە، زۆربەی خەڵکەکە شاریان بەجێ هێشت بەرەو بیابان، ئەمەیش وەکو ئەوتاعوونە وایە، کەئیمام نەوەوی باسی دەکات، کەرەوانیو رشانەوە نیشانەیەتی. ئەم نەخۆشییە لەگەڵ ئەوەی کەسەکەی تووشی رەوانیو رشانەوە دەکرد، میزیشی پێنەدەکرا، ئەگەر میزی بکردایەن ئەوا رزگاری دەبوو. ئەم نەخۆشییە لەکۆتایی شەوالەوە تا کۆتایی زیلقەعدە لەبەسرەدا بەردەوام بوو، بەڵام لەسەرەتای زیلقەعدەوە تادوانزەی هەمان مانگ گەلێ توند بوو، دواتر لەهەڵکشانو داکشاندا بوون تا بەتەواوی نەما. کەسی نەخۆش تووشی تایەکی بەرز دەبوو، هەندێ لەو تووشبوانە، خۆیان فڕێدەدایە ناو ئاوی ساردەوە، بەڵام سوودی نەبوون بەنەخۆشییەکە دەمردن. پزیشکەکان سەریان سووڕمابوو، لەوەی چارەسەری نەبوو،و بەتەواوی هۆکەیان نەدەزانی، بەڵکو هەرحەکیمێك بۆچوونی جیاوازی هەبوو، ئەمەیش بەڵگەیە بۆئەوەی زانیاریی تەواویان

لەسەری نەبوو، چونکە راستیی یەکێکەو کەس لاری لەسەری نییە، بەلاّم ئەوان بەڵگەکانیان گومان لێکراوبوو).

لەناوەڕاستی مانگی ئابدا، نەخۆشییەکە لەبەسرەدا توندبوو، دواتر بەرەو باکوور بلاّوبووەوە، گەیشتە سوقی شیوخ‌و عەرجەو سەماوەو نەجەف‌و کەربەلاو حیللە،و دواتر بەغدا، لەوێوە بۆکەرکووك‌و سلێمانی. داود پاشا داوای هاوکاریی لەکارمەندانی کۆنسوڵگەریی بەریتانیا کرد، بۆرێگەگرتن لەتەشەنەکردنی نەخۆشییەکە،و حەکیمی باڵیۆزخانە هەندێ دەرمان‌و رێنمایی، بەمەبەستی خۆپاراستن لەنەخۆشییەکە پێشکەش کردن‌و زانیارییەکان لەئینگلیزییەوەوەرگێڕرانە سەر زمانی تورکی،و بەسەر لایەنە پەیوەندیدارەکاندا گشتێنرا، بۆئەوەی کاریان پێبکرێت.

## پەلاماردان لەلایەن ئێرانەوە:

لەکاتێکدا عیراق بەدەستی نەخۆشیی کولێرەوە دەینالاّند، کەلەهیندەوە بۆی هاتبوو، ئێرانیش بەهێزی داگیرکارەوە، بەجۆرێکی دیکە هەڕەشەی لەعیراق دەکرد.

هەرجارێ لۆنکریك دەڵێت، سەد هۆ لەئارادابوو، بۆئەوەی کێشمەکێشی نێوان عیراق‌و ئێران سەرهەڵبداتەوە، لەوانە رەفتاری بەدی تورکەکان، لەگەڵ گەشتیارە ئێرانییەکان لەعیراقداو پەنابردنی هەندێ

عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل143–144.

رەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو)ل298.



لەمیرانی بابان بۆمحەممەد عەلی میرزای فەرمانداری کرماشان. شازادە سەردانی فەتح عەلی شای باوکی خۆی کرد، تاوەکو رێگەی پێبدات، عیراق داگیر بکات. باڵیۆزی روسیا لەوێ هانی دا،و بەمەیش شا رێگەی بەکوڕەکەی دا،چی دەوێت ئەنجامی بدات.

عەبدوڵلا پاشای بابان، یەکێك بوو لەو کوردانەی پەنایان بەشازادە لەکرماشان برد، شازادە فرمانی دەرکردو کردی بەفەرمانداری سلێمانی، لەجیاتی مەحموود پاشای برازای، کەلەلایەن داود پاشاوە کرابوو بەفەرمانداری سلێمانی. عەبدوڵلا پاشا دەستیدایە پەلاماردانی سنووری عیراق لەناوچەی خانەقینەوە، دواتر بەهێزێکی گەورەوە بەرەو سلێمانی پێشڕەویی کرد،و شازادە لەدواوە، بەهێزێکی پانزەهەزار سوارەوە، پشتیوانی دەکرد، دواتر لەعیراقدا، کەیخەسرەو بەگی سەرۆکی خێڵی جاف چووە پاڵی.

داود پاشا هەواڵی بۆسوڵتان لەئەستەنبوڵ ناردو لەو مەترسییە ئاگاداری کردەوە،و سوڵتان شەڕی لەدژی ئێران راگەیاند،و هێزێکی لە(هایتە) ناردبۆ یارمەتیدانی داود پاشا، کە لەپێنج هەزار ئەلبانی پێکهاتبوو. داود پاشا ئەم هێزەی تێکەل بەهێزەکانی خۆی کرد،و لەگەڵ چل تۆپدا ، بەسەرکردایەتیی کەهییە محەممەد ئاغا رەوانەی سلێمانی کرد. کەهییە لەئەیلوولی1821دا گەیشتە زەنگاباد،و دوای ئەوەی چل

ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو)ل244.

ڕۆژ چاوەڕوانی کرد، لەرێگەی کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی پێشڕەویی کرد. نزیکی سلێمانی شەڕ لەنێوان هەردوولادا دەستی پێکرد،و سوپای کەهییە شکا. دەڵێن شکستەکە لەلایەن خودی کەهییەوە داڕێژرابوو، گوایا بەنهێنی لەگەڵ شازادەدا ڕێککەوتبوو، دوای ئەوەی شازادە بەڵێنی ئەوەی پێدابوون دوای داگیرکردنی بەغدا، بیکات بەوالی.

دوای ئەو شکستە، ڕێگە لەبەردەم سوپای ئێراندا هەمواربوو، بەرەو بەغدا پێشڕەویی کرد، تاگەیشتە گوندی هەبهەب، کە ڕۆژەرێیەك لەبەغداوە دوورە، ترس و دڵەڕاوکێ بەغدای گرتەوە و نرخەکان بەرزبوونەوە، و سەدان کەس بەرەو فەلووجەو حیللە رایان کرد. هەندێ لەپێشەنگی سوپای ئێران گەیشتنە خان بەنی سەعد، کەپانزە میل لەبەغداوە دوورە، گەلێ لەخەڵکی بەغدا لەو بڕوایەدابوون، کەبەغدا یان داگیر دەکرێت، یان دەکەوێتە ژێر گوشاری ئابڵۆقەیەکی قورسەوە. هەندێ لەخێڵەکانی دەوروبەر، ئەم هەلەیان قۆستەوە، کەوتنە چەتەگەری،و پەلاماردانی گوندەکان،و گوندی دوجێل یەکێك بوو لەوگوندانە.

ڕێك لەو سەردەمەدابوو، کەنەخۆشیی کولێرا گەیشتە بەغداو بەرەو باکوور تەشەنەی دەکرد،و لەناو سوپای ئێراندا بڵاوبووەوە،و تەنانەت خودی شازادەیش تووش بوو، ئەمەیش دەروویەکی خێر بوو لەداود پاشا کرایەوە. شازادە زانی کەناتوانێت درێژە بەشەڕ بدات، بۆیە ناردی بۆلای

سەرچاوەی پێشوو، ل245.

عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری(سەرچاوەی پێشوو) ل147.



شێخ موسا کاشیفی غیتا، بۆئەوەی بکەوێتە نێوان ئەوو داود پاشاوە، بەمەبەستی بەرقەراری ئاشتی لەنێوانیاندا، شێخی ناوبراو، دوای مردنی شێخ جەعفەری باوکی سەرکردایەتیی ئاییینی نەجەف لەئەستۆ گرتبوو، ئەویش لەگەڵ دارودەستەکەی هات بۆبەغدا،و توانی ئاشتی لەنێوان ئەو دوولایەنە دژبەیەکەدا بەرقەرار بکات، بۆیە شێخ لەناو خەڵکیدا، بە(ڕێکخەری دوو وڵات) ناوی دەرکرد.

شازادە هەر ئەوەنە گەیشتە بارەگاکەی خۆی لەکرماشان، گیانی دەرچوو،و کاتێ هەواڵی مردنی گەیشتە بەغدا، شادیی هەموو دامودەزگا حکومییەکانی گرتەوە، چونکە ئەو پیاوە لەماوەی پانزە ساڵدا، سەرچاوەی نیگەرانی بوو بۆحکومەتی بەغدا،و دەوڵەتی عوسمانی. حوسێن میرزای کوڕی شازادەی کۆچکردوو–کەدوای باوکی بوو بەفەرمانداری کرماشان– پەلاماری عیراق بداتەوە، سوپایەکی گەورەی نارد بۆداگیرکردنی، سوپای ئێران بەرەو سنووری عیراق پێشڕەویی کرد، تاگەیشتە شارۆچکەی شارەبان، ئەوسا حاجی تالیب لەوناوەدا سەرکردایەتیی سوپای عیراقی دەکرد، بەڵام وردە وردە نەخۆشیی کولێرا بوو بەهەڕەشە لەسەر سوپای ئێران، وەکو جاری پێشوو،و سوپاکەی ناچار کرد بەرەو ئێران بگەڕێتەوە.

ئەحمەد عەلی سۆفی(سەرچاوەی پێشوو) ل174.

لەساڵی1822دا، کۆنگرەی ئەرزروم بەستراو تیایدا ئاشتی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران‌و عوسمانیدا، بەرقەرار بوو،و هەردوولا رێککەوتن لەسەر ئەوەی کێشەکانی نێوانیان چارەسەر بکەن، کەدەبوونە مایەی دوژمنایەتیی نێوانیان، لەوانە کێشەی سنوورو باجی بازرگانان‌و مامەڵەی گەشتیارانی مەزارە پیرۆزەکان. بەمەیش داود پاشا لەکێشەیەك رزگاری بوو، کە بەبەردەوامی قارسی دەکرد.

## مسیۆ دیڤۆ:

دوای ئەوەی داود پاشا، لەرەوینەوەی مەترسیی ئێران دڵنیابوو، ئیتر بایەخی بەبەهێزکردنی سوپاکەی‌و راهێنانی لەسەر نوێترین شێواز دا،و هەروەکو بڵێی دوا شەڕ فێری ئەوەی کردبوو، کەچەندە سیستمی نوێ لەپێکێهنانی سوپادا گرنگە. یەکەم کاریٚ کەئەنجامی دا، ئەوەبوو ئەفسەری فەرەنسیی مسیۆ دیڤۆی هێنا، بۆئەو مەبەستە.

سەرچاوەی پێشوو، ل179–182.



ئەوەی شایانی ئاماژە بۆکردنە، لەم رووەوە، ئەوەیە کەمسیۆ دیڤۆ لەو ئەفسەرانەی ناپلیۆن بوو، کەدوای شکستی سەرۆکەکەیان، فەرەنسای بەجێهێشت. بەر لەوەی داود پاشا بانگی بکات، مەشقی بەسوپاکەی شازادە دەکرد لەکرماشان، لەوەدا لێکچووی ئەفسەرێکی فەرەنسیی دیکە بوو، کەناوی مسیۆ سیڤ بوو، مەشقی بەسوپاکەی محەممەد عەلی پاشا دەکرد لەمیسر، کەدواتر بەسولەیمان پاشا ناوبانگی دەرکرد.

یەکێك لەوانەی مسیۆ دیڤۆیان بینیبوو، بەم جۆرە وەسفی دەکات:(پیاوێکی کەڵەگەت،و لاواز، تەمەنی شەست ساڵ بوو ، لەبەر ئەوەی زۆر خۆر لێی دابوو، ، پێستی ئەسمەر بوو. سمێڵێکی سپی‌و پڕ،و دوو ئەبرۆی پڕیشی هەبوو. بەجلوبەرگەکەیدا دەتزانی کەسەربازێکی فەرەنسییە،و قۆبچەی چاکەتەکەی بەتاجی ئیمپراتۆری‌و پیتی یەکەمی ناوی ناپلیۆن رازێنرابووەوە،و لەکونی قۆپچەیەکیەوە، خاجی لویس شۆڕبووبووەوە،و پانتۆڵە گەورە تورکییەکەی، ئەوەی دەگەیاند، کەئێستا لەسوپای تورکیادا کاردەکات. کلاوێکی بچووکی لەسەردەکرد، بەلای گوێچکەی چەپیدا خواری دەکردەوە).

مسیۆ دیڤۆ چالاکانە مەشقی بەسوپای عیراق دەکردو لەسەر چەکی نوێ رایدەهێنا. ئەمەیش کۆنسۆڵی بەریتانیا میستەر تەیلەری قارس کرد، چونکە بەلایەوە گران بوو، ببینێت ئەفسەرێکی فەرەنسی، لەعیراقدا ئەو

ریچارد کۆك(بغداد مدينة السلام)وەرگێڕانی فوئاد جەمیل‌و مستەفا جواد–بەغدا1967–ب2 ل140.

ئەركە لەئەستۆ بگرێت، لەكاتێكدا حەزی دەكرد ئەفسەرێكی بەریتانی هەستێت بەو كارە.[*]

داود پاشا كارخانەیەكی بۆدروستكردنی چەك، لەئەوروپا كڕی،و پسپۆری بۆهێنا بەمەبەستی بەڕێوەبردنی، هەروەها كارخانەی چنینی دامەزراند، بۆدابینكردنی پێداویستییەكانی سوپا،و بەرێكوپێكی مووچەی سەربازەكانی دەدا، بۆئەوەی هەروەكو لەسەری راهاتبوون، پەنا نەبەنە بەر وەرگرتنی باج لەخەڵكی،.

## لاساییكردنەوەی محەممەد عەلی:

دیارە داود پاشا، محەممەد عەلی پاشای والیی میسری كردبووە نموونە بۆخۆی،و هەوڵی دەدا، لەهێنانی داهێنانە نوێكانی ئەوروپادا، بۆوڵاتەكەی لاسایی بكاتەوە. پیاوی ئاپینی بەریتانی گرۆفز، كە لەوسەردەمەدا نیشتەجێی بەغدا بوو دەڵێت:(هەموو شتێك بۆنی ئەوەی دەدا، كەنۆرێنی ئەوروپا دزەی كردبوو...ئەم دیاردەیەیش، لەبەكارهێنانی

[*] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(سەرچاوەی پێشوو) ل322–323.



شێوازی ئەوروپی و چاكسازییدا، تەنیا كاروباری سەربازی نەگرتبووەوە، بەڵكوچەندین لایەنی گرنگی دیكەیشی گرتبووەوە. پاشا ئارەزووی دەكرد كەشتیڕانی هەڵم بهێنێتە ناو دوو رووبارە جوانەكەوە..لەراستیدا من پێموایە كەخوداوەند چەندین وەرچەرخانی لەدڵی ئەم ئۆمەتەدا بەدیهێنابوو).[*] دەڵێن لەو شتانەی كەداود پاشا لەعیراقدا دایهێنا، ئەوەبوو كەیەكەمین رۆژنامەی لەبەغدادا، بەناوی(ژۆرناڵی عیراق) دەركرد، لەچاپخانەیەكی سەنگی بەهەردوو زمانی عەرەبی و توركی دەردەچوو،و بەسەر سەركردەكانی سوپا و كارمەندە گەورەكان و پیاوماقووڵانی شاردا دابەش دەكرا،و دانەیەكیش بەدیواری سەرادا هەڵدەواسرا. باس و هەواڵی رووداوەكانی خێڵەكان و هەواڵی دەوڵەتی عوسمانی و فرمانەكانی والی و ئەو ریفۆرمكارییانەی لەخۆ دەگرت، كەدەبوا ئەنجام بدرێن.[*]

دەتوانین بڵێین داود بیرێكی كراوەی هەبوو، لەبەرامبەر هەر داهێنانێكی سوودمەندا، بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات، لەكوێ دروستكراوە. دەگێڕنەوە پیاوێكی ئێرانی شارەزا لەدروستكردنی ئامێرەكاندا بەناوی میرزا عەبدولموتەلیب، هات بۆبەغدا،و بەڵێنی بەداود پاشا دا، ترومپەیەكی بۆدروست بكات، بۆئەوەی ئاوی رووبار بەرز بكاتەوە،و بەمەیش لەبەكار هێنانی بەكرەكان، كەپێیان دەگوت(كرود) بێ نیازیان بكات. داود پاشا بایەخی بەكارەكەی دا،و ژمارەیەك ئاسنگەرو كرێكاری بۆدیاری كرد، بۆئەوەی لەدروستكردنی ئەو ئامێرەدا یارمەتیی

[*] ستیڤن هیمسلی لۆنكریك(سەرچاوەی پێشوو) ل263.

[*] رۆفائیل بەتی(الصحافة في العراق)–قاهیرە، 1955– ل10.

بدەن، دوای ماوەیەکی کەم، میرزا ئامێرەکەی دروست کرد، و ناویان نا(چەرخی یوسف)، بەناوی تۆرسۆن یوسف بەگی کوڕی داود پاشاوە، و خەڵکی بەغدا رژانە سەر شەقامەکان، بۆئەوەی بچن بەسەرسووڕمانەوە، سەیری بکەن. میرزا خەڵاتی باشی لەلایەن داود پاشاوە وەرگرت، و داوای لێکرد لەبەغدادا بمێنێتەوە، بۆئەوەی خەڵکی بەغدا فێری پیشەکەی خۆی بکات، و مووچەی بۆبڕییەوە. من پێموایە، هەر ئەو ئامێرەیە، کەدواتر بە(ناعوور) ناوبراو لەعیراقدا بەفراوانی بڵاوبووەوە.

## بینینەکانی گەڕیدەیەك:

لەمانگی ئاداری1824دا، ئەفسەرێکی بەریتانی، بەناوی جۆرج کیبڵ، لەگەڵ هاوڕێکانیدا گەیشتە بەغدا، و بیرەوەرییەکانی خۆی لەسەر ئەو گەشتەیولەسەر کۆمەڵگەی بەغدا، و کەسایەتیی داود پاشا

عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل268–269.



بەشێوەیەکی جوان تۆمار کردووە، کەلێرەدا بەکورتی بەشێکی بڵاودەکەینەوە.

کیبڵ لەگەڵ هاوڕێکانی، لەباکوور، لەرێگەی دیجلەوە گەیشتە بەغدا، کیبڵ دەڵێت کەجلوبەرگە نامۆکانیان، سەرنجی خەڵکەکەیان راکێشابوو، کەلەکەناری رووبارەکەدا وەستابوون، چەند ژنێکیشیان لەگەڵدا بوو، و هەندێکیان بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد. کاتێ کەشتییەکە گەیشتە نزیکی دەروازەی بەغدا، دوان لەپاسەوانەکانی کۆنسوڵگەریی بەریتانیا پێشوازییان لێیان کرد، و داوایان لێیان کرد چاوەڕوان بن تاوەکو بێن بۆپێشوازییان و دواتر بیانبەن بۆبارەگای کۆنسوڵگەری. کیبڵ دەڵێت حەزی نەکرد مل بەداواکەیان بدات، و لەگەڵ هاوڕێکانیدا بڕیاریان دا، بەپێ بڕۆنە ناو بەغداوە. دووپاسەوانەکە واقیان وڕما، چونکە بڕوایان نەدەکرد بەریتانییەك شکۆمەندیی خۆی پێشێل بکات و بەپێ بەشەقامەکانی بەغدادا بگەڕێت. دوای سەعاتێك نوێنەرانی کۆنسوڵگەری هاتن، ئەسپێکیان هێنابوو زینی جوانی بەسەرەوە بوو، بەقەیفەی زاخاودراو بەزیو ئارایشت کرابوو، کیبڵ و هاوڕێکانی سواری ئەسپ بوون، و بەسەر شەقامەکاندا دەڕۆیشتن، یەکێك لەپاسەوانەکان، بەسواری ئەسپەوە پێشیان کەوتبوو، و گالۆکێکی زیوی بەدەستەوە بوو، سەری گالۆکەکە خڕبوو، و بەکونی جوان رازێنرابووەوە.

ئەمە بەڵگەیە بۆئەوەی چەندە کۆنسوڵگەریی بەریتانیا بایەخیان بەئەتەکێت دەدا، هەر ئەوەی کەخوالێخۆشبوو ریچ بایەخی پێدەدا،

ریچارد کۆك(سەرچاوەی پێشوو) ل138–139.

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد.لەراستیدا هەر کەسێك لەو پێگەیەدا بێت، ناتوانێت چاوپۆشیی لەو ئەتەکێتانە بکات، لەو بارودۆخانەدا. خەڵکی لەسەر ئەوە راهاتبوون گەورە پیاوان ببینن بەسەر ئەسپەوەو دارودەستەو کۆیلە دەوری بدەن،و تائەو ئەتەکێتانە زیاتر ئەنجام بدرایەن پێگەی ئەو پیاوە بەلای خەڵکییەوە بەرزتر دەبووەوە،و تائیستایش ئەو دیاردانە کاریگەرییان لەسەرمان هەیە.

کیبڵ لەگەڵ هاوڕێکانیدا، سەردانی داود پاشایان لەسەرا کرد،و باسی ئەوە دەکات، کەچۆن سەرەتا، لەدووری سەراوە، شاندێکی ئینکشاری پێشوازیی لێیان کردووە، تاگەیشتوونەتە ناو گۆڕەپانی سەراوە،و بینیویانە کەسەربازەکانی پاشا بەریز وەستاون،و کاتێ بەدەروازەی دووەمی سەرادا رەتبوونە، ئەفسەرانی پاشا پێشوازییان لێیان کردووە، دواتر لەنێوان دوو ریزلە ئینکشارییەکاندا رەتبوونە، بەبێ ئەوەی جووڵەیان لێوە بێت. هۆڵی پێشوازیی بەشتومەکی رۆژهەڵاتی رازێنرابووەوە،و چەندین ئاوێنەی سێگۆشەی جوانی تیادا دانرابوو. داود پاشا لەگۆشەیەکدا، بەچەند سەرینیچکەوە پاڵی دابووەوە...

کیبڵ داود پاشا وەسف دەکاتو دەڵێت: پیاوێکی باش دەردەکەوت، تەمەنی لەنێوان چل بۆ پەنجاساڵ دەبوو، قۆزبوو، دواتر کیبڵ دەڵێت: لەبەغدادا مقۆمقۆی ئەوە هەبوو کەقوربانیانی ئیرەییەکانی داود پاشا، لانی کەم گەیشتبووە هەزارو پێنج سەد کەس(هەوڵم دا لەکاتی



چاوپێکەوتنەکەدا، راستی ئەو مقۆمقۆیەی لێدەربهێنم، بەڵام بێ سوود بوو).

## راکێشانی زانایانو نووسەران:

سەردەمی داود پاشا بەوەناسراوە، کەتیایدا مزگەوتو حوجرەی زۆری تیادا دروستکرا، دەڵێن گەیشتۆتە بیستو هەشت حوجرە. سەرنج راکێش ئەوەیە، کە لەم بارەوە دەیگێڕنەوە، کەدایکی داود پاشا کەنیشتەجێی تەفلیس بوو، بیستی کەکوڕەکەی حوجرە دروست دەکات، ئەویش لای خۆیەوە دەستی کرد بەدروستکردنی شوێنی وانەوتنەوە بۆمەسیحییەکان. دیارە کەمەسیحییەکی دڵسۆز بووە، ویستوویەتی بەو کارەی، خودا لەخۆیو لەکوڕەکەی خۆش ببێت، لەبری ئەوەی کوڕەکەی بووبوو بوموسڵمان.

داود پاشا تەنیا خەریکی دروستکردنی حوجرە نەبوو، بەڵکو شاعیرو نووسەرو فەقیەو سۆفی بۆدەهێنانو خەڵاتو دیاری باشی پێدەدان. شێخ رەسووڵی کەرکووکلی، یەکێکە لەو نووسەرانەی داود پاشا لەخەڵات بێ بەشی نەکردبوو، دەڵێت:(زانایان لای خۆیانەوە، داوایان دەکرد خەڵکی کاری باشە ئەنجام بدەنو لەبەدکاری دوور بکەونەوە،و ئەرکەکانیان بەباشی ئەنجام بدەن، واعیزو ئامۆژگاریکار لەناویاندا زۆربوون خەڵکییان رێنموونی دەکردو دەیانترساندن،و خەڵکییان بەرەو

---

سەرچاوەی پێشوو، ل139–141.

ئینستاس ماری کەرمەلی، لەکتێبی عەبدولقادر شارەبانی(سەرچاوەی پێشوو)دا، ل6.

ڕێگەی ڕاست ڕێنمایی دەکرد،و داوایان لێدەکردن، خەریکی خوداپەرستی ببن‌و ڕەوشتی خۆیان جوانتر بکەن. شاعیران بەهەموو زمانێك بەشیعر ستایشی وەزیریان دەکرد، هەموو ئەو شیعرانەم کۆکردۆتەوە، لەکتێبێکدا دەیخەمە بەردەستی خوێنەران. خزر ئەفەندیی برام‌و عەبدوڵلا ئەفەندی، لەو کارەدا دەستێکی باڵایان هەبوو،و لەلایەن وەزیرەوە ڕێزیان لێگیراوەو بۆیەکەمیان مووچەیەکی مانگانەی بڕیبووەوە، بەبڕی سێ هەزار قروش،و دووەمیانی کرد بەفەرمانداری هەولێر، کەئەوە هەموو ئارەزووی خۆی بوو).□□□

سەردەمی داود پاشا، بەدەستپێکی ڕاپەڕینی نوێی ئەدەبی عیراقی هەژمار دەکرێت،□□□ شێوازی شیعر گۆڕانی بەسەردا هات،و گەشەی کرد،و شاعیرانی پێشەنگ لەسەدەی نۆزدەیەمدا هەڵکەوتن، لەوانەعەبدولغەففار ئەخرەس‌و ساڵح تەمیمی،و عەبدولباقی عومەری‌و عوسمانی کوڕی سەنەدی بەسری.□□□ ئەمەیش دەرئەنجامێکی سرووشتیی ئەو هەموو خەڵاتە بوو کەداود پاشا بەشاعیرانی دەدا. وێڕای ئەوەی داود پاشا، خۆی خولیای شیعر بوو، چونکە بەشێکی زۆری تەمەنی لەخوێندنی زمانی عەرەبی‌و ئەدەبەکەیدا بەسەر بردبوو، کاتێ لەمزگەوتی شێخ عەبدولقادردا تەلەبە بوو.

□□□ ڕەسووڵ کەرکووکلی(سەرچاوەی پێشوو) ل279.

□□□ داود سەلووم- (تطور الفكرة والأسلوب في الأدب العراقي) بەغدا1959- ل9.

□□□ یوسف عیزەدین(الشعر العراقي أهدافه وخصائصه في القرن التاسع عشر)-بەغدا1958- ل55.



## لایەنەکەی دیکە :

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، داود پاشا لەو کاتەدا پارەی بۆزانایان‌و ئەدیبان هەڵڕشتبوو، لەلایەکی دیکەوە، خەڵکەکەی دەچەوساندەوەو باجی زۆری لێیان وەردەگرت،و لەرادە بەدەر ستەمی بەرامبەریان دەکرد. سولەیمان فایەق کەلەمنداڵیدا هاوچەرخی بووە،بەم جۆرە وەسفی دەکات:(ئەوەی جێگەی داخە، ئەوەیە لەسەردەمی دەسەڵاتی داود پاشادا، ستەمی زۆر لەخەڵکی کرا،و شتێکی تێدا نەهێشتۆتەوە، تاوەکو ستایش بکرێت، پیاوێکی پیسکەبوو،و خەریکی کۆکردنەوەی پارەبوو، تائێستایش خەڵکی لەبەغدا، بەدەستی ئەو بڕگانەوە دەناڵێنن، کەبۆکۆکردنەوەی باج دایناببوو، چونکە ئەوانەی لەدوای ئەویش دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو، هەر لەسەر ئەو بڕگانە دەڕۆیشتن، لەکاتێکدا، بەر لەو ئەو باجانە لەئارادا نەبوون‌و کەسیش نەیبیستبوون).□□□

مێژوونووسێکی دیکە، بەم جۆرە وەسفی دەکات:(...کردارەکانی لەبەر دزێوییان باس ناکرێن... هیچ شتێکی باشیان تیادا نییە، تاوەکو مێژوونووسان باسی بکەن، خۆئەگەر ئێمە باسیشیان بکەین، نکۆڵییان لێدەکات. هێندە ستەمی کرد، ڕووی فیرعەونی سپی کرد،و تابڵێیت پیسکە بوو، ئەگەرچی پارەو پوولی زۆری هەبوو، بەزۆر دەستی بەسەر

□□□ عەبباس عەزاوی(سەرچاوەی پێشوو)ب6 ل330.

سامانی خەڵکیدا دەگرت... لەرێگەی حاجی ئەفەندی کوردییەوە، دەستی بەسەر سامانی خەڵکیدا دەگرت...).

مێژوونووسە رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتییەکان لەسەر ئەو وەسفانەی داود پاشا تەبان. لۆنکریك لەو بارەوە دەڵێت:پیاوەتییەکەی بەنەوسنی زاخاو درابوو. کۆك دەڵێت:(ئەو گەشەسەندنە رواڵەتییەی سەردەمی داود پاشا، پارەیەکی زۆری تێچووبوو، و دەست بڵاویی و خۆشگوزەرانی لەسەرادا لەباسکردن نەدەهات، لەکاتێکدا خەڵکەکە لەکوێرەوەریدا دەژیان، و باج پشتی کرێکارە هەژارەکانی شاری شکاندبوو، و تەنیا ئەوانە دەرباز دەبوون کەلەناو خێڵەکاندا یاخی دەبوون و خۆیان لێی دەدزییەوە...). کیبڵ ئاماژە بەوە دەکات کەداود پاشا جاروبار دەستی لەبازاڕدا وەردەدا، و نرخی دراوی تانیوە شکاند.

گەڕیدەی فەرەنسی ڤۆنتانی داستانێك دەگێڕێتەوە، نازانین تاچەندە راستە، بەڵام هەرچۆن بێت لەگەڵ خووەکانی داود پاشادا یەکدەگرێتەوە، کەسووکایەتیی بەخەڵکی و بەسامانەکانیان کردووەز کورتەی ئەو داستانە ئەوەیە کەبرایەکی داود پاشا-مەبەست جیوی برای نییە، کەپێشتر ئاماژەمان بۆکرد-لەکاتی دەسەڵاتی براکەیدا، سەردانی بەغدا دەکات، و بەموسڵمان دەبێت، براکەی ماڵ و پارەی دەداتێ و مووچەی بۆدەبڕێتەوە، دواتر لای سوڵتان پلەی میری میرانی بۆدەکرێت، و دەبێت بە(حوسێن پاشا). کاتێ پارەی بەدەستەوە نامێنێت-چونکە مەینۆش بوو-سەردانی

سەرچاوەی پێشوو، ب6 ل331.
ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل239.
ریچارد کۆك(سەرچاوەی پێشوو) ب2 ل131، 139-140.



براکەی کرد و داوای پارەی لێکرد، براکەی نەڕاندی بەسەریدا و پێی گوت(داوای پارە دەکەیت و نازانیت چۆن بەدەستی بهێنیت. ئەی تۆ برای داود پاشا نیت؟ کەس شك نابەیت پارەی لێ بسێنێت) حوسێن پاشا لەبەر دەبەنگیی خۆی، شەرم گرتی، و ئیتر سوودی لەقسەی براکەی وەرگرت، وجوولەکەیەکی گرت و تێڵا تڕێنی کرد، دواتر هەرچی هەبوو لێی سەند، ئیتر بەوە چەشە بوو، تاوایلیێهات براکەی ناچاربوو، لەبەغدا دووری بخاتەوە، و کردی بەفەرمانداری بەسرە. ئیتر ئەو برا باشە لەوێ کەوتە گیانی خەڵکی و سامانی خەڵکی زەوت دەکرد و بەماڵی خۆی دەزانی، بەڵام تێکەوت، و دەستی کرد بەخواردنی ماڵی حکومەت، واتە ماڵی براکەی، هەرچی مس هەبوو بەکەشتییەکانەوە، لەبەسرە هەرهەمووی لێکردەوە و فرۆشتی، و لەترسی ئەوەی نەبادا خەڵکەکە لەدەستی هەستن، بەپەلە هێنرایەوە بۆبەغدا. وێڕای ئەوە، داود پاشا حەزی لەژیانی خۆشگوزەرانی و رابواردن هەبوو. ئەو گەڕیدانەی سەرایان بینیبوو، کەداود پاشا دروستی کردبوو، دەیانگوت خۆی لەقەرەی سەرای ئەستەنبوڵ داوە. سێر کیێر بۆرتەر ئاماژە بەوە دەکات، خۆشگوزەرانیی داود پاشا، بەپێچەوانەی هەژاریی خەڵکەکەوە بووە لەبەغدادا، لەدەعوەت و مەلهاکانیدا باس باسی قاپ و کەوچکی ئاڵتوون و دەستەسڕی ئاوریشم و گۆزەی زیوو بۆنی خۆش بوو.

یەعقووب سەرکیس(سەرچاوەی پێشوو)ب2 ل400-401.
ریچارد کۆك(سەرچاوەی پێشوو)ب2 ل131.
داود سەلووم(سەرچاوەی پێشوو) ل11.

## پووختەیەکی کۆمەڵایەتی:

لەوەی پێشتر سەبارەت بەداود پاشا ئاماژەمان پێکرد، دەردەکەوێت کەلەشێوازی سوڵتانە کۆنەکانی سەردەمە زێڕینەکان بووە، لەسەرێکەوە ستەمی لەخەڵکی کردووە بەباجی زۆر، و دواتر بڕێکی بەخشیوە بەزانایان و ئەدیبان. ئەمەیش بەکردەوە کارێکی سەرکەوتوانەیە، ئەگەرچی لەراستیدا بەپێچەوانەی شەریعەت و پرەنسیپەکانی عەدالەتی کۆمەڵایەتییەوەیە.

کاتێ فەرمانڕەوا پارە دەبەخشێتەوە بەسەر زانایان و نووسەراندا، بەوە زمانیان دەکڕێت، بۆئەوەی ستایشی بکەن، ئەوانیش دەکەونە هەڵدان بەشان و باڵیدا بەنووسین و شیعرەکانیان. بەڵام جەماوەری خەڵکەکە لەژێر باری دەستدرێژیکردن و ستەمدا دەناڵێنن، زمانیان نییە بەرگرییان لێبکات، تەنانەت زۆر جار ئەوانیش دەکەونە ژێر کاریگەریی نووسەران و زانایانەوە، لەستایشی فەرمانڕەوادا، و هەموو ئەو ستەمانەی لێیان دەکرێت، دەیدەنە پاڵ چارەنووس، یان بەسزای خودای دەزانن لەبەرامبەر ئەو گوناهانەی کردوویانە.

قەڵەم بەدەستەکانن کەئەو بیرۆکانە دروست دەکەن و لەنێوان خەڵکیدا بڵاوی دەکەنەوە، و دەتوانن رەش بکەن بەسپی و سپی بکەن



بەرەش، ئەگەر هاتو کەسی فەرمانڕەوا چاوی خێری لێیان بوو، دیاری و خەڵاتی چەوری پێدان، ئەوا دەیکەن بەدادپەروەرترین فەرمانڕەوا، خۆئەگەر پشت گوێیان بخات ئەوا هەرچی بەدەمیاندا بێت پێی دەڵێن.

ئەو فەرمانڕەوایەی بیەوێت لەسەر رێبازی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بڕوات، ئەوا لەنێوان خەڵکیدا جیاوازیی قایل نابێت، و سەرئەنجام شکست دەهێنێت، چونکە قەڵەم بەدەستەکان دەتوانن رای گشتی بەجۆرێ ئاراستە بکەن، خەڵکەکەی لێ بتەکێننەوە و بچنە پاڵ دوژمنەکەی و خەڵکیش دوای خۆیان بخەن، بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێبکەن.

ئێمە لەکاتێکدا دەبینین قەڵەم بەدەستەکان، لەم سەردەمانەی دواییدا، عەلییان خۆش دەوێت و ستایشی دەکەن، دەبێ ئەوە فەرامۆش نەکەین، ئەگەر لەسەردەمی ئەودا بوونایە، بەپێچەوانەوە دەجووڵانەوە، و بەڵگەیشمان ئەوەیە کەئەوان سەرقاڵی ستایش کردنی سوڵتانەکانی سەردەمی خۆیانن، و تاخەڵاتی ئەو سوڵتانانە زۆرتر بێت بۆیان، زیاتر دەکەونە ستایش کردنیان.

## چارەنووس:

دەسەڵاتی داود پاشا لەعیراقدا، نزیکەی پانزە ساڵی خایاند، ئەو ماوەیەیە کەیەکسانە بەحیسابی پیتەکانی، هەرجاریٚ سولەیمان فایەق دەڵێت.[1] داود پاشا دەیتوانی خۆی لەدەوڵەتی عوسمانی جیابکاتەوە،و حکومەتێکی تایبەت بەخۆیو بەبنەماڵەکەی دابمەزرێنێت، بەو شێوەیەی محەممەد عەلی پاشا لەمیسر.ئەو لەسروشتی کۆمەڵگەی عیراقی تێگەیشتبوو، دەیزانی چۆن گەمە بەئەقڵی عیراقییەکان بکات،و توانی سوپایەکی مەشقپێکراو ئامادە بکات، کەخاوەنی هێزێکی گەورەبوو، بەڵام دواتر بارودۆخەکە بەدڵی ئەو هەڵنەسوڕا،و ئەو خەونەی ماوەیەکی زۆر لەمێشکیدا بوون هەرەسی هێنا.

لەم دونیایەدا، کەس نییە هەڵەی نەبێت،و هەندیٚ جار هەڵەکان بچووکن، بەڵام سەری خاوەنەکەی تیادا دەچێت. داود پاشایش هەڵەیەکی لەو شێوەیەی کر، لەساڵی1830دا، کاتیٚ بەکوشتنی نێردراوی سوڵتان تێوەگلا–بەو شێوەیەی لەبەشی داهاتوودا باسی دەکەین–کەبووە هۆی ئەوەی لەگەڵ سوڵتاندا، بکەوێتە کێشەیەکەوە، کەدواتر بووە هۆی لەناوچوونی. دیارە بەخۆیو بەهێزەکەیەوە بوغرا بووبوو، بۆیە دەستیدایە کارێك، کە لەخۆی گەورەتربوو،و ئەگەر هەندیٚ دانی بەخۆیدا بگرتایە،و

[1] سولەیمان فایەق(تأريخ المماليك في بغداد)–وەرگێڕانی محەممەد نەجیب ئەرمەنازی–بەغدا1961–ل51.



پەلەی نەکردایە لەکوشتنی نێردراوی سوڵتاندا، ئەوا کارەکە لەخۆوە بەدڵی ئەو کۆتایی دەهات.

محەممەد عەلی پاشا، لەساڵی1832دا، توانی گورزی گورچك بڕ لەهێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوەشێنێت، خەریك بوو سوپاکەی بگاتە نزیکی ئەستەنبوڵ، بەسەرکردایەتیی ئیبراهیمی کوڕی،و ئەگەر داود پاشا لەو کاتەدا، هەر والیی بەغدا بوایە، دەیتوانی هاوکاریی لەگەڵ محەممەد عەلی پاشادا بکات، بۆبەدیهێنانی ئامانجێکی هاوبەش،و رەنگبوو، بەو هۆیەوە، رەوتی مێژوولەعیراقو هەندیٚ لەوڵاتە عەرەبییەکاندا گۆڕانی بەسەردا بهاتایە.راستییان گوتووە کە:(بڕیار دەدەنو چارەنووس پێدەکەنێت!).

# بەشی دەیەم

## کۆتایی ئینکشارییەکان و مەمالیك

هەر لەناوەراستی سەدەی هەژدەیەمەوە، پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی ململانێیەکی توندی بەخۆوە بینی، لەنێوان نەریتپارێزان و نوێخوازاندا، ئەوان دەیانویست لەسەر رەوتی شارستانیی نوێ بڕۆن، و ئەوانی دیکەیش بەکفریان دەزانی. ئەوە یەکەم جار بوو، کەجیهانی ئیسلام وەها ململانێیەك بەخۆوە ببینێت، دواتر وردە وردە، ئەو ململانێیە لەسەرانسەری وڵاتە ئیسلامییەکاندا تەشەنەی کرد.

هۆی ئەوەی ئەستەنبوڵ لەو بارەوە، پێش وڵاتە ئیسلامییەکانی دیکە کەوت، ئەوەبوو ئەو شارە پێگەیەکی جوگرافیی سەیری هەبوو، چونکە دەکەوتە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاواوە، لەرۆژهەڵات کلتووره کۆنەکەی وەردەگرت، و لە رۆژئاواشەوە تەوژمی نوێ. کەواتە ئاسایی بوو، کەململانێ لەنێوان ئەو دوو بۆچوونەدا، بەجۆرێك لەجۆرەکان دروست ببێت.

مەسەلەی راهێنانی سەربازی لەسەرووی ئەو مەسەلانەوە بوو کەلەنێوان نەریتپارێزان و نوێخوازان لەئەستەنبوڵدا ململانێ بوروژێنێت، ئەم کێشەیە کاتێ هاتە ئاراوە، کەسیاسەتمەدارەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەرکی ئەوەیان کرد، کەدەبێ هاوڕەوتی شارستانیی ئەورووپا بن، بەزانست و هونەرەکانییەوە، تاوەکو بتوانن لەبواری ژیانی نوێدا، هەنگاو



بنێن، و ئەم تێگەیشتنە کاتێ بەلایانەوە دروست بوو، کە بینییان سوپاکەیان ناتوانێت لەبەرامبەر سوپاکانی ئەورووپادا خۆی رابگرێت، لەشەڕەکاندا، و زۆربەی جار تیایاندا تووشی شکست دەبوو.

یەکێك لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبوو، هەر لەسەرەتاوە–هەروەکوو لەبەشەکانی پێشوودا بینیمان–لەسەر بنەمای دەمارگیریی ئایینی و شەڕ لەپێناوی خودادا دروست بوو، و لەو بوارەدا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا، لەکاتێکدا شەڕەکان بەپلەی یەکەم، پشتیان بەدەمارگیری دەبەست. بەڵام لەسەردەمی نوێدا، رەوشی شەڕەکان گۆڕانیان بەسەردا هات، و زیاتر لەدەمارگیری، پشتیان بەزانست و تەکنۆلۆژی دەبەست. لێرەوە ئەو کێشەیە دروست بوو، کەلەدوا سەردەمەکاندا دەوڵەتی عوسمانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو.

لەبەشی پێشوودا، ئاماژەمان بەرادەی بایەخدانی سوڵتانە عوسمانییەکان کرد بەتۆپخانە–لەسەرەتای داهێنانیەوە–، تاوایلێهات سەرکەوتنیان بەسەر هەموو ئەو وڵاتانەدا بەدەست هێنا، کەشەڕیان لەگەڵیاندا کرد، بەڵام نابێ ئەوە لەیاد بکەین، ئەو سەردەمە بەکارهێنانی تۆپخانە کارێکی قورس نەبوو، ئەوەندە نەبێ کەتۆپەکان گەورەبن، دواتر بەمەزەندە نیشانەیان دەنایەوە، بۆلێدانی دیوارو قەڵا و سوپاکان، بۆئەوەی کاریگەرییان هەبێت. ئیتر ئەوە دادی نەدەدا، دوای ئەوەی هونەری تۆپخانە بەلای وڵاتە ئەوروپییەکانەوە، پێشکەوتنیان بەخۆوە بینی، و نوێترین تیۆری ماتماتیك و نەخشەی لۆگاریتمییان تیایدا بەکار دەهێنا، بۆیە تۆپخانەی ئەورووپا لەدوورەوە، گەورەترین زیانی بەسوپای عوسمانی دەگەیاند، بەبێ ئەوەی تۆپخانەی عوسمانی بتوانێت وەڵامی بداتەوە.

## لەرووداوەکانی ململانێکە:

سـولْتان مسـتەفای سـێیەم یەکـەمین سـولْتانی عوسمـانی بـوو، کەهەوڵی دا سوپاکەی چاکسازی بکاتو لەسەر هونەری نویْ رایبهێنێت، کە لەساڵی 1757دا، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، و یارمـەتیی لەهەندیْ پسپۆرو ئەفسەری ئـەوروپی وەرگـرت، بۆمەشقو راهێنـانی سـەربازەکان، لەسەر شێوازی نوێی سەربازی، و ئەوەیش زەنگێك بوو، بۆ سەرهەڵدانی نـارەزایی لـەدژی. ئـەوەبوو ئینکشـارییەکان رەخنـەیان لـەم راسـتا نوێیـە دەگـرتو دژی دەوەستانەوە، و دەیـانگوت: وەلیـی خـودا حـاجی بـەکتاش، هـەر لەسـەرەتاوە ئینکشـارییەکانی پـیرۆز کـردووەو دوعـای سـەرکەوتنی بەردەوامی بۆکردوون، بۆیە ئەو دوعایەی ئەو، لەهەر زانستێك بیْ نیازیان دەکات.[374] بەرنگاربوونەوەی ئینکشارییەکان لەسەردەمی سولْتان سەلیمی سێیەمدا توندتر بوو، کە لەساڵی 1789دا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، ئەم سولْتانە بەسەلیقەو بەمەشق سەر بەریفۆرمخوازان بوو، و دەستی دایە کۆمەڵێك کاری چاکسازی، لەهەموو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا، رێگەی گرت لەشێوازی خراپـی بـڕینی بـاج، و شێوازی(پابەنـدبوون)ی هەڵوەشـاندەوە، لـەوەرگرتنی باجـدا، و هـانی چـاپەمەنیو وەرگێڕانـی کتـێبی دا، لەزمانـە بیانییەکانـەوە، و بەمەبەسـتی خوێنـدن خـەڵکی بۆئەوروپا دەنـارد.[375] بـەڵام

ساتیع حوسەری(البلاد العربیة والدولة العثمانیة)–بەیرووت1960–ل77.

ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)–وەرگێڕانی جەعفەر خەیات–بەغدا1962–ل258–259.



ئـەوەی زیـاتر ئینکشـارییەکانی قـارس کـرد، ئـەوەبوو سـولْتان(سیسـتمی نویْ)ی هێنایـە نـاو سـوپاوە، کەسیسـتمێك بـوو، لەسـەر بنـەمای راهێنـانی سـەربازی بـەپێی شـێوازی ئـەوروپی، بۆیـە ئینکشـارییەکان بەتونـدی لەبەرامبەریـدا وەسـتان، و پیـاوە ئایینییـە توندرەوەکان پشـتیان دەگـرتن، و رەخنەی ئەوەیان لێدەگرت، کەئیسلام گوێی بەزانستی سـەربازی نـەداوەو شـەڕەکانی ئیسـلام بـەبیْ زانسـت ئـەنجام دەدران، وێـڕای ئـەوەی کەئـەو سیسـتمە نوێیـە بیدعەیـەو هـەموو بیدعەیـەك حەرامـە، و بیدعـەی کافرەکانـە، ونابیْ لاسـایی بکرێتـەوە، و ئیسـلام ئـەوەی قەدەغـە کـردووە، کەدەڵێت: ئەوەی لاسایی تاقمێکی کردەوە، وەکو ئەوانی لێدێت.[376]

لەساڵی 1807دا، ئینکشارییەکان دژی سولْتان سەلیم شۆڕشیان بەرپا کرد، و لەکۆشکەکەیدا گەمارۆیان دا، و دواتـر فەتوایـەکی شـەرعییان وەرگـرت، کەئەمە دەقەکەیەتی:(ئایا سولْتان بۆی هەیە، کەبەرەفتارەکانی خـۆی، دژی رێسـاو رێنماییـە پیرۆزەکـان دەوەسـتێتەوە، کـە لـەقورئانی پـیرۆزدا هـاتووە، لەسـەر تـەخت بمێنێتـەوە؟ نـەخێر). بـەپێی ئـەم فەتوایـە سولْتانیان لابرد، و دواتر کوشتیان، و لەشوێنەکەیدا سولْتانێکی نوێیـان دانـا، کـە لەگـەڵ خواسـتی ئەوانـدا بگونجێـت. بـەڵام هـەوادارانی ریفـۆرم شۆڕشێکیان بەسەرۆکایەتیی مستەفا پاشای بەیرەقدار بەرپا کرد، و بەرەو پایتەخت کشان، و دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت، و دواتر گەنجێکی شانزە ساڵەیان، بەناوی سولْتان مـەحموودی دووەم لەشـوێنی دانـا، کەرێکـەوت وابوو، ببێت بەمەزنترین سولْتانی بنەماڵەی عوسمان، و لـەرەوتی مێـژووی عوسمانیدا، لەهەموویان کاریگەریی زیاتری هەبوو.

ساتیع حوسەری(سەرچاوەی پێشوو)ل79.

## سوڵتان مەحموودی دووەم:

دوو پێوەر هەیە بۆپێوانی مەزنیی پیاوان: یەکەمیان تەماشای لێهاتوویی و کەسایەتی ئەو پیاوە دەکات، بەر لەوەی تەماشای رادەی سەرکەوتنی بەکردەوەی لەژیاندا بکات، لەکاتێکدا ئەوی دیکەیان پێچەوانەکەی رەچاو دەکات، کردەوەی سەرکەوتوو دەکاتە پێوەر، و بەهرەکانی پشت گوێ دەخات. لەکاتێکدا ئێمە دەمانەوێت ژیانی سوڵتان، بەپێی پێوەری یەکەم تاوتوێ بکەین، بێگومان گەورە دەیبینین. کریسیی مێژوونووس بەم جۆرە وەسفی دەکات: زۆرجار رووبەڕووی دۆخی نالەبار دەبووەوە، بەڵام لەبەرامبەریدا خۆی دەگرت، و ورەی بەرنەدەدا، و بیرەوەرییەکانی شایستەی ئەوەن، رێزیان لێبگیرێت، بەلای ئەوانەوە کەگەورەیی پیاو، بەپێی دووربینی و هەوڵە چالاکەکانیەوە دەپێون، بەبێ ئەوەی بایەخ بەسەرکەوتن، یان شکستی بدەن، کەبارودۆخ کاریگەریی لەسەریان هەیە.[377]

سوڵتان مەحموود لە28ی تەمموزی ساڵی 1808دا، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، و مستەفا پاشای بەیرەقداری کرد بەسەرەك وەزیرانی خۆی، ئەم وەزیرە چالاکیی زۆری نواند لەپێناوی چاکسازیی سوپا و لەناوبردنی ئاژاوەگێڕاندا. سەرەتا ئینکشارییەکان و پیاوە ئایینییە

377-Edward Creasy(History of Ottoman Turks)-Beirut 1961-P. 492.



هەوادارەکانیان بێدەنگ بوون، لەپێشدا رەزامەندییان لەسەر رووداوەکان دەربڕی، بەڵام لە14ی تشرینی دووەمدا، کردیان بەهەڵلاو دواتر گەمارۆی وەزارەتەکەیان داو ئاگریان تێبەر دا، کەبووە هۆی سووتانی وەزیرەکە تیایدا. ئاژاوە سەرانسەری ئەستەنبوڵی گرتەوەو شەڕ لەنێوان ئینکشارییەکان و سەربازەکانی سوڵتاندا دەستی پێکردو چەندین شوێن لەشارەکە ئاگری تێبەر درا، و جبەخانە سەربازییە گەورەکان کەپڕبوون لەباروووت و چەك تەقێنرانەوە. سوڵتان مەحموود ناچار بوو، لەبەرامبەردا فرمانێك دەربکات و(نەریتی فەرەنسی) هەڵبوەشێنێتەوە، کەلەسیستمی سوپادا بەتازەیی پیادە کرابوو، و نکوڵیی لێبکات و نەفرینی بکات، دواتر هەموو شتێکی گێڕایەوە سەر باری جارانی.

دیارە سوڵتان مەحموود بۆیە ئەو کارەی کرد، تاوەکو دەرفەتێك بۆخۆی بڕەخسێنێت، تاوەکو لەبارودۆخێکی نوێدا خۆی بۆخەبات ئامادە بکات. محەممەد فەریدی مێژوونووس دەڵێت: سوڵتان ناچاربوو، مل بەداخوازییەکانی ئینکشارییەکان بدات، تابتوانێت ئەستەنبوڵ لەنابووتی خێرا رزگار بکات، کەخەریك بوو، لەو کاتەدا ببێت بەخۆراکی ئاگر.[378]

[378] محەممەد فەرید(تأريخ الدولة العلية العثمانية)-قاهیرە1912-ل199.

## لەناوبردنی ئینکشارییەکان:

سولْتان مەحموود چاوەڕێی دەرفەتی گونجاوی دەکرد، تا لەئینکشارییەکان بدات. لەساڵی 1826-واتە هەژدە ساڵ دوای ئەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت-دا دەرفەتی گونجاوی بۆرەخسا، کەناوی ئینکشارییەکان گەلێك دابەزیبوو، بەهۆی ئەو شکستە بەردەوامانەیانەوە، کەتووشیان بوو، لەشەڕەکانیان لەباڵکان و ئەورووپای رۆژهەڵاتدا.

سولْتان پلانێکی تۆکمەی دانا، بۆلەناوبردنی تاقمەکانیان لەئەستەنبوڵدا، پلانەکە بەوە دەستی پێکرد کەفەتوایەکی شەرعی بەدەست بهێنێت، کەگوایا سوپای ئیسلام پێویستە مەشق و راهێنانی رێکوپێکی بۆبکرێت، تاوەکو بتوانێت لەگەڵ کافرەکاندا بجەنگێت، دواتر فرمانی دا، مەشق و راهێنان بەسەر هەندێ لەتیپە ئینکشارییەکاندا بسەپێنن. بەڵام ئینکشارییەکان ئەوەیان بەلاوە پەسەند نەبوو، هەموویان لەیەکێك لەگۆڕەپانەکاندا کۆبوونەوەو شۆڕشیان دژی سولْتان بەرپا کرد، دواتر بەرەو سەرا پێشڕەوییان کرد. سولْتان خۆی بۆیان ئامادە کردبوو، لەشوێنێکدا چەند تۆپێکی دابەستبوو، لەژێر چاودێریی پیاوێك کەمتمانەی تەواوی پێی هەبوو، بەناوی ئیبراهیم، کەبە(قەرە جەهەنەم) - دۆزەخی رەش-ناسراو بوو، ئەم ئیبراهیم ناوە، پێشوازیی لەکۆبوونەوەی ئینکشارییەکان کرد بەتۆپبارانێکی خەست و خۆڵ، کەلێی کردن بەدۆزەخ.



بەرەو بارەگاکانیان پاشەکشێیان کرد، دوای ئەوەی زۆریان لێکوژرا، بەڵام ئیبراهیم دوایان کەوت، و بارەگاکانیانیشی تۆپباران کرد و رووخاندنی و ئاگری پێیانەوە نا. هەندێ لەجەنگاوەرەکانیان بەشمشێرەوە لێیان هاتنە دەست، بەڵام بەر لەوەی هەڵبێن کوژران. ژمارەیەکی کەمیان هەوڵیان دا لێیان خۆش بن، بەڵام بێ سوود بوو. لەکۆتاییدا کەس لەئینکشارییەکان خۆیان بەدەستەوە نەدا. قەتڵوعامێکی نەخشە بۆداڕێژراو بوو.[379]

لەچەندین شاری دیکەی تورکیادا، ئینکشارییەکان قەتڵوعام کران، بەو شێوەیەی لەئەستەنبوڵدا دژی ئینکشارییەکان کرا، بەڵام بەشێوەیەکی سنووردارتر. سولْتان فرمانی بەهەموو والییەکانی دا، لەسەرانسەری ئیمپراتۆرییەکەدا، و داوای لێکردن سوپای ئینکشاری لەناوچەکانی خۆیاندا هەڵبوەشێننەوە و(سیستمی نوێ) لەشوێنیان پیادە بکەن.

.379-Edward Creasy(op. cit.) P. 504-505

## لێدانی ڕێبازی بەکتاشی:

دوای لەناوبردنی ئینکشارییەکان، سوڵتان مەحموود ویستی دەستێك بەرێبازی بەکتاشیدا بهێنێت، و نینۆکیان بکات، بەوەی ڕێنوێنیکەری ئینکشارییەکانەو سەرچاوەی ڕۆحییانە. لەسەر داوای سوڵتان پیاوانی ئایینیو شێخی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان کۆبوونەوە، و فەتوای ئەوەیان دەرکرد کەرێنماییەکانی ڕێبازی بەکتاشی بەپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، و سوڵتان پشتی بەو فەتوایە بەست، و فرمانی دا تەکیەی بەکتاشی لەئەستەنبوڵدا بڕووخێنن، و لەگەڵ خاکدا یەکسانی بکەن، و دەست بەسەر هەموو کتێبەکانیدا بگرن. دوای ئەوە مقۆمقۆی ئەوە لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، کەبەکتاشییەکان کافرن، و سووکایەتیی بەقورئان دەکەن، و تەنانەت دەیانگوت کەقورئان لەناو تەکییەکانیاندا، لەشوێنی شایستەی خۆی دانانرێت، و مەسینەکان بەپەڕەی قورئان دەپێچنەوە.

بڕیار درا هەندێ لەشێخەکانی بەکتاشی بکوژرێن، و ئەوانی دیکە بۆشوێنە دوورەکان دوور بخرێنەوە، و دوای ئەوە لەناو خەڵکیدا بوو بەباو، هەر کەسێ ناحەزی خۆی بەبەکتاشی تاوانبار دەکرد بۆئەوەی لەدەستی ڕزگاری ببێت. جەودەت پاشای مێژوونووسی تورکی پێی وایە کەزۆربەی ئەوانەی بەتۆمەتی بەکتاشی دوورخرانەوە، بێ تاوان بوون. هەرچی سامانی بەکتاشی هەبوو، چووە سەر سامانی تەریقەتی نەقشبەندی.[380]

380-John Kingsley Birge(The Bektashi Order of Dervishes)-Bristol .1937-P.77-78



## چارەنووسیان لەعیراقدا:

فرمانی سوڵتان بۆلەناوبردنی ئینکشارییەکان لەکۆتایی هاوینی ئەوساڵەدا گەیشتە بەغدا. لۆنکریك دەڵێت: داود پاشای والی بەغدا، هەواڵی ئەو فرمانەی شاردەوە، بەهیوای ئەوەی دەرفەتێکی گونجاو بێتە پێشەوە، بۆئەوەی ملکەچیی خۆی بۆسوڵتان نوێ بکاتەوە، و پەیوەندیی لەگەڵدا باش بکات، و دواتر ئەو تەنیا هێزە لەقەڵەمڕەوەکەی خۆیدا لەناو ببات، بەبێ ئەوەی سەر بەو بێت.[381]

لەرۆژێکی دیاریکراودا، داود پاشا، لەگۆڕەپانی سەرادا ئینکشارییەکانی کۆکردەوە–هەموویان هەژدە پەل بوون–سەربازی تەواوی لەمەمالیك ئامادە کرد بەتۆپخانەی تەواوەوە، بۆکۆنترۆڵ کردنی گۆڕەپانەکە. ئەوسا فرمانی دا فرمانی سوڵتان بخوێننەوە، و بەسەرسووڕمانەوە فرمانەکە وەرگیرا. لەم چرکەساتە هەستیارەدا، داود پاشا دەستپێشخەرییەکی کرد، کەچاوەڕواننەکراو بوو، لەبری ئەوەی فرمان بدات تەقە لەئینکشارییەکان بکرێت، لەکاتێکدا فرمێسك بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، بەزمانی لالانەوە، داوای لێکردن مل بەفرمانی سوڵتان بدەنو بێنە ریزی سیستمی نوێی سوپاوە، کەسوڵتان

[381] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل261–262.

دایمەزراندبوو. هەرئەوەندە کەئینکشارییەکان گوێیان لەوە بوو، هەموو کڵاوەکانیان لەسەریان داگرت، بەنیشانەی رازیبوونیان،و هەموو داوایان کرد ناویان لەسیستمە نوێکەدا تۆمار بکەن. هەر ئەو حاڵەتە لەبەسرەو حیللەو شارەکانی دیکەی عیراقیشدا رووی دا.

بەکتاشییەکان تەکیەیەکیان لەگەڕەکی جعێفر، لەبەری کەرخ لەبەغدا هەبوو، داود پاشا داوای کرد لەتەکیەکە دەریان بکەن،و داوا لەسەید تەها حەدیسی کرا، تەکیەکە بەڕێوەببات، بەڵام دوای چەند رۆژێك لابرا، بەتۆمەتی ئەوەی خۆی سەر بەوان بووبێت. ئیبن سەنەدی بەسری لەو بارەوە دەڵێت:(دوای ئەوەی ئەو تەکیەیە شوێنی نەفرین کردنی یاران بوو، بوو بەماڵی حەدیس).[382]

[382] عوسمان کوڕی سەنەدی بەسری(مطالع السعود)-کورتکردنەوەی ئەمین حەلوانی- قاهیرە1371هـ-ل162.



## سەرەتای کێشمەکێش لەگەڵ داود پاشادا :

دوای ئەوەی سوڵتان مەحموود لەکێشەی ئینکشارییەکان‌و بەکتاشییەکان بووەوە، کەوتە بیری مەمالیك لەبەغدا، دیارە بەپێی ئەو راپۆرتانەی لەبەغداوە دەگەیشتن، داود پاشا نیازی پاك نەبوو، لەسەر لەناوبردنی ئینکشارییەکان، بەپێی ئەو فرمانانەی بۆی دەردەچوون.

لەساڵی 1828دا، سوڵتان، لەجێ بەجێ کردنی فرمانەکانیدا، کەمتەرخەمییەکی بەرچاوی لەداود پاشا بەدیکرد. هەر لەو ساڵەدا، بەمەبەستی پشتگیریی لەشۆڕشی یۆنان، روسیا شەڕی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاند،و رەشبگیری لەسەرانسەری هەرێمە عوسمانییەکاندا راگەیەندراو داوا لەهەموو والییەکان کرا، بەپێی توانا کۆمەك پێشکەش بەدەوڵەت بکەن. دەبوا داود پاشا شەش هەزار تورەکە پێشکەش بکات،[383] بەڵام ئەو لەناردنی ئەو بڕە، سەرپێچی کرد. لەئەستەنبوڵ ئەو نەناردنەیان بەراگەیاندنی یاخیبوون لەدەوڵەت لێکداوەتەوە، وەکو ئەوەی لەکاتی تەنگانەدا، پشتی لەسوڵتان کردبێت،و لەشانوشەوکەتی کەم کردبێتەوە.[384]

[383] ئەو سەردەمە دوو جۆر تورەکە هەبوو: تورەکەی زیو کەپێنج سەد قروش بوو،و تورەکەی زێڕ کەنرخەکەی دەهەزار قروش بوو، واتە بەرامبەر بە بیست تورەکەی زیو بوو. دیارە ئەو بڕە پارەیەی بۆداود پاشا لەبەرچاو گیرابوو، بۆئەو رۆژە بڕێکی یەکجار زۆربووە.

[384] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار (داود باشا والي بغداد)-قاهیرە1968-ل244.

لەهاوینی 1830دا، سوڵتان مەحموود پیاوێکی جێی متمانەی خۆی بەناوی سادق ئەفەندی بۆبەغدا نارد، و دەسەڵاتی ئەوەی پێدا، بەهەر شێوەیەك بووە، داود پاشا لەناو ببات. وەکو دەردەکەوێت، سادق ئەفەندی پیاوی ئەو کارە نەبووبێت، کەدەبوا ئەو کارە بەنهێنی ئەنجام بدات، لەبەر ئەوەی داود پاشا پیاوێکی بلیمەت و دارودەستەی زۆر بوو، بەڵام ئەم پیاوە هەر لەسەرەتاوە رەوشی سووکایەتی کردنی بەداود پاشا گرتەبەر.

داود پاشا هەستی بەوە کرد کەسادق ئەفەندی دەیەوێت بیکوژێت، ئەگەر هاتو بەخۆشی ملی پێی نەدا، بۆیە داود پاشا بڕیاری دا زووتر دەستی خۆی بوەشێنێت. داود پاشا ئەو راوێژکارانەی خۆی کۆکردەوە، کەمتمانەی پێیان هەبوو، کەبریتی بوون لە:محەممەد ئەفەندی مەسرەف، سولەیمان ئاغا میراخۆر، سەرافباشی ئیسحاقی یەهودی، و پێکەوە نەخشەیەکی تۆکمەیان بۆکوشتنی سادق ئەفەندی داڕشت.

سادق ئەفەندی لەمیوانخانە، لەگەڕەکی سابوونچی نیشتەجێ بوو، لەشەوی 20ی تشرینی یەکەمدا، تیپێك لەسەرباز دەوری میوانخانەکەیان داو محەممەد ئەفەندی مەسرەف و سولەیمان ئاغا میراخۆر بەیاوەریی رەمەزان ئاغای سکرتێری داود پاشا، لەگەڵ عەریفێکی کەتە بەناوی خالید ئاغا هەڵیان کوتایە سەری. سادق ئەفەندییان لەخەو هەستان، و پێیان گوت شایەتمان بهێنە، ئەوەیش بەکەسێك دەگوترێت، کەبیانەوێت بیکوژن، تابەر لەوەی رەوانەی ئەو دونیای بکەن، شایەتمان بهێنێت.

کاتێ سادق ئەفەندی بینی، ئەمانە بەراستی دەیانەوێت بیکوژن، بەتەواوی تێکچوو، خۆی دا بەسەر پێی سولەیمان ئاغادا، و داوای



لێبووردنی لێکردن[385] وئامادەیی خۆی بۆهەر کارێك ئەوان بیانەوێت دەربڕی، بەڵام ئەوە هیچ سوودی نەبوو، و عەریف خالید ئاغا لێی هاتە پێشەوە و پشتوێنەکەی لەپشتی کردەوە و لەسەرخۆ لەملی ئەفەندی ئاڵاندو خێرا کۆتایی بەخۆی و بەپاڕانەوەکانی هێنا.[386]

## دەنگدانەوەی کوشتنەکە :

بۆرۆژی دواتر راگەیەندرا، کەنێردراوی سوڵتان تووشی نەخۆشی بووە، و گوایا لەجێگادا کەوتووە، لەمیوانخانە، و داود پاشا رۆژانە پزیشکی دەنارد گوایا بۆچارەسەری نەخۆشییەکەی ئەفەندی دەچێت، و چەندین کەسی دەنارد بۆهەواڵ پرسی.[387] دواتر پیاوێکیان هێنا، و جلوبەرگی ئەفەندییان لەبەر کرد، و یەك دووجار بەشەقامەکانی بەغدادا گێڕایان، بۆئەوەی گومانی کوشتنی لەناو خەڵکیدا نەهێڵن.

بەڵام ئەو نمایشانە سوودیان نەبوو، مقۆمقۆ لەناو خەڵکی بەغدادا بڵاو بووەوە، تائەوەی ئەو هەواڵە بەتایلەری کۆنسوڵی بەریتانیا گەیشت.[388] خەڵکی چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کێشە لەنێوان داود پاشا و

سولەیمان فایەق(تأریخ المماليك في العراق)–وەرگێڕانی محەممەد نەجیب ئەرنەوازی–بەغدا1961–ل58.

جیمس بیلی فرێزەر(رحلة فريزر)–وەرگێڕانی جەعفەر خەیات–بەغدا1964–ل119.

عەبباس عەزاوی(تأريخ العراق بين احتلالين)–بەغدا1954–ب1 ل206.

جیمس بيلي فرێزەر(سەرچاوەی پێشوو)ل120.

سوڵتاندا رووبدات، دەستیان کرد بەکڕینی خۆراك، و ئەمەیش بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخەکان، و هەندێ لەکەمایەتییەکان ترسی ئەوەیان لێنیشت، نەبادا ئەم ململانێیە کاربکاتە سەریان، بۆیە بەر لەهەڵگیرسانی شەڕ بەغدایان بەجێ هێشت.

کوشتنی سادق ئەفەندی لەئەستەنبوڵ و سەرانسەری هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەنگیدایەوە. لەو کاتەدا محەممەد عەلی پاشای والی میسر، هێزەکانی ئامادە دەکرد، تاپەلاماری شام بدات، و یاخیبوونی خۆی لەدەوڵەتی عوسمانی راگەیاند، وئەو دەرفەتەی قۆستەوەو نامەی بۆسوڵتان ناردو ئامادەیی خۆی راگەیاند، سوپا رەوانەی عیراق بکات، بۆئەوەی داود دەستگیر بکات، کەدەستی بەخوێنی نێردراوی سوڵتان ئالودە بووبوو.[389] هەندێ پێیان وابوو، محەممەد عەلی بەوفێڵە دەیویست، یان چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد سوڵتان داوای لێبکات، پەلاماری داود پاشا بدات، بەمەیش بتوانێت بەئاسانترین رێگە بەمەبەستی خۆی بگات. هەرچۆن بێت، سوڵتان ئەو دەرفەتەی لەدەستی محەممەد عەلی دا، و داوای لە عەلی رەزا پاشای والی حەلەب کرد، هێرش بکاتە سەر داود پاشا.

[389] عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار(مصر والعراق)-قاهیرە1968-ل135.



## تاعوون لەبەغدا:

عەلی رەزا سوپایەکی گەورەی پێکەوە نا، و لەسەرەتای شوباتی ساڵی 1831دا، لەحەلەبەوە پێشڕەویی کرد. هاوکات لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی ئەم جموجوڵە سەربازییە بۆ بەغدا، بەشێوەیەکی ترسناك تاعوون تیایدا بڵاوبووەوە، و ئەم تاعوونە هەموو ئەونەخشانەی هەڵوەشاندەوە، کەداود پاشا دایнابوو، بۆوەستان لەبەرامبەر ئەو هێرشەدا، و بەغدا وەکو پەڕی لێهات لەبەردەم بایەکی بەهێزدا، کەهیچ دەسەڵاتێکی نەما.

دەتوانین بڵێین، ئەم تاعوونە ترسناکترین نەخۆشی بوو کە رووی لەعیراق کرد، بەدرێژایی مێژووی خۆی، پیرەکانی خەڵکی بەغدا، تائەم دواییەیش باسی نەهامەتیی ئەو تاعوونەیان دەکرد، و ئیستا بازاڕێك هەیە لەبەغدا، بەناوی(السوق الجائف)لەبەر ئەوە ئەم ناوەی لێنرا، چونکە پڕبووبوو لەمردوو، و بۆنی مردووەکان بەڕادەیك بوو، کەکەس خۆی لەبەری نەدەگرت. پێویستە بەم بۆنەوە، هەڵوەستەیەك لەسەر ئەم تاعوونە بکەین، و باسی هەندێ لەڕووداوەکانی، و ئەوژیانە کۆمەڵایەتییەی لەو کاتەدا لەبەغدادا باوبوو بکەین.

تاعوونەکە لەباکوورەوە هات. لەمانگی تەممووزی ساڵی 1830 وە، بەغدا ئاگاداری ئەوە بوو کەلەتەبرێزدا، تاعوون بڵاوبۆتەوە، و دوای دوو مانگ هەواڵی گەیشتنی تاعوونەکە بەکەرکوك گەیشت، داود پاشا داوای لەپزیشکی کۆنسوڵگەریی بەریتانیا کرد، بەرنامەیك بۆدابڕینی نەخۆشەکان دابنێت، بۆرێگەگرتن لە دزەکردنی نەخۆشییەکە بۆ بەغدا. پزیشکەکە ئەو بەرنامەیەی داڕشت، بەڵام پیاوە ئایینییە کەللە رەقەکان

لەبەغدا، فەتوایان دەرکرد، کە ئەو دابڕانە تەندروستییە، بەپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، و ڕێگەیان بەداود پاشا نەدا، هیچ کارێك ئەنجام بدات بۆرێگەگرتن لەتەشەنەکردنی تاعوونەکە، بۆیە کاروانەکان بەسەربەستیی تەواوەوە، لەئێران و کوردستانەوە دەگەیشتنە بەغدا.[390]

لەکۆتایی ئاداری ساڵی 1831دا، یەکەم نیشانەی تاعوونەکە لەبەغدادا دەرکەوت، گەڕەکەکانی جوولەکەکان پیس بوون، و لەوێوە تاعوونەکە بەرەوگەڕەکەکانی دیکە تەشەنەی کرد. سولەیمان فایەق بەم جۆرە باسی ئەو سەردەمەی بەغدا دەکات: ژمارەی لاشەکان ، بەپێی لیستی کارمەندان، لەکۆتایی مانگی ئاداردا کە لەدەروازەکانی شارەوە، دەرکران گەیشتە هەزار لاشە، و لەناوەڕاستی مانگی نیساندا، ڕۆژانە گەیشتە سێ هەزار لاشە. دوای ئەوە کارمەندێك نەما تائەو ئامارە تۆمار بکات.[391]

ئەوروپییەکانی نیشتەجێی بەغداو هەروەها ئەو مەسیحییانەی پەیوەندییان بەوانەوە هەبوو، خۆیان لەماڵەکانیاندا قایم کرد، و لەماڵەوە دەرنەدەچوون، دوای ئەوەی هەموو پێداویستییەکی خۆیان لەماڵەوە دابین کرد. ئەگەر بیانویستایە شتێك لەدەرەوە بهێنن، لەپەنجەرەکانەوە سەریان دەخست و بەمەقاش وەریاندەگرت و قانگیان دەدا، بەر لەوەی بەکاری بهێنن. بۆیە کەمتر تووش دەبوون، و جاروبار لەرێگەی پشیلەوە نەخۆشییەکەیان بۆدەهات. بەڵام ئەوانی دیکە خۆیان دابووە دەستی چارەنووسەوە، و دەیدووریەنەوە، و دەڵێن ژمارەی مردووەکان، ڕۆژانە دەگەیشتە نۆ هەزار کەس.

[390] ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل267.

[391] بڕوانە ڕۆژنامەی(البلاد)ی بەغدادی، ژمارەی ڕۆژی1956/5/11.



سەیر ئەوەیە، دزان ئەو دەرفەتەیان دەقۆستەوە، و دزەیان دەکردە ماڵانەوە بۆئەوەی تالانیان بکەن، بەبێ ئەوەی لەخاوەنەکانیان سڵ بکەنەوە، چونکە یان مردبوون، یان گیانیان دەدا. لەو ڕووداوە خۆشانەی سەبارەت بەو ڕۆژانە دەیگێڕنەوە، ئەوەیە کەپیاوێك لەخەویدا بینی فریشتەکان لەکۆڵانەکەدا ڕەت دەبن، و ژمارەی مردووەکانی هەر ماڵێکیان تۆمار دەکرد، و بینی کەئەو ژمارەیەی سەبارەت بەماڵەکەی تۆمار کرابوو، یەکسان بوو بەژمارەی خێزانەکەی، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی مردبوون، تەنیا خۆی نەبێت، ئیتر وایزانی خۆیشی بەم زوانە مردووە. کاتێ لەخەو هەستا، خۆی بۆمردن ئامادە کرد، و خۆی شۆردو کفنی لەبەر کرد، دواتر ڕووەو قیبلە پاڵ کەوت. ڕێکەوت وابوو، لەو کاتەدا دزێك خۆی کرد بەماڵەکەیدا، و وایزانی خاوەن ماڵەکە مردووە، بەڵام لەپڕ چاوی پێکەوت هەڵدەسێتەوەو بەسەریدا دەنەڕێنێت، دزەکە لەترسانا دەمرێت. ئەوسا خاوەن ماڵەکە لەوە دڵنیا دەبێت، کەژمارەی مردوانی خێزانەکەی تەواو بووە، و ئیتر پێویست ناکات بمرێت، ئیتر لەژیاندا مایەوەو سوپاسی خودای کرد.

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، زۆربەی ئەوانەی دەمردن، بەهۆی تووشبوون بەنەخۆشیی تاعوونەوە نەبوو، بەڵکو لەترساندا دەمردن، بۆیە لەناو عیراقییەکاندا ئەو نەخۆشییەیان ناونابوو ختوورە. دیارە ئەو پیاوەی ئاماژەمان پێکرد، خەریك بووە بەهۆی ختوورە کردنەوە بمرێت، دواتر هەر بەهۆی ختوورە کردنەوە لەمردن ڕزگاری بووە. ڕەنگە لەجێگەی خۆیدا بێت، بڵێم ئەو پیاوە، باوکی باپیرم بووە.

## بینینەکانی گرۆفز:

لەکاتی تاعوونەکەدا، پیاوێکی ئایینیی خەڵکی بەریتانیا بەناوی گرۆفز، نیشتەجیی بەغدا بوو،و قوتابخانەیەکی بۆبیٚ سەرپەرشتە مەسیحییەکان کردبووەوە. کاتیٚ تاعوونەکە بڵاوبووەوە، کۆنسوڵی بەریتانیا داوای لێکرد لەگەڵیدا بڕوات بۆگوندەکانی دەوروبەری بەسرە، بۆخۆپاراستن لەو نەخۆشییە، بەڵام گرۆفز پشت بەخودا، لەبەغدادا مایەوە. گرۆفز بینینەکانی خۆی لەو رۆژە ترسناکانە، لەکتێبێکدا تۆمار کرد، کە لەساڵی 1832دا، لەلەندەن بڵاوکرایەوە. ئەم کتێبە ، سەبارەت بەرووداوەکانی تاعوونەکەی بەغدا، بەمتمانەپێکراوترین دەق هەژمار دەکرێت.

گرۆفزماڵەکەی داخست، دوانزە کەس ، لەوانە مامۆستایەکی ئەرمەنیو خێزانەکەی لەگەڵیدا دەژیان، پەنجەرەی ماڵەکەی دەیڕوانی بەسەر کۆڵانێکدا، هەشت ماڵی لەسەر بوو،و لەو کەلەبەرە بچووکەوە، رۆژانە ئەو لاشانەیان دەبینی دەردەهێنران، تائەوەی ژمارەیان گەیشتە حەڤدە کەس. شەقامەکان چۆڵ بووبوون، کەسی تیادا نەدەبینرا، جگە لەوانەی لاشەکانیان دەگواستەوە، یان کفنیان بۆدەبردنو ئەوانە نەبێت ئاویان دەبرد بۆشۆردنی مردووەکان.

لەرۆژی 24ی نیساندا، گرۆفز لەماڵەکەی چووە دەرەوە، بۆسەردانی کۆنسوڵی بەریتانیا، لەرێگادا چاوی بەکەس نەکەوت، تەنیا



ئەوانە نەبێت کەلاشە یان تووشبووەکانیان دەگواستەوە،و جلوبەرگی مردووەکان لەنزیکی زۆربەی دەرگاکاندا دانرابوو، دەرگای مزگەوتی گەورە داخرابوو، چونکە شوێنی بەخاك سپاردنی کەسی تیادا نەمابوو، ئیتر خەڵکی خۆیان لەکەناری رێگاوبانەکان،و تەنانەت لەسەر رێگاکان،و لەهەر شوێنێکدا بەردەستیان بکەوتایە، گۆڕیان هەڵدەکەند. لەکاتێکدا گروفز بەجلوبەرگە ئایینییەکەیەوە بەشەقامەکاندا دەگەڕا، چەند ژنە عەرەبێك بینییان، چەند ئاماژەیەکی سەیریان لێدەرکەوت، کەسەرنج راکێش بوون، هەروەکو بڵێی لەرێگەیەوە، قسەیان لەگەڵ خودادا کردبێت، کەفەرەنسیو کافری وەکو ئەو لەژیاندا مابن، لەکاتێکدا ئەو هەموو ژمارەیە لەموسوڵمانان دەمردن.

گروفز دەڵێت، کەمردن بووبوو بەکارێکی ئاسایی بەلای خەڵکییەوە، وایلێهاتبوو نزیکترین کەسی خۆیان، بەبیٚ هیچ گویٚ پێدانێك بەخاك دەسپارد، تا گەیشتە ئەوەی خەڵکی وەکو گەڵای دار لەرێگاوبانەکاندا دەکەوتن،و کەس بەخاکیانی نەدەسپارد،و تەنانەت هەندێکیان هێشتا گیانیان دەدا، کەسەگ بەردەبووە لاشەکانیان. ناخۆشترین دیمەن ئەوەبوو کەسەدان منداڵی بچووك لەرێگاوبانەکاندا هاواریان دەکرد، دوای ئەوەی دایکیان مردبوون،و هاتوهاواریان تێکەڵ بەحەپە حەپی سەگەکان دەبوو، کەلاشەی مردووەکانیان دەخوارد.

جیمس بیلی فرێزەر(سەرچاوەی پێشوو) ل93-114.

## دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی:

هەرجاریٚ نەخۆشییەك لەعیراقدا بڵاو دەبووەوە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەبینرا، هەروەکو گرۆفز بەشێوەیەك لەشێوەکان، لەبڵاوبوونەوەی تاعوونەکەدا تێبینی کرد، ئەویش بایەخدانی خەڵکی بوو، بەشۆردنی مردووەکان، و پاککردنەوەیان و کفن کردنیان، بەپێی رێنماییەکانی شەریعەتی ئیسلام. لەسەر ئەوە راهاتبوون، سەرپێچی لەو رێنماییانە بکەن لەژیانی رۆژانەیاندا، وبایەخیان پێنەدەن، کەچی لەکاتی مردندا، بایەخی تەواویان بەپابەندبوون بەرێنماییەکانی شەرع دەدا، لەکاتێکدا شۆردنی مردوو، لەکاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیدا، هێندەی دیکە نەخۆشییەکەی لەنێوانیاندا بڵاودەکردەوە.

لەوەیش سەیرتر ئەوەبوو، زۆربەی خەڵکەکە هەرکە بیانبیستایە نەخۆشی بڵاوبۆتەوە، بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆمردن، بەپەلە کەرەستەی پاککردنەوەو کفن کردنییان بۆخۆیان و ئەندامانی خێزانەکانیان دەکڕی، ئەوان لەوە دەترسان بەبیٚ ئەوە بەخاك بسپێردرێن، چونکە پێیان وابوو، ئەگەر پاك نەکرانایەتەوەو کفن نەکرانایە، ئەوا خودا فڕێی دەدانە دۆزەخەوە.

لەرۆژانی یەکەمی بڵاوبوونەوەی تاعوونەکە، لەبەغدادا هێندە داخوازیی لەسەر ئەوکەرەستانە زۆر بووبوو، نرخیان یەکجار بەرزبووبووەوە. گروفز دەڵێت، یەکێك لەفرۆشیارەکانماڵوێرانیی خەڵکەکەی قۆستبووەوە، و لۆکەی کفنی بەگران دەفرۆشت، دواتر خۆیشی مرد، لەشاردا ئەو ماددەیە نەمابوو، بۆئەوەی بەکاری بهێنن. نرخی پەت و گوریس چوار ئەوەندەی نرخی خۆی بەرزبووبووەوە.

داواکاریی لەسەر ئاو زۆر بەرزبووبووەوە، چونکە مردوویان پێدەشۆرد. هەروەکو فرۆشیاری کفن و پەت و گوریس، سەقاکانیش ئەو دەرفەتەیان قۆستبووەوە. ئەگەر لەیەکێك داوای دەبەی ئاو بکرایە، وەڵامەکەی ئەوە دەبوو، خۆی دەیبا بۆشۆردنی مردوویەك. هەندی کەس ناچار دەبوون، خۆیان بچن بۆکەناری رووبار، لەپێناوی هێنانی ئاو، بۆئەوەی منداڵێکی مردووی پێبشۆرن.[*]

## لەبیرەوەرییەکانی سولەیمان فایەق:

لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی تاعوونەکەدا، سولەیمان فایەق لەبەغدا بوو، ئەوسا لەتەمەنی لاویدا بوو، و هەندیٚ لەبیرەوەرییەکانی خۆی، لەو رۆژانەدا تۆمار کردووە، کەچەندین پەندی کۆمەڵایەتییان تیادایە، دەکریٚ بەتەواوکەری تێبینییەکانی گرۆفزیان دابنێین.

سولەیمان فایەق دەڵێت: کاتیٚ رۆژانە ژمارەی مردووەکان گەیشتە 600 و 700، ترسی زیاتری لیٚ دەنیشێت و دەچێت بۆلای باوکی و داوای لێدەکات رێگەی پێبدات لەترسی تاعوونەکە، بەرەو بیابان بڕوات، بەڵام

---

[*] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 98-99.

باوکی پێی دەڵێت:(کوڕم نابێ لەنەخۆشییەکە رابکەیت، ئەوانەی لەو حاڵەتەدا دەمرن، بەیاخی بوو دادەنرێن، باهەر لەشاردا بمێنینەوە، هەرکامێکمان مرد ئەوە شەهیدین، و ئەگەریش رزگارمان بوو، ئەوە خۆش بەخت دەبین). سولەیمان هەوڵی زۆری دا، راوبۆچوونی باوکی بگۆڕێت، و بیسەلمێنێت ئەو پیاوە ئاییینییانەی دژی دابڕانی نەخۆش بوون، بەهەڵەدا چووبوون، و شەریعەتی ئیسلام لەوەدا پشتگیرییان ناکات. دوای ئەوەی باوکی هاتە سەر بۆچوونەکەی ئەو، پێیگوت:(کوڕەکەم بەپێی مافە دێرینەکانمانو پەیوەندییە گشتییەکانمان، جوان نییە داود پاشا بەتەنیا بەجێبهێڵمو لەشار دەرچم، تۆبڕۆ، و منیش پەنا بەخودا، لێرە دەمێنمەوە، و بەخواستی خودا، من دەمەوێت لەگەڵ ئەم کاروانە پاکەدا بڕۆم بۆئەو دونیا، نەك ئەوەی لەدوادوای تەمەنمدا، بەشمشێری سیاسەت بکوژرێم).
ئیتر سولەیمان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیو چەند کەسێکی دی لەخەڵکی بەغدا، رۆیشتنو لەچۆڵەوانی لەنزیکی بەعقووبە خێوەتیان هەڵدا.

لەترسی نەخۆشییەکە، هەر چوار پێنج رۆژ جارێ، سولەیمان فایەق شوێنی خێوەتەکانی دەگۆڕی، و خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدا بوو،، لەمردن رزگاریان بوو، و تەنیا ئەوانەیان مردن، کەبەمەبەستی باراش هاڕین، دەیانناردن بۆگوندەکان. کاتێ تاعوونەکە سووك بوو، سولەیمان بەپەلە گەڕایەوە بۆبەغدا، لەترسی ئەوەی نەبادا، لەلایەن خێڵەکانی دەوروبەریانەوە، تالان بکرێن، چونکە محەممەد بەرەدیی شێخی شەمەرتوقە،بەمەبەستی تالان کردنیان پیاوەکانی خۆی، بۆدەوروبەری



خێوەتەکانیان دەنارد. دیارە ئەوانیش وەکو دزەکانی بەغدا، دەرفەتی تاعوونەکەیان قۆستبووەوە.

کاتێ سولەیمان فایەق لەگەڵ کەسوکارەکەیدا، گەیشتنە نزیکی بەغدا، تەماشای کرد، ئاو چواردەوری بەغدای گرتۆتەوە، چونکە ئاوی رووبارەکە لەدوادوایی تاعوونەکەدا هەڵسا بوو، و کەس لەشاردا نەمابوو، چارەسەری ئەو دیاردەیە بکات، زۆربەی گەڕەکەکانی کەوتبوونە ژێر ئاو، سولەیمان بەلەمێکی بەکرێ گرت، بەرەو ناوشار، تاگەیشتنە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن(حمام الراعي)، لەوێ دابەزینو بەپێ بەڕێ کەوتن.

سولەیمان دەڵێت لەو رێگایانەی پیایدا دەڕۆیشتن، کەسیان نەدەبینی، تەنانەت دایکی بەو کچانەی گوت کە لەگەڵیاندا بوون:(کچینە، جادەکان چۆڵن، بۆچی بەپێچەوە بڕۆین؟ ژنەکان پێچەکانیان لابرد، و نزیکەی نیو سەعات بەڕێدا چوون، بەبێ ئەوەی کەس ببینن.

کاتێ گەیشتنە گەڕەکی مەسیحییەکان، ژنێکیان بینی لەپەنجەرەی ماڵێکەوە، سەیریان دەکات، و ژنەکە هەواڵپرسی لەگەڵدا کردن، و لایکردەوە بۆناو ژوورەکە، و رایگەیاند کەهێشتا خەڵکی ماون. سولەیمان لەژنەکەی پرسی چۆن بەزیندوویی ماونەتەوە، لەکاتێکدا لەرێگاوباندا کەسیان نەبینی، ژنەکە وەڵامی دایەوەو گوتی:(ئێمە مەسیحیین، ئێمە چەند خێزانێکین، خۆمان لەخەڵکی دابڕی، سەرەتا چلو یەك کەس بووین، ئێستا سوپاس بۆخودا، بووین بەچلو سێ کەس، دوو منداڵمان بووە.

لەبەر ئەوەی ماوەیەکە کەسمان نەبینیوە، لێرەوە رەت ببێت، کاتێ ئێوەمان بینی، بۆمان دەرکەوت کەتاعوونەکە نەماوە، ئیتر بەوە خۆشحاڵ بووین).

دوای ئەوەی سولەیمان فایەق لەگەڵ ژنەکاندا، گەیشتنەماڵەوە، سەردانی داود پاشای کرد لەبارەگاکەی، بینی لەماڵەوە بێهۆش کەوتووە، بەهۆی تووشبوونی بەتاعوونەکە. دوای چەند رۆژ هەندێ تەندروستی باشتر بوو. کاتێ دز لەشاردا پەیدابوونو رووداوی دژ بەئاسایش تەشەنەی کردبوو، داود پاشا کارمەندانی بۆئەو مەبەستە دەستنیشان کردبوو، ئەگەرچی باری تەندروستی باش نەبوو، خۆی سەرپەرشتیی کارەکانیانی دەکرد.

هێشتا لاشەی مردووەکان لەماڵەکانو بازاڕەکانو رێگاوبانەکاندا مابوونەوە، و کەس لەبەر بۆنیان خۆی نەدەگرت، داود پاشا چەند کەسێکی راسپارد بەغدا پاک بکەنەوە، و پارەی بۆگواستنەوەی لاشەکان تەرخان کرد. بەبێ کفن کردن، هەزاران لاشەیان فڕێدایە ناو دیجلەوە، و زۆربەی ئەو لاشانە بەگوریس قاچیان دەبەست بەکلکی ئەسپەوەو لەسەردەم، بەرەو کەناری رووبار رایاندەکێشان.



## بەغدا ملکەچیی خۆی رادەگەیەنێت:

هێشتا بەغدا بەتەواوی، بەهۆی نەمانی تاعوونەوە، ئاهی بەبەردا نەهاتبووەوە، وئەوانەی هەڵهاتبوون، نەگەڕابوونەوە سەر ماڵو حاڵی خۆیان، هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە، کەپێشەنگەکانی سوپای عوسمانی، گەیشتوونەتە باخەکانی کازمییە، کەچەند میلێک لەباکووری بەغداوە دوورە.

عەلی رەزای فەرمانداەی سوپای عوسمانی، هێشتا لەموسڵ بوو، پێشەنگی سوپاکەی بەسەرکردایەتیی قاسم پاشا عومەری، بەهاوڕێیەتیی سفووقی شێخی شەمەرو سولەیمان غەننام لەشێخەکانی عەقیل. کاتێ قاسم پاشا گەیشتە نزیکی بەغدا، و نێردراوانی خۆی بۆلای زانایانو پیاوماقووڵانی بەغدا نارد، داوایان لێبکەن گوێڕایەڵی سوڵتان بنو داود پاشا دەربکەن. قازی بەغدا کەبرای قاسم پاشا بوو، لەو رووەوە هەوڵی زۆری دا.

دیارە داود پاشا، لای خۆیەوە بڕیاری دابوو خۆی بدات بەدەستی سوپاکەوە، هێشتا ئاسەواری نەخۆشییەکەی پێوە مابوو، تەنیا پەنجا کەسێك، لەخزمەتکارو پاسەوانەکانی مابوونەوە. تارۆژێکیان رووبەرووی خۆپیشاندانێکی گەورە بووەوە، لەگەڕەکی (باب الشیخ)ەوە بەرێ کەوت، و سەرۆکی گەڕەکەکان لەپێشی پێشەوە بوون، و دژی داود پاشا دروشمیان دەگوتەوە، دواتر دەوری سەرایان دا، و ئاگریان لەیەکێك لەدەرگاکانی

بەردا. یەکێك لەپیاوەکانی داود، بەبێ ئاگاداریی ئەو، چەند فیشەکێکی نا بەخۆپیشاندەرانەوە، کەبووە هۆی بریندار بوونی هەندێکیان، و ئەوانی دیکە رایان کرد.

سولەیمان فایەق دەڵێت: خۆپیشاندەران، مەبەستێکیان لەهاتنیان بۆسەرا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ، کەئاگاداری داود پاشا بکەنەوە، کەبەپێی فرمانی هاتوو لەلایەن سوڵتانەوە، لەسەر کار لابراوە، بۆیە هەرکەسە گەڕایەوە بۆماڵی خۆی.[1]

داود پاشا هەستی بەوە کرد، کار لەکار ترازاوە، بەتاریکیی شەو، لەگەڵ فەیروز، کۆیلە حەبەشییەکەیدا، دەرچوو، و خۆی کرد بەماڵی حەبیبە خاندا. بەیانیی رۆژی دواتر، کەهەواڵەکە بڵاوبووەوە، پیاوماقووڵان و زانایان سەردانیان کردو بەرێزەوە لەماڵەکە هێنایانە دەرەوە، و بردیان بۆماڵی ساڵح بەگی کوڕی سولەیمانی گەورە، بۆئەوەی پارێزگاری لێبکات، تادواتر بیدەن بەدەستی والیی نوێوە.

قاسم پاشای عومەری لەکازمییەوە گەیشتە بەغدا، و دانیشتوانی بەغدا بەهەموو چینەکانیەوە، پێشوازییان لێیکرد، و بەرێزەوە بردیان بۆسەرا).[2] قاسم پاشا پێی وابوو، هەموو شتێك کۆتایی هاتووە، و بەغدا کەتۆتە ژێر دەستییەوە، و ناردی بەدوای عەلی رەزا پاشادا لەموسڵ، بۆئەوەی خێرا بگاتە بەغدا، و دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت.

[1] سولەیمان فایەق(تأریخ بغداد)-وەرگێڕانی موسا کازم نەوڕەس-بەغدا1962-ل82.
[2] سولەیمان فایەق(تأریخ المماليك في بغداد) ل65-66.



## گۆڕانکارییەکی سەیر:

بەرەبەیانی 13ی حوزەیرانی 1831، کاتێ قاسم پاشا عومەری لەسەرادا، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد داود پاشا بدرێت بەدەستەوە، گوێی لەغەڵبەغەڵبێك بوو لەدەرەوە. دوای کەمێك بۆی دەرکەوت، کەخەڵکێکی زۆر دەوری سەرایان داوە، بەسەرکردایەتیی مەحموود ئەفەندی نەقیب، دەیانەوێت پەلاماری بدەن، پێکهاتبوون لەدانیشتوان و مەمالیك و تاقمێکی زۆر لەخێڵی عەقیل کەنیشتەجێی بەری کەرخ بوون. خەڵکەکە توانییان خۆیان بگەیەننە جبەخانەی چەك، و دواتر سەرایان بەفیشەك و تۆپ داگرت.

سولەیمان غەننام و نزیکەی سێ هەزار لەخێڵی عەقیل لەگەڵ قاسم پاشادا، لەناو سەرادا بوون، و بەرگرییان لەسەرا کرد. واتە خێڵی عەقیل بووبوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان بەرگرییان لەناوەوە دەکرد، و بەشێکیان لەدەرەوە پەلاماریان دەدا. دەمەو ئێوارە سولەیمان غەننام هەستی بەوە کرد، لەپاڵ لایەنی دۆڕاودا شەڕ دەکات، یەکسەر پەلاماری جبەخانەکەیان دا، و قوفڵەکانیان شکاندو تاڵانیان کرد، دواتر ئاگریان بەردایە سەراو بەتاڵانییەکانیانەوە لەسەرا هاتنە دەرەوە، بەرەو(باب المعظم) و لەوێوە خۆیان فڕێدایە ناو رووبارەکەوە و بەرەو بەری کەرخ پەڕینەوە، و هەندێکیان لەکاتی پەڕینەوەدا خنکان.

جەماوەری دەوروبەری سەرا چوونە ناوەوەو هەرچییەکیان بەردەست کەوت تالآنیان کرد، و هەموو ئەوشتە ئەنتیکانەیان برد، کەداود پاشا خولیای کۆکردنەوەیان بوو. پارەو زێڕو زیوی زۆر دەبینرا، لەکۆڵانەکاندا، دوای ئەوەی لەدەستی عەقیلییە هەلآتووەکان کەوتبوو، و تالآنچی دەیانماشییەوە. لەسەروبەندی ئەو بشێوییەدا، قاسم پاشا بێ سەروشوێن بوو، بەپێی گێڕانەوەی فرێزەر، گوایا کاتێ پاسەوانە تایبەتەکانی لێی تەکینەوە، ئەحمەد ئاغا(تفەنگچی باشی) خستوویەتییە بیرێکەوە.[*]

دیارە ئەم وەرچەرخانە لەرەفتاری دانیشتوانی بەغدادا، شتێکی سەیرو سەرنج راکێشە، لەپێچی مێژەرێکدا هەڵگەڕانەوە، لەهەڵوێستی ملکەچبوون بۆ فرمانی سوڵتان بۆهەڵوێستی یاخی بوون لێی، دەبێ هۆکەی چی بێت؟ سولەیمان پاشا هۆی ئەو دیاردەیە-کەخۆی شایەتحاڵی بوو- بۆئەو کارە دزێوانە دەگێڕێتەوە، کەپیاوەکانی سەر بەسولەیمان غەننامو سفووق ئەنجامیان دا، دوای هاتنی قاسم پاشا بۆبەغدا، و هەرچی کاری خراپ بوایە ئەنجامیان دەداو ماڵانیان تالآن دەکردو دەستدرێژییان دەکردە سەر ژنان، تەنانەت سفووق فرمانی بەپیاوەکانی خۆی دابوو، بێوەژنەکەی سولەیمان ئاغای بۆبهێنن، و لەهەموو شوێنێکدا بەدوایدا بگەڕێن، گوایا عەلی رەزا پاشا بەوی بەخشیوە.[*] سولەیمان فایەق پێی وایە، ئەم کەتنانە بوونە هۆی ئەوەی دانیشتوانی بەغدا، دژی قاسم پاشا راپەڕن، و دژی فرمانی سوڵتان بووەستنەوە، دوای ئەوەی ملیان پێی دا.

---

[*] جیمس بیلی فرێزەر(سەرچاوەی پێشوو) ل122.

[*] سولەیمان فایەق(تأريخ بغداد) ل83-84.



## بەرەنگاربوونەوەی خەڵکی بەغدا:

هەرچۆنێك بێت، خەڵکی بەغدا-دوای رووداوی پەلاماردانی سەراو کوشتنی قاسم پاشا-یەکیان گرت، و ئەمە یەکەمین جار بوو، خەڵکی گەڕەکەکانی بەغدا، یەکریز بووەستن، بەبێ ئەوەی لەگەڵ یەکدیدا ناتەبابن. وەکو نەریتی خۆیان، پیاوماقووڵانو زانایان دەستیان کرد بەنووسینی داواکاری بۆسوڵتان، داوایان لێکرد داود پاشا، یان ساڵح بەگ بکرێت بەوالی، و ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی کەپارەیەکی زۆری بدەنێو باجی ساڵانە، لەهەزارەوە بکەن بەدەهەزار تورەکە.[*]

کاتێ عەلی رەزا پاشا بەمەی زانی، بەهێزەکەیەوە، بەرەو بەغدا پێشڕەویی کرد. لەسەرەتای مانگی تەمموزی 1831دا، لەبەغدا نزیك بووەوەو لەباخەکانی سلێخدا خێوەتی هەڵدا، و گوشاری لەسەر بەغدا توند کرد، چەند شەڕێك لەنێوان ئەوانو خەڵکی بەغدادا رووی دا.

خەڵکی بەغدا، لەسەر دوو ئاست شەڕیان دەکرد: یەکێکیان سەربازی بوو، بەسەرۆکایەتیی مسیۆ دیفۆو هەوادارانی داود پاشاو مەمالیك، و ئەوی دیکە خەڵکی بەهەڕەمەکیو بەبێ سەرکردایەتی بوون، نوێنەرایەتیی دانیشتوانی گەڕەکەکانی بەغدایان دەکرد، کەسەرەك گەڕەكو ئەلەوجەلەکان سەرکردایەتییان دەکرد.

گومانی تیادا نییە، خەڵکی گەڕەکەکان، لەشەڕەکاندا گەلێ ئازا بوون، بەڵام زۆرجار بۆخۆیان خراپ بوون، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن،

---

[*] یوسف عیزەدین(داود باشا ونهاية المماليك في العراق)-لەگۆڤاری کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا-شوباتی1960-ل16-17وەرگیراوە.

وەکو هەموو کارێکی دیکەی ئاژاوەگێڕان. ڕەنگە بەبێ ئامانج، یان بەبێ نەخشە دەست بدەنە شەڕ کردن، لەژێر کاریگەریی هاواری یەکێك لەو ئەلەو جەلانە، ئیتر وەکو مێگەل دوای دەکەون، بەبێ ئەوەی بزانن بۆچی دەڕۆن و بوکوێ دەڕۆن.

جارێکیان، حەشاماتێکی زۆر لە(باب المعظم) کۆبوونەوە، دەنگی فیشەك و تۆپ ئاسمانی گرتبووەوە، تاقمێکیان سەریان بۆشەڕ دەخورا. ئەو تاقمە لەچەندین کوڕی ئازای گەڕەکەکان پێکهاتبوون، کەحەزیان دەکرد ئازایەتیی خۆیان، لەشەڕدا بنوێنن، بۆیە سووربوون لەسەر کردنەوەی دەروازەی سوور، و هاتنە دەرەوە بۆشەڕکردن لەگەڵ عەلی ڕەزا پاشادا. حەسەن ئاغای کوڕی عەلیش ئەفەندی هانیانی دەدا. ڕزوان ئاغا– کەیەکێك بوو لەمەمالیکە هۆشیارەکان–ئامۆژگاریی دەکرد، و ڕوونی دەکردەوە بۆیان، کە ئەوکارەیان ئاکامی باشی نابێت، بەڵام گوێیان پێی نەداو لەڕوویدا وەستانەوەو سووکایەتییان پێی کرد، دواتر بۆی دەرچوون. دیارە سەرەتا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، دەستیان بەسەر مۆڵگەیەك لەکەناری ڕووبارەکەو دەستیان بەسەر چەکەکانی و دوو تۆپدا گرت، ئەمە بوغرای کردن و لەسەر ڕێگەی ئەعزەمییە، پەلاماری مۆڵگەیەکی دیکەیان دا، لەوێ یانزە سوار لەهایتە لێیان هاتنە دەست و شکاندنیان، و دوایان کەوتن تاکردنیان بە(باب المعظم)دا. کاتێ خەڵکەکە ئەوشکستەیان بینی، بەرەو ناوەوە ڕایان کرد، بەرەو چایخانەکان، و دەبوون بەژێر پێی یەکدییەوە، و بەوەیش هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان بریندار بوون.

سولەیمان فایەق(سەرچاوەی پێشوو) ل100.



## قەتڵوعامی مەمالیك:

لەگەڵ دەستپێکردنی مانگی ئەیلوولدا، بەهۆی گەمارۆکەوە، چیتر خەڵکی بەغدا بەبەریانەوە نەما، خۆراك بەتەواوی کەم بووەوە، و بەبێ ترس و بەبێ شەرم، بەئاشکرا شتومەکی تاڵان دەفرۆشران.

دەستو پێوەندی عەلی ڕەزا پاشا لەناو بەغدادا بڵاوبووبوونەوە، ورەی خەڵکییان دەڕووخاند، و داوایان لێیان دەکرد ملکەچی سوڵتان ببن. لەشەوی14ی ئەیلوولدا، خەڵکەکە بەبەریانەوە نەما، بازرگانێك بەناوی حاجی خەلیل، لەگەڵ چەند هەوادارێکیدا، دەروازەی سووری باشووریان کردەوە، ڕێگەیان بۆسوپای عوسمانی خۆشکرد تابێنە ناوەوە، و بەمەیش بەغدا داگیر کرا. ئەوسا خۆشی و شادی بەغدای گرتەوە و نرخەکان بەتەواوی دابەزین، و دوکانەکان کرانەوە و تاوانەکان نەمان.

عەلی ڕەزا پاشا نەخشەیەکی دارشت، بۆقەتڵوعامی مەمالیك. لەهەندێ ڕووەوە، لەنەخشەکەی محەممەد عەلی پاشا لەمیس دەچوو، کاتێ هاتە بەغداوە، شێوازی ئاشتبوونەوە و تەبایی لەگەڵ هەمواندا گرتەبەر، و وایدەرخست کەلەدەستی مەمالیك ڕازییە، وپۆستی بەرزی بەهەندێکیان بەخشی، بەڵام لەناخدا دەیویست ستەمیان بەرامبەر بکات. ڕۆژێکیان مەمالیك و چەند پیاوماقووڵ و زانایەکی بەغدا بانگهێشت کران بۆدیوانی پاشا، بەبیانووی گوێگرتن لەفرمانێك کە بەودواییە

جیمس بیلی فرێزەر(سەرچاوەی پێشوو) ل122.

ستیڤن هیمسلی لۆنکریك(سەرچاوەی پێشوو) ل276.

لەئەستەنبوڵەوە هاتبوو، ئەوسا سەربان و ڕاڕەوو بەر داڵانەکانی سەرا پڕبووبوو لەسەربازی چەکدار. دوای ئەوەی بانگهێشکراوان قاوەیان خواردەوەو نێرگەلەیان کێشا، خەریك بوو فرمانەکە بخوێننەوە، پیاوێك بەناوی عەلی ئاغا هەستاو داوای لەسەربازە ئەلبانییەکان کرد، کەهەر هەموویان لەسەر پێ بوون، بۆئەوەی هەر یەکەیان، مەمالیکی پاڵ خۆی بکوژێت. بەڵام کاتێ زانی ئەوانە دەست بەکار نابن، عەلی ئاغا نەڕاندی بەسەریاندا: چیتانە؟ بۆوەستاون؟ لێیاندەن–یان دەبێ بیانکوژن، یان دەبێ ئێوە بکوژرێن–دواتر شمشێرەکەی هەڵکێشاو مەمالیکەکەی پاڵ خۆی کوشت، و بەر لەوەی مەمالیك فریای خۆیان بکەون، هەر هەموویانیان لەناوبرد. لەناو کوژراوەکاندا ئەوانەیش بەدیدەکران، کەلەتاقمەکەی خۆیان جیابووبوونەوەو چووبوونە پاڵ عەلی ڕەزا پاشاوە، بەر لەوەی بێتە ناو بەغداوە، بەڵام ئەوە بەدادیان نەگەیشت.

دواتر فرمان بەقەتڵوعامی هەموو مەمالیك دەرچوو، لەهەر شوێنێك ببینرێن، شایەتحاڵێك دەگێڕێتەوە، کەچۆن ساڵح بەگی کوڕی سولەیمانی گەورەیان کوشتوە، کەیەکێك بوو لەوانەی ئامادەی ئاهەنگی قەتڵوعامەکە نەبووبوو، کەچۆن چەند سەربازێك پەلاماریان داوە، و ئەویش بەسەر ئەسپەکەیەوە بووە، و بەلێدان تێیکەوتوون و ئەویش وتوویەتی(آمنت باللە)و شایەتمانی هێناوەو دواتر بێ هۆش کەوتۆتە سەر زەوی. بۆی هاتوون و سەریان لەلەشی جیاکردۆتەوەو دواتر لاشەکەیان لەکۆڵانێکدا، بەدانەپۆشراوی بەجێ هێشتووە.

---

جیمس بیلی فرێزەر(سەرچاوەی پێشوو) ل116.

سولەیمان فایەق(سەرچاوەی پێشوو) ل116.



ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە، داود پاشا کەسەری بەڵاکە بوو، وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو، و عەلی پاشا بەرێزەوە ڕەوانەی ئەستەنبوڵی کرد، و لەوێ سوڵتان ڕێزی بۆدادەناو دوای ئەوە، بوو بەوالیی چەندین هەرێم و چەندین پۆستی بەرزی وەرگرت.

## ڕایەك بۆقسە لەسەرکردن:

دکتۆر عەبدولعەزیز نەوار، لەم ماوەیەدا بابەتێکی لەگۆڤاری هیلال لەقاهیرە بڵاو کردۆتەوە، باسی ئەو شەڕانە دەکات، کەلەنێوان خەڵکی بەغداو هێزە عوسمانییەکاندا ڕوویان دا، کەعەلی ڕەزا پاشا سەرکردایەتیی دەکرد، و لەم بارەوە بۆچوونێك دەخاتە ڕوو، کەشایستەی ئەوەیە باسوخواسی لەسەر بکرێت، چونکە پەیوەندییەکی تۆکمەی بەبارودۆخی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگەی عیراقەوە هەیە.

پوختەی بۆچوونەکەی دکتۆر نەوار ئەوەیە، کەخەڵکی بەغدا لەساڵی 1831دا، بۆیە دژی سوپای سوڵتان وەستانەوە، چونکە هەستێکی نیشتمانی و نەتەوەیی پاڵی پێوەدەنان، لەو بارەوە دەڵێت:(...سوڵتان مەحموودی دووەمی عوسمانی دەیویست مەمالیك لەعیراقدا دەربکات، ئەوەیش وایلێکردبوو، لەعاستی ئەو پێشکەوتنەی ، کە لەسەردەمی داود پاشای دوا والیی مەمالیك لەعیراقدا رووی دابوو کوێرایی دابێت... بەڵام لەناوبردنی داود پاشا کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، چونکە بەگشتی، جێگەی متمانەی خەڵکی عیراق بوو، و بەتایبەتی

متمانەی توێژی رووناکبیری بەغدای بەدەست هێنابوو، چونکە والییەکی ریفۆرمخوازو زانایەکی پڕ بوو، و گەلێ بایەخی بەزمان و ئەدەبی عەرەبی دەدا...بۆیە ، کاتێ سوڵتان مەحموودی دووەمی بەسوپایەکی گەورەوە، بەسەرکردایەتیی عەلی رەزا نارد، بۆدەرکردنی داود لەبەغدا، خەڵکی بەغدا پشتیان گرت، چونکە داود لەبەرچاوی خەڵکی بەغدادا، لەتورکە عوسمانییەکان باشتربوو، بۆئەوەی دەسەڵاتی بەغدا بەڕێوە ببات، و دەبوا سوڵتان رێز لەخواستی خەڵکی بەغدا بگرێت، لەدامەزراندنی والیدا. بۆیە خەڵکەکە هاوبەشیی داود پاشایان کرد، لەخۆئامادەکردن، بۆبەرگری لەوڵات دژی سوپای سوڵتان...وبەمەیش خەڵکی عیراق سەلماندییان، کەمەسەلەکە، بەئەندازەی ئەوەی مافی خەڵکی وڵاتە، لەدەستنیشانکردنی والی شایستەدا، تەنیا ململانێی نێوان داودو سوڵتان نییە...).[1]

ئەوەی ئەم راوبۆچوونەی دکتۆر نەوار بخوێنێتەوە، ئەوەی بەلاوە ساغ دەبێتەوە، کەخەڵکی بەغدا، لەو سەردەمەدا هەستێکی نیشتمانپەروەریی تەواویان هەبووە، و کاتێ چەکیان دژی سوپای سوڵتان بەرزکردەوە، بۆئەوە بوو، بەرامبەر ستەمی دەسەڵاتی عوسمانی، بەرگریی لەمافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان بکەن. دکتۆر نەوار ئەوەی فەرامۆش کردووە، یان بەفەرامۆشیی سپاردووە، کەعیراقییەکان لەو سەردەمەدا، شتێکیان دەربارەی بیرۆکەو زاراوە سیاسییەکان نەدەزانی، کەئەمڕۆ مێشکی ئێمەیان پڕکردۆتەوە، ئەوان نەیاندەزانی نیشتمانپەروەری و نەتەوایەتی، یان ئازادی و سەربەخۆیی یان مافی

[1] بڕوانە لاپەڕە19ی ژمارەی تایبەتی 1965/2/1ی گۆڤاری(الهلال)کە لەقاهیرە دەردەچێت.



دیاریکردنی چارەنووس و ئەو جۆرە شتانە، کەلەم سەردەمەدا برەویان هەیە، چی دەگەیەنن. ئەوان تەنیا لەدەمارگیریی خێڵەکایەتی، و ئەو شتانەی پەیوەندییان بەنەریتی تۆڵەسەندنەوەو غیرەت وپیاوەتی و ئەو جۆرە بەهایانەی لەرۆشنبیریی کۆمەڵایەتیی باوی ئەو سەردەمەوە سەرچاوەیان دەگرت، بەولاوە لەشتێکی دیکە حاڵیی نەدەبوون.

من پێموایە، شەڕەکانی ساڵی 1831، لەرووی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتییەوە، جیاوازییان لەگەڵ شەڕە گەڕەکەکاندا نەبوو، کەلەسەردەمی مەمالیکدا بەغدای گرتبووەوە، تەنیا ئەوە نەبێت، کەخەڵکی بەغدا، لەم شەڕانەی دواییدا، لەدژی سوپای سوڵتاندا، یەك بەرە بوون، بەڵام لەشەڕەکانی پێشووتردا، شەڕیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد، بەڵام دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، ئەوان لەهەموو شەڕەکانیاندا، بەهۆی راپەڕینێکی بێ سەروبەرەوە، بۆشەڕکردن هان دەدران، لەلایەنسەرۆکی گەڕەك یان شەقاوەکانیانەوە، بەبێ ئەوەی هۆکاری راستەقینەی ئەو بزاوتە بزانن.

ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لەعیراقدا بەدیدەکەین، و لەهەر وڵاتێکی دیکەدا، کەبەهەمان بارودۆخی کۆمەڵایەتیدا رەت ببێت، بۆبەرپابوونی بزاوتێك، لەگەڕەکێکدا، ئەوەندە بەسە کەپیاوێك بەدەنگێکی زوڵاڵ و زمانێکی لووسەوە پەیدا ببێت، و داوا لەخەڵکی گەڕەك بکات، و داوای یارمەتییان لێبکات، ئەوسا زۆر لەخەڵکی گەڕەك دەبینێت، بەهانایەوە دێن، ئیتر بیانەوێت، یان نەیانەوێت، چەك هەڵدەگرن و دەڕژێنە ناو کۆڵانەکانەوە. لەوەیش زیاتر خۆیان فش دەکەنەوە، ئەگەر ببینن ژنان سەیریان دەکەن، یان هەڵهەڵەیان بۆلێدەدەن، ئیتر بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، حەز دەکەن خۆیان فڕی بدەنە باوەشی مەرگەوە.

جاروبار روودەدات، خەڵكی گەڕەك دەست بدەنە شۆڕشێك، بەبێ ئەوەی بەروونی بزانن بۆچی شۆڕشیان بەرپا كردووە. ڕەنگە دوایی هاواریێ بكەون، و وایلێكبدەنەوە، كە شتێكی سادەیە، وەكو شەڕەگەڕەكە ئاساییەكان نەبێت، دواتر ڕووداوەكان، بەتەوژمی خۆیان ڕایاندەماڵن، هەنگاو بەهەنگاو، كاتێ دەزانن كەوتونەتە هێڵی ئاگرەوە، لەبەرامبەر هێزێكی گەورەدا، كەتوانای بەرنگاربوونەوەیان نییە، ئەوسا بەرەو دواوە وەردەگەڕێن و بۆی دەقووچێنن، و یەكدی دەكەن بەژێر پێوە.

پێموایە، هەر ئەمەبوو، كە لەساڵی 1831دا، لەبەغدا رووی دا. خەڵكی لە(باب المعظم)ەوە دەرچوون، بۆبەگژداچوونەوەی سوپای سوڵتان، دیاربوو لەو كاتەدا كەوتبوونە ژێر ئەو هەڵچوونەوە كەهەندێ لەمەمالیكی وەكو حەسەن ئاغا لەوانیاندا هەژاندبوو. خۆ ئەگەر لەسەرەتاوە، بكەوتنایەتە ژێر كاریگەریی كەسێكی دیكەوە، ڕەنگە لەبری بەگژداچوونەوەی، هەڵچوونەكەیان بەرەو پشتگیریكردنی سوپای سوڵتان ئاراستەی بكردنایە.

جێگەی داخە، هەندێ لەنووسەرو توێژەرەكانمان دەبینین، لەم ڕۆژانەدا، بەهەمان شێوازەكەی دكتۆر نەوار، ڕووداوەكانی مێژوو ڕاڤە دەكەن. هەوڵی ئەوە دەدەن ڕووداوەكان بەو شێوەیە ترش و خوێ بكەن كەخۆیان دەخوازن، بەبێ لەبەرچاوگرتنی كات و شوێن. واتە ڕووداوەكانی ڕابردوو، بەوجۆرە ڕاڤە دەكەن، كەدەبوا بەخواستی ئەوان ڕووی بدایە، نەك لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی بەڕاستی، چۆن ڕوویان داوە.



## پاشكۆكان

ئەمساڵ و ساڵی ڕابردوو، چەند وانەیەكم گوتەوە، لەهەندێ یانەو كۆمەڵەدا لەبەغدا، دەربارەی بابەتی كۆمەڵگەی عیراق، لەم قۆناغەدا كەپیایدا ڕەتدەبێت، هەروەها توێژینەوەیەكم خوێندەوە، لەهەمان بابەت لەكۆنگرەی جیهانیی شەشەمی كۆمەڵناسی، كەلەئیڤیان لەساڵی 1966دا بەسترا، وهەروەها توێژینەوەیەكی دیكەم ئامادە كرد، بۆئەوەی لەكۆنگرەی حەوتی ئەدیبە عەرەبەكان بیخوێنمەوە، كە لەبەغدا، لەنیسانی ڕابردوودا بەسترا، بەڵام بارودۆخێكی تایبەت بەخۆم، دەرفەتی پێشكەشكردنی ئەو بابەتەی بۆنەڕەخساندم. بۆیە بەباشم زانی ئەم پاشكۆیانە، بڵاو بكەمەوە، و پوختەی ئەو وانەو توێژینەوانە لەخۆ بگرێت، كەڕەنگە بەجۆرێ لەجۆرەكان، سوود بەخوێنەر بگەیەنێت. با خوێنەر لەوە بمبوورێت، كەئەگەر لەم پاشكۆیانەدا هەندێ دووبارەبوونەوەی بەدیكرد، لەو ڕاوبۆچوونانەمدا، كە لەكتێبەكانی پێشووترم، یان لەم بەشەی كتێبەكەمدا هاتوون. مەبەست لەم پاشكۆیانە، ئەوەیە وێنایەك سەبارەت بەگشت ڕاوبۆچوونەكان بدات بەدەستەوە، كەسەبارەت بەكۆمەڵگەی عیراق و چۆنیەتیی پێكهاتنی كەسایەتیی تاكی عیراقی پێی گەیشتووە.

# پاشكۆی یەكەم

## گۆڕان و ناكۆكیی كۆمەڵایەتی

ئێستا هەموو جیهان رووبەرووی گۆڕانكارییەكی گەورەی كۆمەڵایەتیی ئەوتۆ بووەتەوە، كە لەهیچ قۆناغێكی مێژووییدا بەخۆوەی نەبینیوە، زانست لەم سەردەمە نوێیەدا، داهێنانی مەزنی لەئامێرەكانی رێگاوبان و گەشت و گواستنەوەو راگەیاندن و بڵاوكردنەوەدا بەرهەم هێناوە، بەجۆرێ كەچیتر دەرەتانی گۆشەگیریی كۆمەڵایەتی و كزبوونی كۆمەڵایەتی لەئارادا نابێت، لەهیچ كۆمەڵگەیەكدا، هەرچەندە دواكەوتوو بێت، یان بەزنجیرە چیای بەرز دەوری گیرابێت.

لەرابردوودا، سەفەر لەسەرخۆبوو، تەنانەت عەرەب گوتویانە:(سەفەر بەشێكە لەدۆزەخ)، بۆیە گۆشەگیریی كۆمەڵایەتی، بەسەر زۆربەی كۆمەڵگە مرۆڤایەتییەكاندا مۆركێكی زاڵ بووە، كەچی ئێستا بەپێچەوانەوە، پەیوەندیی و سەردان و هاموشۆ لەنێوان كۆمەڵگەكاندا، بووە بەنیارێكی باو، دیارە ئەمەیش، كەم تازۆر، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گۆڕان لەهەموو كۆمەڵگەكەدا. بەدەگمەن تێبینی ئەوە دەكرێت كۆمەڵگەیەك هەبێت، بتوانێت گۆشەگیریی كۆمەڵایەتیی خۆی بپارێزێت، بەبێ ئەوەی ئەو شارستانییە گەورەیەی لەجیهاندا هەیە، كاریگەریی لەسەری نەبێت.



بینیمان ماوەیەك لەمەوبەر، چۆن یەحیا حەمیدودینی ئیمامی پێشووتری یەمەن ویستی یەمەن لەكاریگەرییە دەرەكییەكان دابڕێت، بەڵام سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، هەروەها لاما لەتبت و كەسانێكی دیكەیش شكستییان هێنا.

## سەرەتای گۆڕانكاری لەعیراقدا:

سەرەتای پەیوەندیی شارستانیش لەعیراقدا، بۆسەردەمی داود پاشا دەگەڕێتەوە، كاتێ ئەم والییە هەوڵی دا هەندێ داهێنان و سیستمی ئەورووپی بهێنێتە ناو وڵاتەوە، دوای ئەویش چەند والییەكی دیكەی وەكو رەشید پاشا(أبو المناظر) و نامیق پاشا هەمان كاریان ئەنجام دا. لەدەیەی حەوتەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، كەشتی هەڵم لەعیراقدا پەیدا بوو، و هێڵی تەلگراف بۆراكێشرا، ئەمانە كاری سەرسووڕهێنەر بوون بەلای خەڵكییەوە، واقیان لەتاوتوێكردنی وڕمابوو، وەكو تەكانێكی فیكری وابوو، مێشكیانی كردەوە، بەرەو ئاسۆگەلێك كەپێشتر لەخەویشدا نەیاندەبینی.

لەساڵی 1869دا، كەناڵی سویس كرایەوە، گرنگییەكی گەورەی كۆمەڵایەتیی بۆعیراق هەبوو، چونكە مەودای دەریایی نێوان عیراق و ئەورووپای كەمكردەوە، و سەفەرو گواستنەوەی كاڵای ئاسان كرد. وارێكەوت لەو ساڵەدا، پیاوێكی ریفۆرمخواز، كەخولیای ئاوەدانكردنەوەو نوێخوازی بوو، ببێت بەوالیی بەغدا، كەئەویش مەدحەت پاشا بوو. ئەم پیاوە تەنیا نزیكەی دوو ساڵ والیی بوو، بەڵام لەعیراق، و بەتایبەتی

لەبەغدادا، نیمچە شۆڕشێکی بەرپا کرد، و بۆماوەی چەندین ساڵ خەڵکی لەیادیان نەدەکرد. لەم بارەوە شتێکی خۆش دەگێڕنەوە، گوایا پیرەژنێکی دانیشتووی کەرخ، کاتێ (گاری)ی بینی، کەمەدحەت پاشا لەنێوان بەغداو کازمییەدا خستییەکار، بەسەرسوورمانەوە دەمی کردەوەو هاواری کرد:(تەنیا دەرەقەتی مردن نایەن). کاتێ گاریی دوو نهۆمی بینی لەسەر هێڵ، و جووتێ ئەسپ رایدەکێشن، وایزانی ئەوە ئەوپەڕی داهێنانە، کەهزری مرۆڤ پێی گەیشتووە.

لەساڵی 1908دا، کاتێ بۆیەکەم جار ئۆتۆمبیل گەیشتە بەغدا، هاتنە دەرەوە، بۆئەوەی تەماشای بکەن، و زۆربەیان سەیری ژێری ئۆتۆمبیلەکەیان دەکرد، تاچوار پەلی ئەو ئەسپە شاراوەیە بدۆزنەوە، کەلەناو سکیدایە، چونکە نەیاندەتوانی ئەوە لەمێشکی خۆیاندا وێنا بکەن، بەبێ ئەوەی ئەسپێك رایبکێشێت، بتوانێت لەشوێنی خۆی بجوڵێت. دوای ماوەیەکی کەم بیستییان کەفەرەنسییەکان ئۆتۆمبیلێکیان داهێناوە، بەئاسماندا دەفڕێت، ئیتر ئەوە دواشت بوو کەمێشکییان وەریدەگرت، و بۆیەکدییان دەگێڕایەوە، بەلای ئەوانەوە وایلێهاتبوو، کەبڕوا بەهەموو شتێك بکەن، چونکە هەرچیت بگوتایە رێی تێدەچوو. ئەوە زەنگێك بوو بۆدەستپێکردنی ئەم قۆناغە نوێیە، کەهەموو پێوەرە فیکریو کۆمەڵایەتییەکان وەرچەرخانیان بەخۆوە بینی.



## نەگونجاویی کۆمەڵایەتی:

رەنگە راست بێت، ئەگەر شەڕی یەکەمی جیهان بەرووداوێ لەنێوان دوو سەردەمی جیاواز لەعیراقدا دابنێین، سەردەمی گۆڕانی لەسەرخۆو سەردەمی گۆڕانی خێرا، لەرووی دەرئەنجامە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە، جیاوازییەکی گەورە، لەنێوان ئەو دوو سەردەمەدا هەیە. لەتایبەتمەندییەکانی گۆڕانی لەسەرخۆ، ئەوەیە کەکۆمەڵگە بەگوزەری رۆژ لەگەڵیدا رادێت و بەپێچەوانەی گۆڕانی خێراوە، ململانێی توند لەنێوان کۆن و نوێدا دروست نابێت.

نکوڵیی لەوە ناکەین، کەئەو گۆڕانە خێرایەی، لەشەڕی یەکەمی جیهانەوە، لەعیراقدا رووی دا، گەلێ بەسوودی کۆمەڵگە بوو، چونکە لەماوەیەکی کورتدا، چەمکەکانی شارستانیی نوێ رووی تێکرد، و لەرووی ماددییەوە، بەرەو پێشەوە هەنگاوی گەورەی نا، و ئەگەر بەراورد بکەین لەنێوان باری ئێستای عیراق، لەگەڵ باری نیو سەدە لەمەوبەریدا، جیاوازییەکی گەورە دەبینین، لەرووی ئاستی ئاوەدانی و ئابووریو دانیشتوان و تەندروستی و زانستی و شتی دیکەوە، بەڵام دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، کەئەم پێشکەوتنە گەورەیەی شارستانی، لەهەمان کاتدا کێشەی کۆمەڵایەتیی گەورەی نایەوە. بەبۆچوونی من، گەورەترینیان کێشەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بوو. سروشتی ژیان وەهایە، شتێك نییە سوودی

بۆخەڵكیی هەبێت، بەبێ ئەوەی لەهەمان كاتدا زیانیشی نەبێت، تۆباوییەكان بەهەڵەدا چووبوون، كاتێ وایان بەخەیاڵدا هات، دەكرێ ژیان كێشەو بەدكاریی تیادا نەبێت، ئەوە ژیانێكە لەسەر ئەم زەوییەدا نابینرێت، یان باشتر وایە بڵێین، لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ناگونجێت.

سروشتی گۆڕانی خێرا وەهایە، كەبەیەك ئاست كاریگەریی لەسەر هەموو بەشەكانی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی نابێت. گەلێ جار دەبینین، دوو بەش پێكەوە گرێدراون، دواتر گۆڕان لەیەكێكیاندا روو دەدات، بەبێ ئەوەی لەوی دیكەدا روو بدات، یان ئەوەی لەیەكێكیاندا، خێراتر روو دەدات، ئەمەیش دەبێتە هۆی ململانێ و نەگونجان لەنێوانیاندا، ئەمەیە كە بە (نەگونجانی كۆمەڵایەتی) ناوی دەبەم.

راستییەكەی، كۆمەڵگەی عیراق لەم قۆناغەیدا، بەدەستی چەندین نەگونجانێكەوە دەناڵێنێت، و جارێكیان هەژمارم كردن، بینیم زیاتر لەچواردە ناكۆكین، و رەنگە لەوەیش زیاتر بن. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ئەم نەگونجاوییانە بژمێرم، بەڵام دەمەوێت هەندێكیان بەنموونە بهێنمەوە:



## نەگونجاویی ماف و ئەركەكان:

ئاشكرایە ماف و ئەرك دوو لایەنن هاوشان و پێكەوە گرێدراون، ناكرێ لەژیانی عەمەلیدا لەیەكدی جیابكرێنەوە، و دەمارگیریی خێڵەكایەتی یان دەمارگیریی گەڕەكەكان، لەسەردەمی عوسمانیدا لەسەر بنەمای هاوشانیی نێوان ماف و ئەرك دانرابوو، تاك چاوەڕوانی ئەوە بوولەخێڵ یان گەڕەكەكەی كە لەكاتی تەنگانەدا پشتی بگرێت، و ئەگەر شەڕی كرد لەسەری بكاتەوە، و ئەگەر كوژرا خوێنی بسێنێت، لەبەرامبەردا، ئەویش دەبوا ئامادەی شەڕ بێت لەگەڵیداو لەخوێن باییدا بەشداریی بكات، و ئامادەبێت، لەپێناویدا خۆی بەكوشتن بدات، بەبێ ئەوەی بپرسێت :بۆ؟

كاتێ شارستانیی نوێ رووی تێكردین، لەگەڵ خۆیدا بیرۆكەیەكی بۆپەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان هێنا، كەجیاواز بوو لەگەڵ ئەوبیرۆكەیەی پێشتر لەسەری راهاتبووین، ئەویش بیرۆكەی(نیشتمان)بوو، لەبری بیرۆكەی(خێڵ) یان(گەڕەك)، و دەبوا تاك لەبری ملكەچ بوون بۆدابونەریتی كۆنی خێڵەكایەتی، ملكەچی دامودەزگاو یاساكانی حكومەت بێت. لێرەوە یەكێك لەدیاردەكانی نەگونجاویی كۆمەڵایەتی لەناوماندا دەركەوت. ئێمە ئەو مافانەمان پاراست كەبەسەر حكومەتەوە هەمانبوو، و مشووریمان

دەخواردو باسمان دەکرد، بەلاّم ئەوەمان فەرامۆش کرد، کەئەویش هاوکات، ئەرکی هەیەو دەبیّ تاك ئەنجامی بدات.

بەشێوەیەکی گشتی، مرۆڤ زوو هەست بەوە دەکات، چەندە ماڤی بەسەر ئەوانی دیکەوە هەیە، بەلاّم هەولّ دەدات، ئەو ئەرکانە فەرامۆش بکات کەپەیوەندییان بەو مافانەوە هەیە، یان خۆیانی لێدەدزێتەوە، یان کەمتەرخەمییان تیادا دەکات، و دواتر بەجۆریّ پاساوی بۆدەهێنێتەوە. واتە مرۆڤ بەر لەوەی ئەرکەکانی رابپەڕێنێت، داوای مافەکانی خۆی دەکات. تاکی عیراقی ئەم کارەی ئەنجام دا، کاتیّ شارستانیی نویّ بیرۆکەو پرەنسیپەکانی خۆی بۆهێنا.

عیراقییەکان لەسەردەمی عوسمانیدا، حکومەتیان بەدوژمنی خۆیان دەزانی، شانازییان بەوەوە دەکرد، لەفرمانەکانی یاخی ببن، و بەچاوی قێزەونەوە سەیری ئەوانەیان دەکرد هاوکارییان دەکرد، و بەهەوالّدزیان لەقەلّەم دەدا، و ئەگەر راکردوویەك لەدەستی حکومەت پەنای پێیان ببردایە، دەبوا دالّدەی بدەن و بەرگری لیّ بکەن و لەپیاوەکانی حکومەت بیانشاردایەتەوە. ئەم نەریتە کۆمەلاّیەتییانە، لەنێوان خەلّکیدا تائێستایش ماوە، و تائێستایش زۆربەیان ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت، سەرپێچیی یاسا دەکەن، یان گلّۆپی سەر جادەکان دەشکێنن، یان پەیڕەویی لەوەستانی ریزدا ناکەن، و رەنگە هەندێکیان لەبەر ئەوە رێزیان لێبگرن، و بەپیاوی جەربەزە دایانبنێن، کەبەرەنگاری حکومەت دەبنەوەو لێی ناترسێن.



لەعیراقدا دیاردەیەکی گشتیی کۆمەلاّیەتی هەیە، کەڕەنگە لەهەموو شوێنێکدا هەستی پێبکەین، ئەویش ئەوەیە کەتاکی عیراقی حەز بەوە دەکات رەخنە ئاراستەی حکومەت بکات و سەرزەنشتی بکات، لەهەر شتێکدا لەکاروباری ژیان کەحەزی پیّ نەکات، و گەلیّ جار حکومەتەکەی بەوحکومەتانە بەراورد دەکات، کەلەرووی شارستانییەوە گەلیّ پێشکەوتوون، و دواتر دەست دەکات بەجنێودان. ئەو دەیەوێت حکومەتەکەی پێشکەوتووترین حکومەت بێت لەجیهاندا، بەلاّم ئەوە فەرامۆش دەکات کەهاوکاریی ناکات و پەیڕەویی یاساکانی ناکات. بەواتایەکی دیکە، بۆنموونە دەیەوێت وەکو حکومەتی سوید وابێت، لەکاتێکدا ئەو، وەکو باوکی چۆن لەگەلّ حکومەتی عوسمانیدا رەفتاری دەکرد، ئاوها هەلّسوکەوت لەگەلّ حکومەتەکەی خۆیدا دەکات. ئەو وەکو هاوولاّتییەکی سویدی مافەکانی خۆی دەپارێزێت، بەلاّم وەکو ئەو ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجیّ ناکات. لێرەدا نامەوێت بەرگریی لەحکومەتی عیراق بکەم، بەلّکو ئەوە راستییەکی کۆمەلاّیەتییە دەبیّ بگوترێت.

## نەگونجاویی قوتابخانە و ئەرك:

سیستمی چینایەتی لەسەردەمی عوسمانیدا، داخراو یان نیمچە داخراو بوو، زۆرجار کوڕ پیشەکەی باوکی ئەنجام دەدا، و لەناو خەڵکیدا واباو بوو:(هەرچییەکت لەناوچاواندا نووسرابێت هەر ئەوەیە). کاتێ چەند مەکتەب–قوتابخانەی نوێ– لەکۆتایی ئەو سەردەمەدا کرانەوە، تەنیا منداڵانی کارمەندەکان –کەپێیان دەگوتن ئەفەندی–یان وەردەگرت، و کەمتر منداڵانی پیاوماقووڵانیان وەردەگرت. زۆربەی خەڵکی منداڵەکانیان نەدەخستە مەکتەب، چونکە ئەوەیان بەبیردا نەدەهات، کەرۆژێ لەرۆژان کوڕەکانیان بەئەفەندی ببن، وێڕای ئەوەی کەواباو بوو، مەکتەب منداڵ بەدخوو دەکات، بۆیە بەعەرەبی دەیانگوت(ذب الكتب من ايدك، شغل المكتب مايفيدك) واتە کتێبەکانی دەستت فڕێ بدە، کاری مەکتەب بەکەڵکت نایەت.

بەڵام دوای ڕەتبوونی چەند ساڵێك بەسەر کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهاندا، ئەو بارە وەرچەرخانی گەورەی بەسەردا هات، وردە وردە دانیشتوان بەهەموو چینەکانیەوە، روویان لەقوتابخانەکان دەکرد، و ساڵ بەساڵ زیاتر دەبوون، و بائاشکرا ئارەزووی ئەوەیان دەکرد لەرێگەی قوتابخانەوە، بەئەفەندی ببن و پەنجەیان بۆرابکێشن. دروشمی(ئەوەی لەناوچاواندا نووسرابێت) لەمێشکی ئەم نەوەیەدا نەما، و دروشمی(کێ



هەوڵ بدات، بەری ماندوو بوونەکەی خۆی دەخوات)و (کێ هەنگاوی نا، بەشوێنی مەبەست دەگات) شوێنیان گرتەوە.

لەراستیدا حکومەتی عیراقی، دامودەزگاکانی فراوانییان بەخۆوە بینی، و بەزەحمەت توانی ساڵ بەساڵ دەرچوانی قوتابخانەکان لەخۆ بگرێت، بەڵام ئەم فراوانبوونە لەفەرمانگەکاندا، هاوشانی ئەو ژمارە زۆرەی دەرچوانی قوتابخانەکان نییە، و دەبێ رۆژێك بێت، فەرمانگەکان نەتوانن ئەو هەموو کارمەندە نوێیانە لەخۆبگرن، مەگەر بەرادەیەکی کەم نەبێت، و پێموایە ئەو رۆژە نزیکە، یان خەریکە دێتە پێشەوە.

ئەمڕۆ، ژمارەی قوتابیانی سەرەتایی، لەعیراقدا زیاتر لەملیۆنێکە، لەکاتێکدا سەرجەم دانیشتوانی عیراق لە10 ملیۆن زیاتر نابێت. هەموو ئەو قوتابییانە دەیانەوێت ناوەندی تەواو بکەن، دوای ئەوەی سەرەتایی دەبڕن، و دواتریش زانکۆ تەواو بکەن، و کاری شایستەی بەخۆیان دەستگیر ببێت. ئەگەر لەخوێندنیشدا سەرکەوتوو نەبوون، ئەوا دەبن بەکێشە بۆخۆیان و بۆکەسوکاریان، و ئەگەر دەرچوونایە، دەبوون بەکێشە بۆحکومەت. ئاسان نەبوو بۆیان بگەڕێنەوە، بۆدروشمی(ئەوەی لەناوچاواندا نووسراو)، و لەم جیهانەدا حکومەتێك نییە، بتوانێت هەموو خەڵکەکەی خۆی بکات بەئەفەندیی یەخە سپی.

## نەگونجاویی ژن‌و پیاو:

شارستانیی نویٚ چەندین بیرۆکەو بەهای، سەبارەت بەپەیوەندیی ژن‌و پیاو بۆهێناوین، کەجیاوازن لەگەڵ ئەوانەی لەنەوەی رابردوودا لەسەری راهاتووین، ژن ئەوسا بۆی نەبوو بەراشکاوی راوبۆچوونی خۆی، سەبارەت بەشووکردنی دەرببڕێت، چونکە کەسوکارەکەی بۆیان هەبوو، لەسەر شووکردنەکەی لەسەر مارەییەکەی سازش بکەن،و بۆی نەبوو لە(بەڵیٚ) زیاتر شتێکی دیکە بڵێت، خۆئەگەر ملی نەدایە،و ئەو وشەیەی بەدەمدا نەهاتایە، ئەوا بەعاشق تاوانبار دەکرا،و باوکی دارکاریی دەکرد، یان بەخەنجەر سەری دەبڕی.

سیستمی ژنهێنان لەرابردوودا، لەسەر بیرۆکەی(مارەبڕین) بوو، ئیستا بەرەو بیرۆکەی(خۆشەویستی) هەنگاوی خێرای ناوە. دوای ئەوەی ژن لەم سەردەمەدا، فێری خوێندن بوو، لەفەرمانگەکاندا دامەزرا، چیتر ئامادە نییە سازشی لەسەر بکرێت، لەشتێکدا کەخۆی ویستی تیادا نەبێت، ئەو دەخوازێت کاری خۆی بەدەستی خۆیەوە بێت،و خۆی هاوسەری خۆی هەڵبژێرێت،و مەبەستی لەوە، ئەوەیە شوو بەکەسێك بكات کەیەکدییان خۆش بوێت.

(خۆشەویستی) بووە بەئەفسانەیەکی باو لەنێوان کچان‌و کوڕانی ئەم نەوەیەدا، هەروەکو بڵێی یەکێکە لەخەونەکانی ژیان،و مرۆڤ ناتوانێت بەبیٚ خۆشەویستی بژی. داهێنانە نوێکانیش یارمەتیی ئەوەیان داوە ئەم



ئەفسانەیە بڵاو ببێتەوە، وەکو سینەماو رادیۆو بڵندگۆو تەسجیل، ئەوەتا گۆرانیی خۆشەویستی لەهەموو شوێنێکدا بڵاودەکرێتەوەو تەنانەت پیرەکانیش دەیلێنەوە، کەخۆم یەکێکم لەوانە.

دواتر تەلەفیزۆن پەیدا بوو، کەوەکو سینەماو شوێنی سەماوو شوێنی گۆرانی وتن وایە، خەڵکی دەیبەنە ماڵەوەو منداڵەکانیان" بەکوڕو بەکچەوە، لەسەری پەروەردە دەکەن. رۆژێك دێت، هەروەکو چۆن بەومنداڵانەی دوای داگیرکاریی بەریتانیامان دەگوت( منداڵانی رووخان)،بەم منداڵانە دەڵێین(نەوەی تەلەفیزۆن).

رۆڵەکانی ئەم نەوەیە، لەسەر تەماشاکردنی تەلەفیزۆن، لەماڵەکانیاندا پەروەردە دەبن، رۆژانە فیلم یان نمایش یان گۆرانی یان سەمایەك دەبینن،و هەرهەموویان دەڵێن(خۆشەویستی..خۆشەویستی..خۆشەویستی...)، ئیتر ئەفسانەی خۆشەویستی لەدڵیاندا گەورە دەبێت. بەر لەوەی باڵق ببن، هەوڵ دەدەن لاسایی ئەوە بکەنەوە، کە لەتەلەفیزۆندا دەیبینن، کوڕ بەدوای کچ‌و کچیش بەدوای ئەو کوڕەدا دەگەڕێت کەوێنای دەکات،و لەجیهانی خەونە خۆشەکاندا باڵەفڕیٚ دەبن، تائەوەی ئەو رۆژە دێتە پێشەوە، لووتیان بەبەردی ئەو واقیعەدا دەتەقێت، کەلەپێشیاندایە، کەئەویش بەردی نەگونجاویی کۆمەڵایەتییە، کەبەبیٚ ئەوەی هەستی پیٚ بکەن دەوریانی تەنیوە.

کێشەی ئەوان ئەوەیە، کەئەوان بیرۆکەکانی خێزانەکانیان بەخێرایی دەگۆڕن، لەکاتێکدا پورو پیرەژنەکانی گەڕەکەکانیان هێشتا هەر پابەندی بیرۆکە کۆنەکانی خۆیانن، یان ئەوەتا کەمیٚ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

تاکی نەوەی نویٚ ڕەنگە لەو ڕوانگەیەوە دڵداری بکات، کەگوایا پیرەژنەکانی گەڕەکەکەیشی، پێشتر وەکو ئەو دڵدارییان کردووە.

لایەنێکی دیکەی ئەم ناکۆکییە، لەناخی تاك خۆیدا ڕوو دەدات، کوڕ حەز دەکات دڵداریی لەگەڵ کچدا بکات، و بەزمانی لووس فریوی بدات، و ئەگەر کچە ملی داو ویستی شووی پیٚ بکات، ئەوا نەریتە خێزانییە کۆنەکان، لەناخی کوڕەدا دەوروژێت، و بەڵێنە بریقەدارەکانی بۆکچەکە لەبیر دەکات، و بەدوای کچێکی دیکەدا دەگەڕێت، کەلەگەڵ ئەو نەریتانەدا بگونجێت، و ڕەنگە لەسەر شێوازی باوو باپیرانی خۆی، داخوازیکەران، بۆداواکردنی بنێرێت.

ئەو فیلمانەی لەتەلەفیزۆن یان لەسینەماکاندا پیشان دەدرێن، گەلیٚ جار نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاوا دەخەنە ڕوو، بۆکوڕ لەڕۆژئاوادا، کەدڵداریی لەگەڵ کچێکدا دەکات، دەبیٚ ئەو کچەی خۆش بوویٚت، و دەیەوێت مارەی بکات. بەڵام کوڕانی عیراق، بەر لەوەی خودی خووەکە فێربن، دیاردەکانی ئەم خووە فێردەبن، ئەو لەسەرەتای خۆشەویستییەکەدا، لاسایی لەکوڕە ڕۆژئاواییەکە دەکاتەوە، کاتیٚ باسی خۆشەویستیی خۆی بۆدەکات، و بەڵێنی جوانی پێدەدات، بەڵام کاتیٚ دەیەوێت مارەی بکات، هەموو ئەو شتانە فەرامۆش دەکات، و بەدوای هاوسەرێکدا دەگەڕێت، کەنەزانێت خۆشەویستی مانای چییە. کوڕان لەعیراقدا، دەکریٚ بڵێین، بەرواڵەت(جیمس سنیوارت)ن، بەڵام لەناخدا(حاجی علێوی)ن. بەبیٚ ئەوەی خۆیان هەستی پیٚ بکەن، دوو فاقەییەك لەکەسایەتییاندا هەیە.



## نەگونجاویی ئایین و نەوەی نویٚ:

پیاوانی ئایینی لەسەردەمی عوسمانیدا، گونجاوبوون، لەگەڵ ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەدا، کەخەڵکی تیایدا دەژیان، هیچ نەگونجاوییەك لەنێوان ئەو دۆخەو ئەواندا نەبوو، و زۆربەی خەڵکەکە، بۆچارەسەرکردنی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتییان، پەنایان بەپیاوانی ئایینی دەبرد، و کەس لەپیاوانی ئایینی باشتر نەبوو، بۆچارەسەرکردنی کێشەکان، چونکە ئەوان نوێنەرایەتیی توێژی ڕووناکبیریان دەکرد، لەو سەردەمەدا، وێڕای ئەوەی نوێنەرایەتیی ئایین و ڕێنماییە پیرۆزەکانیان دەکرد.

کاتیٚ شارستانیی نویٚ هاتە عیراقەوە، و نەوەیەکی نوێی لەسەر پەروەردەبوو، بۆشاییەکی گەورە لەهزرو تێڕوانین بۆژیان، لەنێوان پیاوانی ئایینی و خوێندەواران لەنەوەی نویٚ دروست بوو. ئەم بۆشاییە هۆکاری زۆری هەبوو، لەوانە:

یەکەم: هەڵوێستی وشك و برنگی پیاوانی ئایینی، لەسەرەتادا بەرامبەر بەوەی شارستانی نویٚ لەگەڵ خۆیدا هێنای، لەبیروباوەڕو سیستەم و مۆدێلی جلوبەرگدا، بۆنموونە قوتابخانەو کارکردن لەدامودەزگاکان و شەبقەو جلی مۆدەو تاشینی ڕیش، و خوێندنەوەی ڕۆژنامەو فێربوونی زمانە بیانییەکان، و قایل بوون بەخڕبوونی زەوی، و ئەوەی کەگوایا باران لەهەڵم دروست دەبێت و گەلیٚ شتی دیکەی لەو بابەتەیان بەحەرام لەقەڵەم دا. تەوژمی شارستانی بەهێزەو کەس خۆی

لەبەردەمیدا ناگرێت، گەلێ لەخوێندەواران لەنەوەی نوێ دوای ئەو تەوژمە کەوتن، بەبێ گوێدان بە وتەی پیاوانی ئایینی. ئەوەی سەرنج راکێشە، ئەوەیە کەکوڕانی پیاوە ئایینییەکان خۆیان، دوای ئەو تەوژمە کەوتن،و وەکو ئەوانی دیکە دەچوونە قوتابخانەو ریشیان دەتاشیو رۆژنامەیان دەخوێندەوە،وبوون بەکارمەند،و دواتر لەوانە هاوسەریان بۆخۆیان دەستنیشان دەکرد، کەجلوبەرگی مۆدەیان لەبەر دەکردو...هتد.

دووەم: جاران مەسەلەی جیاکردنەوەی حەرام لەحەلاڵ،و پاك‌و پیس زیاتر مێشکی پیاوانی ئایینی بەخۆوە سەرقاڵ دەکرد،و کاتێ کتێبە گەورەکانی فیقه دەخوێنینەوە، دەبینین بەدەگمەن نەبێت، لەو چوارچێوەیە دەرناچن،و خوێنەر سەری سووڕدەمێنێت، کاتێ دەبینێ بابەتی(غوسڵ دەرکردن) ئەو هەموو بۆشاییەی لەکتێبە ئایینییەکان‌و کاتی زانا ئایینییەکانی گرتۆتەوە، لەکاتێکدا تەنیا چەند حەدیسێکی لەسەر هاتووە، کەچی زانایان، نەوە دوای نەوە، لق‌و پۆپی زۆریان لێکردۆتەوە، تائەوەی گەیاندویانەتە ئەم دۆخە،و ئەمڕۆ کێشەی پیاوانی ئایینی ئەوەیە، کەخوێندەوارانی نەوەی نوێ چیتر پێویستییان بەم جۆرە مەسەلانە نییە، وەکو باووباپیرانیان، بەدوایاندا ناچن، کەسیان گوێ بەلەش پاکیو لەش پیسی نادەن، وبەپێوە میز دەکەن، تەنیا گوێ بەمیکرۆب دەدەن کەنەخۆشی بڵاو دەکاتەوەو هیچی دیکە. بۆنموونە، مەی بەپاك دەزانن،و پێیان وایە کحولی تیادایەو میکرۆب دەکوژێت، لەکاتێکدا بەلای پیاوانی ئایینییەوە گەلێ گڵاوە. دەبزانە چەندە لەیەکدییەوە دوورن.



سێیەم: تائێستایش پیاوانی ئایینی، لەنووسینەکانیان‌و وتارەکانیاندا، لەسەر رێسا کۆنەکانی ئەرستۆتالیس دەڕۆن، کەئەویش چەمکێکە بەکەڵکی وتووێژ دێت، بەڵام بەکەڵکی دۆزینەوەی راستییەکان‌و سەلماندنیان نایەت. ئەوە لۆژیکی بەڵگەی هاوشانە، چونکە دەتوانیت، هاوکات، بۆراستیی هەر بۆچوونێك‌و بۆراستیی بۆچوونە دژەکەیشی بەبەڵگە بیهێنیتەوە. ئەمە بەئاشکرا لەمشتومڕی تایفەگەریدا دەردەکەوێت، کەتائێستا هەندێ لەپیاوانی ئایینی خۆیانی پێوە سەرقاڵ دەکەن، هەریەکێکیان دەیان بەڵگەی هزری و بیستراو دەهێننەوە، بۆئەوەی راستیی بیروباوەڕی خۆیان بسەلمێنن، لەکاتێکدا ئەگەر لەژینگەیەکی دیکەدا پەروەردە ببوایە، ئەوا بەڵگە هزریو بیستراوەکانی بەشێوەیەکی دیکە دەبوون. زۆربەی ئەو کتێبانەی پیاوانی ئایینی لەم سەردەمەدا دەریدەکەن، لەو جۆرەن، پارەو ماندوو بوونی زۆریان تێدەچێت، بەڵام سوودی ئەوتۆیان نابێت، چونکە کەسێکی سەر بەلایەنێك، بەقەناعەت ناچێتە سەر بیروباوەڕی تاقمێکی دیکە، لەرێگەی ئەو بەڵگانەوە کەدەیانهێننەوە. ئەم کتێبانە تەنیا خاوەنەکانیان، یان نەریتپارێزەکان قەناعەتیان پێیان هەیە، کەوەکو ئەوان بیردەکەنەوە، بەڵام خوێندەواران لەنەوەی نوێ نایانخوێننەوە، چونکە سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبی دیکەن،و ئەوان کاتێ بایەخ بەمەسەلە کانی تایفەگەری دەدەن، تەنیا لەبەر ئەوەیە کەیارمەتییان بدات، بۆئەوەی کارێکیان لەدامودەزگاکاندا دەست بکەوێت، یان پلەی بەرزتر بەدەست بهێنن تیایدا،و دەبینین دواتر، نەبەحەق‌و نەبەناحەق، بایەخ بەم تاقم یان ئەو تاقم نادەن.

**چوارەم:** لەسەردەمی عوسمانیدا، چەندین سرووتی ئایینی پەیدا بوون، کەبۆئەقڵی خەڵکی ئەو سەردەمە گونجاو بوون، و لەگەڵ بەها کۆمەڵایەتییەکانیاندا یەکیان دەگرتەوە، و ئێستا کەئەقڵی خەڵکەکە کراوەترە، ئەو سرووتانە لەشوێنی خۆیاندا ماونەتەوە، و تەنانەت هەندێکیان زیاتر نەشونمایان کردووە. روونترین نموونە، کەدەتوانین لەم بارەوە بیهێنینەوە، ئەوەیە کەپێی دەڵێن ڕێورەسمی حوسێنی، ئەم ڕێورەسمانە ساڵ بەساڵ گەورەتر دەبن، و زیان بەتاك و بەکۆمەڵ دەگەیەنێت، و زۆر لەپیاوانی ئایینی دەست لەئەژنۆ، لەبەرامبەر ئەم تەشەنەکردنەی ئەم ڕێورەسمە پڕ لەشەرمەزارییەدا وەستاون، تەنانەت هەندێکیان بەبەڵگە هزری و بیستراوەکانیان پشتگیرییان لێکردوە، لەکاتێکدا ئەرکی ئایینی داوایان لێدەکات، دەست لەناوی دەست، هەوڵی بنبڕکردنی بدەن. ئەو پاساوەی پیاوانی ئایینی دەیهێننەوە بۆپاککردنەوەی ئەم هەڵوێستەیان، ئەوەیە کەخەڵکی ڕەشۆك گوێڕایەڵیان نابن، ڕۆژێ یەکێکیان پێی گوتم:(ئەگەر حوسێن بۆخۆی بێت، بۆئەوەی خەڵکەکە لەو ڕێورەسمە بتەکێنێتەوە، بەگوێی ناکەن).

بەکورتی، پیاوانی ئایینی نەیانتوانیوە هاورەوتی ئەو گۆڕانە فیکرییە بن، کە لەسەردەمی نوێدا پەیدا بووە. ئێمە نکۆڵیی لەوە ناکەین کەتاقمێکیان خەریکە فێری راوبۆچوونی نوێ دەبن و هەوڵ دەدەن خۆیان لەگەڵ بارودۆخی نوێدا بگونجێنن، بەڵام گۆڕانەکەیان گەلێ لەسەرخۆیە، ئەگەر هاتو بەراوردی بکەین، لەگەڵ ئەو گۆڕانە گەورەیەی بەسەر هزری زۆربەی خەڵکیدا هاتووە.



# پاشکۆی دووەم

## سێ گریمانەکە

رەنگە ئەو خوێنەرەی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانی منی خوێندبێتەوە، هەر لەیەکەم کتێبمەوە، کەلەساڵی 1951دا دەرچوو تائیستا، بزانێت کەمن هەوڵم داوە، لەبەر تیشکی دوو گریمان، کۆمەڵگەی عیراقی راڤە بکەم: یەکەمیان دووفاقیی لەکەسایەتیدا، و دووەمیان ململانێی خێڵەکایەتی و شارستانییە، بەم دواییە گریمانی سێهەمم خستە سەریان، کەئەویش گریمانی نەگونجاویی کۆمەڵایەتییە. لێرەدا پێویستە دان بەوەدا بنێم–هەروەکو چۆن لەچەند بۆنەیەکی دیکەدا دانم پیادا ناوە– ئەمانە گریمانی خۆم نین، بەڵکو هەریەکەو لەکۆمەڵناسێکی بەناوبانگم وەرگرتووە: یەکەمیانم لەمایکفەر، و دووەم لەئیبن خەلدوون، و سێیەم لەئۆکبێرن وەرگرتووە، بەڵام کەم تازۆر دەستکارییانم کردووە، بۆئەوەی زیاتر لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵگەی عیراقدا بگونجێن.

دەمەوێ سەرنجی خوێنەر بۆئەوە رابکێشم، کەئەم سێ گریمانە، پەیوەندیی توندو تۆڵیان بەیەکدییەوە هەیە، و دەکرێ بەچەند روویەکی بابەتێك دایانبنێین، کەئەویش بابەتی کۆمەڵگەی عیراقە، لەم قۆناغەی پیایدا رەتدەبێت. لێرەدا کورتەی ئەو گریمانانە، بەپێی بەرودووی لۆژیکییان دەخەینە روو، بۆئەوەی بەرچاو رۆشنییەك سەبارەت بەو بابەتە گشتییەی پەیوەندیی پێوە هەیە، بۆخوێنەر برەخسێنین.

## ململانێی سارانشینیو شارستانی:

نیشتمانی عەرەب کە لەرۆژهەڵاتەوە، لەئۆقیانووسی ئەتڵەسەوە دەست پێدەکات، تاکەنداوی عەرەبی لەرۆژئاواوە، گەورەترین ناوچەی بیابان لەجیهاندا دەگرێتەوە، جگە لەوەی بەدرێژایی ئەم بیابانە چەندین خاکی بەپیتی بەراویشی تیادایە. بیابان سارانشینیو خاکی بەپیتیش شارستانی بەرهەم دەهێنن، و لەراستیدا ئەو خاکە بەپیتانە، لانکی کۆنترین شارستانیی مرۆڤایەتی بوونە. بۆیەنیشتمانی عەرەب گۆڕەپانێك بووە، بۆململانێی نێوان سارانشینیو شارستانی، هەر لەدەسپێکی مێژووەوە، و تائێستاش هەر بەو شێوەیە ماوەتەوە. بەدەگمەن دەتوانین شوێنێکی دیکە لەسەر گۆی زەوی پەیدا بکەین، ئەو تایبەتمەندییەی نیشتمانی عەرەبی تیادا بێت.

ململانێی سارانشینیو شارستانی، بەروونترین شێوە لەعیراقدا دەردەکەوێت، لەبەر چەند هۆیەك کەلێرەدا ناتوانین ئاماژەیان پێ بکەین. بەپێی دەربڕینی مێژوونووسی بەناوبانگ توینبی، عیراق وڵاتی هابیلو قابیلە. هەر ئەمەیش وایکردووە کەکۆمەڵگەی عیراق بەدرێژایی سەردەمەکان، بەر تەوژمی سارانشینی بکەوێت، و بەپێی بارودۆخ، ئەو تەوژمە لەهەڵکشانو داکشاندا بێت. دەتوانین بڵێین، کەدرێژترین ماوە، کەتەوژمی سارانشینی باڵی بەسەر عیراقدا کێشا، ئەو ماوەیەبوو، کەلەگەڵ



رووخانی دەوڵەتی عەباسیدا دەستی پێکرد، یان کەمێ پێشتر، دواتر بۆماوەی زیاتر لەشەش سەدە درێژەی کێشا. ئەو ماوە نائاساییە، بەرادەیەك تەوژمی سارانشینی توند بوو، کەدەسەڵاتی دەوڵەتی تیادا نەما، و ئاسایش شێوا، و لافاوو نەخۆشیو قاتوقڕی بەدوای یەکدا هاتن، و بەمەیش شارستانی بەرەو کزی چوو، و بەهاکانی سارانشینی گەورە بوون.

بۆتێگەیشتن لەسروشتی ئەو سەردەمە، هێندە دەڵێین کەسێ لەسەر چواری دانیشتوانی عیراق، لەژێر رکێفی سیستمی خێڵەکایەتیدا بوون، و بەهای تایفەگەریو داگیرکاریو تۆڵەسەندنەوەو خۆتێهەڵقورتانو خۆپاککردنەوەو ئەم جۆرە شتانە باوبوون. بەڵام یەك لەسەر چوارەکەی دیکە لەدانیشتوان-کەدانیشتوانی شارەکانیان پێکدەهێنا-ئەگەرچی بەرواڵەت، لەجلو بەرگو دانیشتنو شێوازی پەیداکردنی بژێویدا، جیاوازییان هەبوو، بەڵام لەناخیاندا جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵیاندا نەبوو، و دەمارگیریی کوڕی شار بۆگەڕەکەکەی، وەکو دەمارگیریی کەسی سارانشین بۆخێڵەکەی وابوو.

لەو ماوەیەدا شتێکی ئەوتۆ لەبەهاکانی شارستانی کۆن نەمابووەوە، جگە لەچەند پیشەیەكو پیشەسازییەکی سادە نەبێت، بەڵام کاتێ کەسایەتیی پیشەکارێك تاوتوێ دەکەین دەبینین، زیاتر لەبەهاکانی شارستانی، لەبەهاکانی سارانشینییەوە نزیکە. زیاتر لەوەی بیەوێت مامەڵەیەکی مرۆڤانە لەگەڵ کڕیاردا بکات، بەشێوازی خەڵکی شارستانی، هەوڵ دەدات بیخەڵەتێنێت، هەر ئەوەندە کڕیار چاوی خافڵ بوو، بەپەلە

قۆڵی دەبڕێت. بیری داگیرکاریو تالآن بەلایەوە، گەلیٚ لەبیری کارو بەرهەمهێنان بەهێزترە، ئەو زیاتر لەوەی بایەخ بەو قازانجە بدات کەلەسەرخۆو لەرێگەی ناودەرکردنەوە دەستەبەر دەبێت، بایەخ بەو قازانجە خێرایە دەدات، کە لەرێگای فریودانەوە دەستەبەر دەبێت. بۆیە مشتومڕی نێوان فرۆشیارو کڕیار، یان نێوان کرێکارو خاوەن کار، یان لەنێوان خاوەن پیشەو شاگرددا، لەناو شارەکانی عیراقدا باو بوو. وای لەوەی بیەوێت خانوویەك دروست بکات، کۆمەڵیٚ خەڵك دەوری دەدەن،و هەریەکەیان لەبیری ئەوەدا دەبن زەفەری پێببێنن. ئەگەر کەسێکیان فێڵی لێکردی، ئەوا لەو کارەی خۆی شەرم نایگرێت،و رەنگە زەردەخەنەیکی ساردت تێبگرێت، بەو مانایەی کەتوانی فێڵت لێبکاتو بەتۆ پێبکەنێت.



## ناکۆکیی کۆمەڵایەتی:

گرنگترین هۆکاری ئەم ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەی کەئەمڕۆ بەدەستییەوە دەناڵێنین، ئەوەیە کەشارستانیی نویٚ کۆمەڵیٚ بیرو پرەنسیپو بیرۆکەی هێناوە، ناگونجێت لەگەڵ نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا، کە لەم ژینگەیەی خۆماندا لەسەری پەروەردەبووین. بۆنموونە پرەنسیپەکانی یەکسانیو دادپەروەریو ئازادیو نیشتمانپەروەریو شتی لەم جۆرەی بۆهێناوین، کە لەراستیدا لەگەڵ بەهاکانی دەمارگیریو خزمایەتیو هاموشۆو خۆتێهەڵقورتانو غیرەتوپیاوەتیو نانو نمەكو نەریتەکانی دیکەدا یەکناگرنەوە، کە لەنەوەی رابردوودا باو بوون،و تائیستایش کاریگەرییان لەناخەکاندا ماوە.

ئەم بیرۆکە نوێیانە، لەچەندین رێگای جیاوازی وەکو قوتابخانەو حزبو ئاهەنگو خۆپیشاندانو رۆژنامەو کتێبو رادیۆو نمایشەوە پێمان گەیشتوون، خێرا لەبەریان دەکەین، چونکە لەگەڵ خواستو ئازارو ئەندێشەکانماندا دەگونجێن، بەڵام کاتیٚ هەڵدەستین بەو کارە، ناتوانین بەو خێراییەی کەبیروبۆچوونمان دەگۆڕین، نەریتە کۆمەڵایەتییەکانیشمان بگۆڕین، کە لەسەریان راهاتووین.

دەبیٚ ئەوە لەیاد نەکەین، کەشارستانی، بەر لەوەی بریتی بێت، لەبیرو کۆمەڵیٚ شتی ئەزبەر کراو، بریتییە لەچەندین نەریتو سیستمی کۆمەڵایەتی. تاك لەولآتە پێشکەوتووەکاندا، لەرووی شارستانییەوە،

لەژینگەکەیدا، لەسەر ئەو نەریتانە پەروەردە دەبێت، کەلەگەڵ ئەو شارستانییەدا دەگونجێت کەتیایدا دەژی، بۆیە کاتێ گەورە دەبێت، جیاوازییەکی ئەوتۆ نابینێت، لەنێوان ژیانی منداڵی‌و ژیانی گەورەبوونیدا. بەڵام تاکی ئێمە، لەژینگەیەکی ئەوتۆدا پەروەردە دەبێت، پڕە لەبەهاکانی دەمارگیری‌و شکاندنەوەو تۆڵەو زاڵبوون، تەنانەت ئەگەر گەورەبوو، فێری بیری دژبەیەکدیی ئەو بەهایانە دەبێت،و بەوەیش ناچار دەبێت، جارێ لەگەڵ ئەم‌و جارێ لەگەڵ ئەودا بێت. واتە لەدوو جیهانی جیاوازدا دەژی: جیهانی رەوشتە بەرزەکان، کە لەنووسین‌و وتارەکانیدا لافیان لێدەدات،و جیهانی واقیع کەبەشانازی‌و خۆبەزلزانین‌و تەشەر لێدانەوە تیایدا دەژی.

نەریتەکان بەپێی سروشتی خۆیان، حەز لەنەگۆڕی‌و پابەندبوون بەرابردووەوە دەکەن،و ئەگەر گۆڕانیشیان بەسەردا هات، گەلێ لەسەرخۆدەبێت. بەڵام بیرەکان، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەپرەنسیپە سیاسییە نوێکانەوە هەیە، رەنگە بتوانن لەماوەیەکی کورتدا، لەهزری خەڵکیدا گۆڕانیان بەسەردا بێت، تەنیا بەخوێندنەوەی وتارێکی هەست بزوێن، دەتوانی دڵیان رابتەکێنیت،و بکەونە ژێر کاریگەرییەوە،و هەموو بیرۆکەکانی ئەزبەر بکەن،و رەنگە ئەوانیش لەلای خۆیانەوە، هەستی خەڵکی دیکەی پێ بورووژێنن.



## دووفاقیی کەسایەتی:

دووفاقیی کەسایەتی□□□ ئەوەیە مرۆڤ رەفتارێکی ئاڵۆز بگرێتەبەر، بەبێ ئەوەی هەست بەوئاڵۆزییە بکات، لەرەفتاریدا، یان دانی پیادا بنێت،و کە ئەویش بەهۆی ئەوەوە دروست دەبێت، کەمرۆڤ بکەوێتە ژێر کاریگەریی دوو سیستمی ناکۆك بەیەکدییەوە، لەبەها یان بیرۆکەکاندا، هەرجارەو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی یەکێك لەو دوو سیستمەوە. لەراستیدا دووفاقی، بەم مانایە لەسەردەمی عوسمانیدا، لەئارادا بوو، بەڵام سنووردار بوو،و تەنیا هەندێ لەدانیشتوانی شارەکان‌و کەمێك لەگوندنشینەکانی دەگرتەوە.

دەتوانم بڵێم کەدووفاقیی کەسایەتی، لەنێوان ئەوانەدا بڵاو بووبووەوە، کەلەژینگەیەکی وشکی ئایینییدا پەروەردە دەبوون، کەهەمووی ئامۆژگاری بوو،و بەرواڵەت دەکەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو ئامۆژگارییانەوە،و بەهەمان شێوەیش ئامۆژگاریی کەسانی دیکەیان دەکرد،و بەوشێوەیەی لەواعیزەکان دەیانبیست، بەڵام لەژیانی رۆژانەدا بەپێی ئەو بەها خۆماڵییانە هەنگاویان دەنا، کەرێك بەپێچەوانەی رێنماییە ئایینییەکانەوە بوون،و ئەو کارانەیان ئەنجام دەدا، بەبێ ئەوەی هەست

□□□ جیاوازییەکی گەورە ، لەنێوان مانای دەروونی‌و مانای کۆمەڵایەتیی لەبابەتی دووفاقیی کەسایەتییداهەیە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان مانا کۆمەڵایەتییەکەیەتی، بۆیە داوا لەخوێنەر دەکەین، ئاگاداری ئەوە بێت. بڕوانە بەشی یانزە، لەکتێبی(دراسة في طبيعة المجتمع العراقي)ی نووسەر–بەغدا 1965.

بەبوونی ئەو دوو فاقییە بکەن لەژیانیاندا. کاتیَ دەکەونە ژێر کاریگەریی ئامۆژگارییەکانەوە، وەکو خواناسێك دەردەکەون کەلەخودا دەترسن و بڕوایان بەوە هەیە کەئەم دونیایە کاتییەو ئەو دونیا هەمیشەییە، بەڵام هەر ئەوەندە چاوی بەشەڕەگەڕەکێك بکەویَت یان بکەوێتە چەنە چەنەوە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا، لەپڕ هەڵدەگەڕێتەوە، و دەبێت بە(شێر عەباس) یان(حەسەن کبریت)، ئەوسا شانازیی بەزاڵبوون و دەستدرێژی و تالاَن و گزیوەوە دەکات، و بەچاوی قێزەونەوە سەیری ئەو کەسە دەکات کەدەستدرێژی دەکرێتە سەری، بەوەی ترسنۆك و بیَ فەڕە.

ئەم جۆرە دووفاقییە، ئێستا لەنێوان هەموو توێژەکانی دانیشتوان، بەتایبەتی لەنێوان خوێندەواراندا بڵاوبۆتەوە، و ڕەنگە ڕاست بێت، ئەگەر بڵێین هەر خوێندەوار، یان کۆلکە خوێندەوارێك، کەم تازۆر ئەو دووفاقییەی تیادایە. هەموو ئەو بیرۆکە نوێیانەی ئەزبەر کردووە، و خولیایانە، و لەوتارو بابەتەکانیدا دووبارەیان دەکاتەوە، و ئەگەر لەکۆڕێکی گشتیدا دانیشت، دەبینین بەتوندی ڕەخنە لەهەموو ئەو کەسانە دەگرێت، کەدژی ئەو پرەنسیپانەن، چ فەرمانڕەوا یان خەڵکی ڕەشۆك بن، کەچی خۆیشی ڕۆژانە، بەبیَ ئەوەی هەستی پیَ بکات، بەپێچەوانەیانەوە ڕەفتار دەکات.

ئەوەی گویَ لەوتارو بابەتەکانمان بگرێت، وادەزانێت لەڕووی پەیوەندییە کۆمەلاَیەتییەکانمانەوە، گەیشتووینەتە نەتەوە پێشکەوتووەکان، بەلاَم ئەم پێشکەوتنە تەنیا لەسنووری قسەکردندایە، چونکە ئەگەر بەناخی کۆمەڵگەدا بچیتە خوارەوە، دەبینیت، تەنیا کەمیَ نەبێت، هیچ لەنەریتەکانی نەگۆڕاوە.



## دووفاقیو دیاردەی واسیتە :

ڕوونترین نموونە بۆدووفاقیی کەسایەتی، لەم قۆناغەدا دیاردەی واسیتەیە، ئێمە هەموومان لەنووسینەکانمان و وتارەکانماندا دژی واسیتەین، بەلاَم هەموومان لەژیانی ڕۆژانەماندا، بەپێی بارودۆخەکە، یان دەبین بەواسیتە، یان واسیتە دەکەین.

ئێمە ڕێز لەواسیتە خاوەن دەسەلاَتەکان دەگرین، و ستایشیان دەکەین، کاتیَ واسیتەمان بۆدەکەن، یان لەسەر ڕاسپاردەی ئێمە دەبن بەواسیتە، بەلاَم کاتیَ دەبینین دەبن بەواسیتە بۆکەسانی دیکە، دەکەوینە سەرزەنشت کردنیان، و لاف نایەکسانی و جیاوازیی لەنێوان هاوولاَتییاندا لێدەدەین. واتە ئێمە جاریَ داوای واسیتە دەکەین، و جاریَ داوای یەکسانی دەکەین، لەکاتێکدا هەردووکیان دوو پرەنسیپی دژ بەیەکدین.

ڕۆژێکیان لەچایخانەیەك لەیەکێك لەگەڕەکە کۆنەکانی بەغدادا دانیشتبووم، و گوێم بۆقسەی خەڵکەکە هەڵخستبوو، بینیم تاقمێك بەتینەوە باسی کارمەندێکی گەورەی خەڵکی گەڕەکەکەیان دەکەن، ستایشیان دەکردو بەپیاوو شێرو خانەدان ناویان دەبرد، چونکە یارمەتیی تاقمەکەیانی دەدا، بۆدەستەبەرکردنی پێداویستییەکانیان، گوایا هەر ئەوەندە کوڕی گەڕەك دەرکەوتایە، یەکسەرە ئیشەکەی بۆرادەپەڕاند، و

لەپێناوی ئەودا، کاروباری خەڵکی رادەگرت، وتەنانەت ئامادە بووە، فەرمانگەکەی خۆی بەجێ بهێڵێت، و دوای کارەکەی بکەوێت، لەفەرمانگەیەکی دیکەدا. دواتر کەوتنە بەراورد لەنێوان ئەو کارمەندە پیاوەو کارمەندێکی دیکە، کەئەویش کوڕی گەڕەك بوو، بەسەروگوێلاکیدا هاتنە خوارەوە، کەپیاوێکی ترسنۆکەو جیاوازیی ناکات لەنێوان کوڕانی گەڕەك و خەڵکی دیکەدا، و هیچ پیاوەتی تیادا نییە، و ئەگەر کەسێکیان بچن بۆلای و داوای یارمەتی لێبکەن، هەزار راووڕێوی دەهێنێتەوە، بۆئەوەی کارەکە رانەپەڕێنێت.

ئەوانە تەنیا باسی ئەو بەهایانەی گەڕەکەکەیان دەکرد کەلەسەری پەروەردە بووبوون، لەژینگە کۆنەکەیاندا، و هێشتا بڕوایان بەدەمارگیری و غیرەتوپیاوەتی و جوامێری و نان ونمەك و دراوسێیەتی و ئەم شتانە هەبوو. بەڵام پرەنسیپی یەکسانیی لەنێوان هاوولاتییاندا ئەوە شتێکی نوێ بوو بۆئەوان، و تەنیا کاتێ لاف لێدەدەن، کەپێویستییان پێی هەبێت. ئەگەر مامەڵەیەکیان بکەوتایەتە فەرمانگەیەکەوە، و بییانبینییایە کەسێکی دیکە زووتر مامەڵەکەیان بۆرادەپەڕاند، بەهۆی واسیتەیەکی دەسەڵاتدارەوە، ئەوا هاواری لێهەڵدەستا، و دژی ئەو ستەمە، و دژی ستەمکاران دەوەستانەوە.

رەنگە ئەم دووفاقییە، لەو کەسانەدا گەورەتر بێت، کە لەبواری سیاسەتدا کاردەکەن، و لاف ئەوە لێدەدەن کەسەرکردایەتیی جەماوەر دەکەن، وتاربێژی دەکەن و لاف پرەنسیپەکانی دادپەروەری و یەکسانی و



دیموکراسی لێدەدەن، کەجیاوازیی لەنێوان هاوولاتییاندا ناکات، و داوای ئەوە دەکەن هەرکەسە مافی خۆی وەربگرێت، بەڵام هەر ئەوەندەی دەستیان بەدەستەڵات گەیشت، ئیتر هەموو ئەو لاف لێدانەی خۆیان فەرامۆش دەکەن، و دەکەونە واسیتەکردن و دەبن بەواسیتە، وەکو ئەوانی دیکە. ئەوانیش هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەوانەدا نییە، کەلەچایخانەکەدا بوون.

ئەوەی لەم بارەوە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە، خەڵکی هەموویان لەیەك ئاستی دووفاقیدا نین، هەندێکیان تابلێی دووفاقن و هەندێکیان کەمتر، واتە پلەکانیان جیاوازە. ئەوەی لەژیانی کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەکی گشتی تێبینی دەکرێت، ئەوەیە کەتا دیاردەی رەخنەگرتن لەکەسێکدا زۆرتر بێت، ئەوە رادەی دووفاقی لەو کەسەدا زۆرترە. لەکۆمەڵگەکەماندا، نموونەی لەو جۆرە کەسانەمان زۆرە، کەرەخنە لەهەموو شتێك دەگرن، رەخنە لەهەموو کەسێك، و لەهەر کارێکی حکومەت یان دامودەزگایەکی دیکە دەگرن. دەیانەوێت خەڵکی وەکو فریشتە وابن، و هەڵە نەکەن، و دونیا وەکو بەهەشت وابێت، لەکاتێکدا، لەرەفتاری واقیعییاندا، جیاوازییان لەگەڵ خەڵکیدا نییە، و رەنگە زیاتر لەکەسانی دیکە، لەبەها بەرزەکان لابدەن، کە لەرەخنەکانیاندا لاف لێدەدەن.

## هەڵەیەكی باو:

هەڵەیەكی باو هەیە، كەهێشتا هەندێ لەهزرمەندانمان بڕوایان بەراستیی ئەو شتە هەیە، كەئێمە دەتوانین، لەخۆماندا لایەنە باشەكانی شارستانیی نوێ كۆبكەینەوە، لەگەڵ لایەنە باشەكانی ئەو كلتوورە كۆمەڵایەتییەی لەسەری پەروەردە بووین، واتە ئێمە دەتوانین ببین بەپێشكەوتووترینی نەتەوەكان، لەبواری زانستو پیشەسازیو دادودەزگا حكومییەكاندا، لەگەڵ پاراستنی پەیوەندیی خزمایەتیو دراوسێیەتیو پیاوەتیو جوامێریو نانونمەكو هەموو ئەو بەها خۆماڵییانەدا، كە لەباووباپیرانمانەوە بۆمان ماونەتەوە. سەرچاوەی هەڵە لای ئەوان ئەوەیە، كەهەست بەسروشتی ناكۆكیی نێوان شارستانیی نوێو بەها خۆماڵییە كۆنەكانمان ناكەن، ئەو بەهایانە لەكۆمەڵگەیەكی سارانشینیدا پەیدا بوون، و بۆئەو گونجاوە، لەكاتێكدا ئەگەر ئەو بەهایانە بەسەر كۆمەڵگەیەكی نوێدا زاڵ ببێت، ئەوا وێرانی دەكات.

دەكرێ شارستانی نوێ بەماشیچنێكی ئاڵۆز بشوبهێنین كەلەچەند بەشێكی ورد پێكهاتبێت، كەهەر بەشێكی دەبێ لەشوێنی گونجاوی خۆیدا بێت، و هەر پەككەوتنێك لەهەر بەشێكیدا، لەكار دەكەوێت. شارستانی، بەواتایەكی دیكە، لەسەر بنەمای پسپۆڕیو دابەشكردنی كارو لەسەر بنەمای دانانی كەسی شیاو لەشوێنی شیاودایە.

بەها ناوخۆییە كۆنەكانمان ئەوە بەسەر هەموو پیاوێكی خاوەن دەسەڵاتدا دەسەپێنن، كە بەهانای هەركەسێكەوە بچن، كەداوای یارمەتییان لێدەكات، و ئەوەی لێ چاوەڕوان دەكرێت، كە لەدامودەزگا



حكومییەكانو دامەزراوە گشتیو تایبەتەكاندا واسیتەی بۆبكات، خۆ ئەگەر لەوەدا سەركەوتوو بوو، ئەوا خەڵكی ستایشی دەكەن، یان ئەو كەسە لەبەردەم خەڵكیدا، شانازیی پێوە دەكات، بەڵام نازانێت كەبەو كارەی، وەكو ئەوە وایە بەشەكانی ماشێنەكە لەشوێنی گونجاوی خۆیدا دانەنێت، یان ئەوەی بەشێك لەشوێنی بەشێكی دیكەدا دابنێت. بەمەیش ماشێنی شارستانی، لەوڵاتەكەیدا پەكدەخات، و وادەزانێت كارێكی باشی ئەنجام داوە.

ئێمە لەژێر كاریگەریی بەها خۆماڵییە كۆنەكانماندا، ناتوانین بەچاوێكی دوور لە بەهای دەمارگیریو خزمایەتیو دراوسێتیو هاوڕێیەتیو چاكەو ئەم جۆرە شتانەوە، سەیری كەسێكی دیكە بكەین، واتە ئێمە لەپەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانماندا، ناتوانین پرەنسیپی (تاك) رەچاو بكەین، كەگرنگترین بنچینەی شارستانیی نوێیە. تاك لەبۆچوونی ئێمەدا، وەكو ئەوە نییە كەلەخودی خۆیدا هەیە، بەوباشەو خراپانەوە كەهەڵگریەتی، بەڵكو ئەوە پەیوەندییە كەسیو خێزانیو خێڵەكییەكانیەتی كەحیسابی بۆدەكرێت.

بۆئێمە، (تاك) پرەنسیپێكی نوێو لەناكاوە، و ئەوەیش لەجنێوە گشتییەكان لەنێوان خەڵكی لەعیراقدا دەردەكەوێت، ئەوان تەنیا جنێو بەكەسەكە نادەن، بەڵكو دەبێ بەبنجو بناوانیدا بچنە خوارەوە، بەدایكو باوك، و براو خوشك، و هەموو ئەندامانی خێزانو خێڵەكەیدا بچنە خوارەوە. پێویست بەوە ناكات، بڵێین كەجنێوە گشتییەكان، روونترین بەڵگەن، بۆ ئەو بەهاو چەمكانەی لەكۆمەڵگەی ئێمەدا زاڵن.

## مۆراڵ و نیارە سێکسییەکان:

لایەنێکی دیکەی ئەم بابەتە، کەشایستەی ئەوەیە باسی لێوە بکەین، لەم بۆنەیەدا، لایەنی بایەخدانی زۆرە بەنیارە سێکسییەکان، ئێمە لەونەتەوانەین زیاتر بایەخ بەم نیارانە دەدەین، و دەتوانین بەجنێوە گشتییە باوەکان لەناوماندا، گوزارشتی لێبکەین، خەڵکی کەمترجنێو دەدەن، ئەگەر بێتو ئەو نیارانە کاریگەرییان لەشەڕەجنێوەکاندا نەبێت، و ئەوان جنێو بەکەسێك نادەن، ئەگەر هاتو لەپەیوەندییە سێکسییەکانیدا(بکەر) بێت، چونکە ئەوە لەبۆچوونی ئەواندا، نیشانەی سەرکەوتن و پیاوەتییە، بەڵام شوورەیی ئەوەیە کەکەسێك لەئەندامانی خێزانەکەی(بدەر، یان کارلێکراو) بێت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت، لەئێمەدا ئەوەیە کاتێ باسی مۆراڵی باوی وڵاتە پێشکەوتووەکان دەکەن–بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە نیارە سێکسییەکانەوە هەبێت– بێزاریی خۆیان دەردەبڕن، و دەکەونە ستایشی مۆراڵە کۆنەکانمان، بەبەراورد لەگەڵ مۆراڵی ئەواندا. بازرگانێکی بەغدا بۆی گێڕامەوە، کە لەیەکێك لەگەشتە بازرگانییەکانیدا، سەردانی پاریسی کردبوو، گوتی جارێکیان سواری میترۆ بوو، تیایدا دیمەنێکی کۆمەڵایەتی بینیبوو، تووڕەی کردبوو، کوڕو کچێکی بینیبوو باوەشیان بەیەکدیدا کردبوو، و یەکدییان ماچ کردبوو، ئەمیش پیایاندا ئەبڵەق بووبوو، و لەوە سەری سووڕ مابوو، کەنەفەرەکانی ناو میترۆکە بەقێزەونی سەیری ئەویان



کردبوو، لەجیاتی ئەوەی بەچاوێکی قێزەونەوە، سەیری ئەو دوو عاشقە بکەن کەدەستیان لەملی یەکدی کردبوو. ئەم پیاوە تائیستا، لەسۆنگەی بەها خۆماڵییە کۆنەکانەوە، کە لەبەغدادا لەسەری گۆش کراوە، تەماشای نیارەکان دەکات، ئەو پێیوایە ماچ ماچێنەی نێوان نێرو مێ، لەبەرچاوی خەڵکی، پیسترین رەفتاری مۆراڵییە، و ئەو لەسەر ئەوە راهاتووە، وەکو چاودێر ئاگاداری ئەوە بێت، هەرکەسێ هەستا بەو کارە، ئەم بکەوێتە سەرزەنشت کردنیان، یان لێدانیان، و رەنگە خەڵکی گەڕەکیش بۆیارمەتیدانی کۆببنەوە، یان هەموویان لەسەر ئەوە رێکبکەون، وەکو کەسێکی خراپ، گەڕەك بەدەری بکەن.

شارستانیی نوێ لەسەر بنچینەیەکی دیکەی مۆراڵی بونیات نراوە، بەلای خەڵکییەوە گرنگ نییە، تۆچی دەکەیت، مادامێك کاریگەریی لەسەر کەسێکی دیکە نەبێت یان بەدەستدرێژی لەسەر ئەوان هەژمار نەکرێت. مۆراڵی شارستانی چەق لەسەر ئازادیی تاك دەبەستێت، ئەویش ئەوەیە کەتاك ئازادە لەوەی ئەنجامی دەدات، بەمەرجێ کار نەکاتە سەر ئازادیی ئەوانی دیکە. بۆیە بینیمان نەفەرەکانی ناو میترۆکەی پاریس، بایەخ بەوە نادەن کەکوڕو کچێك یەکدی ماچ دەکەن، چونکە بەو کارەیان، زیانیان بەکەس نەگەیاند، بەڵام ئەوان لەوە پەست بوون، کەکاکی بەغداییان بینی پیایاندا ئەبڵەق بووە، کە ئەمە بەدەستێوەردان لەئازادیی ئەوانی دیکەدا دەزانن.

## پاشكۆی سێیەم

## شیعرو شارستانی

ئاكامی ئەو نسكۆیەی لەحوزەیرانی ساڵی 1967دا بەسەرماندا هات، ئەوەبوو هەرتاقمە لەئێمە دەیویست هۆكارێك بۆئەو نسكۆیە بدۆزێتەوە، بۆئەوەی بیكات بەخەتای ئەوو بۆخۆی بحەوێتەوە، تاگەیشتە ئەوەی هەندێكمان گۆرانییەكانی ئوم كلسووم بكات بەیەكێك لەهۆكارەكانی نسكۆكە. بەڵام لەم بارەوە شتێكیان فەرامۆش كرد، ئەویش ئەوەبوو، كەئێمە خولیای شیعرین، ئیتر نازانم بۆچی ئەوەیان فەرامۆش كرد، لەكاتێكدا ئەوە زیاتر لەگۆرانییەكانی ئوم كلسووم، شایانی ئەوەیە هۆكارێكی نسكۆكەمان بووبێت.

لەراستیدا، ئێمە زیاتر لەهەر نەتەوەیكی دیكە خولیای شیعرین،و من پێموایە ئەمە یەكێكە لەكەموكوڕییە كۆمەڵایەتییەكانمان، یان یەكێكە لەناكۆكییە كۆمەڵایەتییەكانی ئێمە. ئێمە، لەگەڵ ئەوەی دەمانەوێ هاوڕەوتی شارستانیی نوێ ببین، لەهەمان كاتدا جەخت لەسەر پاراستنی كلتووره شیعرییەكەمان دەكەین، كەلایەنی دژ بەچەمك‌و خواستەكانی شارستانییە.

خولیابوونی لەرادە بەدەرمان بەشیعرەوە، كلتوورێكی خێڵەكایەتییە تیاماندا، هەر لەسەردەمی جاهیلییەوە تیاماندا سەریهەڵداوە، كاتێ كەخێڵ



بۆلێهاتوویی شاعیرێكی هێندەی لێهاتوویی سوارێكی ئازا ئاهەنگی دەگێڕا، شاعیر بەزمانی داكۆكیی لەخێڵەكەی دەكرد، هەروەكو چۆن سوار بەشمشێرەكەی. ژیانی سارانشینی لەسەر بنەمای شەڕی بەردەوام بوو، یەكێك لەتایبەتمەندییەكانی ئەوەبوو، پشتی بەشانازی‌و شیعرو خولیابوون دەبەست، ئەو سێ ئامرازە لەپێناوی ئامانجێدا بوون، ئەویش بەهێزكردنی خێڵ بوو، لەرووی مەعنەوییەوە، لەبەرامبەر دوژمنەكانی. خێڵی سارانشین بەبەردەوامی یان داگیركەر یان داگیركراو بووە، كەواتە نیازی تەواوی بەوە هەبووە، پشت بەستنی تاكەكانی بەخۆیان بەهێز بكات،و هانیان بدات، لەپێناویدا بەرەو مەرگ بڕۆن.

عەمری كوڕی كەلسووم، یەكێك لەشاعیرە بەناوبانگەكانی سەردەمی جاهیلی، لەهۆنراوەیەكیدا كەشانازیی بەخێڵەكەیەوە دەكات، دەڵێت:

ملأنا البر حتى ضاق عنا      وماء البحر نملأه سفينا
اذا بلغ الفطام لنا صبي      تخر له الجبابر ساجدينا

خوێنەر تێبینیی ئەوە دەكات كەشانازیكردن تیایدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی، رەنگە ئەوەی ئەوسا گوتراوە، لەم سەردەمەدا رێگە پێنەدراوو بەشێتیی هەژمار بكرێت، بەڵام لەسەردەمی جاهیلیدا، رێگەپێدراوو شتێكی باش بووە،و رەنگە لەرووی دەروونی‌و كۆمەڵایەتییەوە، لەژیانی خێڵەكایەتیدا كاریگەریی خۆی هەبووبێت، چونكە شانازییكردنی پیاو بەخۆی‌و بەخێڵەكەی‌و رۆحی دەمارگیریی تیادا بەهێز دەكات، كەیەكێكە لەمەرجەكانی مانەوە لەبیاباندا.

## شاعیره دەربارەکان:

کاتێ عەرەب بەرەو شارستانی چوون، فاکتەرێکی نوێ بۆبرەودان بەشیعرو هاندانی سەریهەڵدا، ئەویش خەڵاتی فریودەری سوڵتانەکان بوو، بۆئەو شاعیرانەی بەهۆنراوەکانیان، ستایشیان دەکردن. بەمەیش شاعیر بوو بەزمانی خێڵ، بەوەی لەدەرباردا ستایشی سوڵتانەکانی دەکرد.

تێبینی ئەوە دەکرێت، زۆربەی شاعیران کەلەم بوارەدا ناوبانگیان دەرکرد، لەبنەماڵەیەکی هەژارەوە سەریانهەڵدەدا، هەر یەکێکیان لەسەردەمێکی نەبوونیو هەژارییەوە دەستییان پێدەکرد، و هێدی هێدی بەهۆی شیعرەکانیانەوە، پێگەیان بەرز دەبووەوە، ئەگەر بەخت یاوەریان بوایە، و سوڵتانەکان دەرووی خێریان لێبکردایەتەوە،، ئەوا پێگەیەکی بەرزی بەدەست دەهێنا، و پەنجەیان بۆرادەکێشا، و بەشداریی کۆڕو دانیشتنەکانی میرو گەورەپیاوانی دەکرد، و کەنیزو خولامی زۆر دەبوون. وەها شاعیرگەلێ، لەبەرچاوی زۆربەی ئەو لاوانەی وەکو ئەوان پەروەردە بووبوون، دەبوون بەنموونەو پێشەنگ، و گەلێ جار ئەمە وایلێدەکردن، روو لەشیعر بکەن، بۆئەوەی وەکو ئەو شاعیرە بەناوبانگانە، ناو دەربکەن. ئەمە لەزۆر رووەوە، وەکو ئەوە وایە کەئێستا لەوڵاتە پێشکەوتووەکاندا روودەدات، کەزۆربەی کوڕە هەژارەکان خۆیان سەرقاڵی زانست کردووە، تاوەکو لەو رێگەیەوە، بەئارەزووو خواستی خۆیان بگەن، تەنیا بەو جیاوازییەی ئەمان لەرێگەی زانست، و ئەوان لەرێگەی شیعرەوە، دەیانویست بەو پێگەیە بگەن. مرۆڤ بەگشتی دەخوازێت، بەهەر هۆیەکەوە بێت بەرز ببێتەوە، کەبارودۆخی کۆمەڵایەتیی دەوروبەری بۆی برەخسێنێت، ئیتر بەلایەوە گرنگ نییە، لەرێگەی شیعر، یان زانست یان



هەر رێگەیەکەوە بێت، باش یان خراپ، مادامێك بەئامانجی خوازراوی دەگەیەنێت. راستە کەگوتویانە:(ئەگەر ویستت بزانیت سروشتی کۆمەڵگەکەت چۆنە، تەماشای ئەو کەسانە بکە، کەتیایدا پێگەی بەرزیان بەدەستهێناوە).

## پێگەی شاعیران:

سروشتی مرۆڤ وەهایە، کاتێ لەسەر شتێك ململانێ دەکەن، دەبێ بەپێی جیاوازیی لێهاتوویی و بارودۆخی دەروونیو کۆمەڵایەتییان، جیاوازییان هەبێت تیایدا، شاعیرانیش لەقۆناغی شارستانیی عەرەبیدا وەهابوون، کەمیان پلەی بەرزی سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا، و ئەوانی دیکە کەهەوڵیان دەداو شکستیان دەهێنا، دەبینین لەو کەسانە نزیك دەبوونەوە، پایەیان لەسوڵتانەکان نزمتر بوو، لەرووی خەڵات بەخشینەوە وەکو میرو وەزیرەکان، یان دەوڵەمەندو بازرگانەکان، تەنانەت تاوایلێهات، هەندێ لەشاعیران چاوەڕوانی بۆنە خۆشو ناخۆشەکانیان دەکرد، لای چینە مامناوەندییەکان، وەکو بۆنەی ماتەمینی، یان گەڕانەوە لەحەج، یان خەتەنەکردن، یان شایی، و ئەوسا هۆنراوەیان دەخوێندەوە، بەپێی پێویست، لەپێناوی ئەوەی هەندێ پارەیان دەست بکەوێت. هەندێکیان بەر لەبۆنەکان هۆنراوەیان ئامادە دەکرد، و دواتر لەکاتی خۆیدا، ناوی گونجاویان تێدەخست. ئەوانە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ شاعیرە دەربارەکاندا نەبوو، تەنیا لەرووی پلەوە نەبێت، چونکە هەرهەموویان ستایشکەر بوونو لەرێگەی شیعرەکانیانەوە، وەکو سواڵکەر چۆن دوعای تەمەن درێژیی بۆخەڵك دەکات، ئاوا پارەیان کۆدەکردەوە.

## شیعرو بابه تمەندی:

لەو پرەنسیپانەی شیعری عەرەبی لەسەر رۆیشتووە، هەر لەسەرەتاوە، ئەوەبوو کەگوێی بەراستیی لەوێناکردنی نیارەکاندا نەدەدا،و لێرەوەیە کە بەم جۆرە وەسف دەکرێت:(تازیاتر درۆبێت، شیرینترە). قورئانیش شاعیرانی بەم جۆرە وەسف کردووە(فى كل واد يهيمون)و (انهم يقولون ما لايفعلون).

لەراستیدا، ئەمە جێگەی سەرسوورمان نییە، ئەگەر بێتو ئەرکی شیعر رەچاو بکەین لەو ژیانە کۆمەڵایەتییەدا، کەتیایدا پەیدا بووە. شاعیر لەژیانیی جاهیلیدا—هەروەکو بینیمان—بەرگریی لەخێڵەکەی خۆی دەکرد، لەبەرامبەر بەدوژمنەکانیدا، واتە هێندەی لەبیری سەرکەوتنی خێڵەکەیدا بوو، ئەوەندە لەبیری راستییەکاندا نەبوو، خێڵەکەی هەردەم لەسەر حەق بووە،و لەرووی بنەچەو پێگەوە بەهێزترو بەرزتر بووە، ونەدەبوا هیچ خێڵێکی دیکە لەسەر گۆی زەوی بەپایەی خێڵەکەی ئەو بگات. واتە شاعیر دەبوا لەسەر ئەو پرەنسیپە خێڵەکایەتییە بڕۆیشتایە، کەدەڵێت:(انصر أخاك ظالما أو مظلوما)، واتە یارمەتی براکەت بدە، چ لەسەر حەق بێت، یان نەبێت.



کاتێ شاعیری عەرەب پێی نایە قۆناغی شارستانییەوەو دەستی کرد بەستایشی سوڵتانەکان—یان ئەوانەی پلەیان خوارتر بوو، واتە میرو دەوڵەمەندەکان—خۆی ناچار بینی کە بەپێی بارودۆخ، ستایش یان سەرزەنشت بکات، یان بەپێی زۆریو کەمیی خەڵاتەکانەوە، ئیتر بەلایەوە گرنگ نەبوو، کەئەگەر خەڵاتەکە چەور بوایە، بەدادپەروەرترین سوڵتان لەقەڵەمی بدایە،و لەهەموویان ستەمکارتر هەژماری بکردایە، ئەگەر هاتو خەڵاتەکەی کەمتر لەوە بوایە کەچاوەڕوانی دەکرد. ئەمیری شاعیرانی کۆن—واتە موتەنەبی—و ئەمیری شاعیرانی نوێ—واتە ئەحمەد شەوقی—مان بینی، بێ شەرمانە، ئەم کارەیان ئەنجام دەدا.

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، کەئەم گوێ بەهیچ نەدانە، لەرووی راستیی لەوێناکردنی نیارەکان، بەلای شاعیرانەوە، هەر لەسەرەتای مەشقکردنیان لەبواری شیعردا دەست پێدەکات، واتە لەسەری رادێنو هەر لەسەرەتاوە کاری پێدەکەن، تائەوەی گەورە دەبن، ئەوسا دەبێت بەخوویەك، کەبەلایانەوە ئاسایی دەبێتو شەرمی لێناکەن.

دکتۆر عەبدورەزاق محێدین، لەمشتومڕێکی لەگەڵ بەندەدا، بەر لەچەند ساڵێك، گوتی[*]: سەرەتا کەشاعیر خۆی لەسەر شیعر رادەهێنێت، بابەتە کۆنباوەکانی شیعر رەچاو دەکات، کەشاعیرە کۆنەکان لەسەری رۆیشتوون، شیعری دڵداری دەڵێت بەبێ ئەوەی عاشق بێت،و بەبێ ئەوەی

[*] خوێنەر دەتوانێت درێژەی ئەم مشتومڕە، لەکتێبی(اسطورة الأدب الرفيع—بەغدا 1957)ی بەندەدا بخوێنێتەوە.

ئازایەتیی تیادا بێت، خۆی گیڤ دەکاتەوە، و لەتەمەنی پیریدا خۆی گەنج دەکاتەوە، بۆ گوند دەگری، کەچی خۆی شارنشینە، باسی مەی دەکات، بەبێ ئەوەی بینۆشێت، و باسی بەرەڵایی دەکات، لەکاتێکدا خۆی پیاوێکی گەلێ قورسە...

شاعیر، لەپێناوی خۆراهێناندا هەڵدەستێت بەم کارانە، دیارە راهێنان لەتاقی لاویدا، کاریگەریی لەسەر گەڵاڵەبوونی هزر هەیە لەگەورەییدا. بۆیە شاعیرە بەناوبانگەکان، ئەگەر ستایشی کەسێکیان بکردایە، یان سەرزەنشتیان بکردایە، ئیتر بەلایانەوە گرنگ نەبوو، چەندە راست دەکەن. ئەوەی شایانی ئاماژە بۆکردنە، ئەوەیە کە کاتێ خەڵکی گوێیان لەهۆنراوەی شاعیرێك دەبێت، ئەوانیش بەلایانە گرنگ نییە، شاعیر تاچەندە راست یان درۆ دەکات، تەنیا لەبیری ئەوەدان هۆنراوەکە لەرووی وشەو کێشو سەرواوە جوان بێت، واتە گۆرانی بۆلایەنە هونەرییەتییەکەی دەڵێن، و ئەوەیان بەلاوە گرنگ نییە، راستە یان درۆیە.



## راپەڕینی سەدەی رابردوو:

عیراق لەسەدەی نۆزدەیەمدا، راپەڕینێکی گەورەی لەبواری شیعردا بەخۆوە بینی، شاعیری ستایشکەری زۆر لەبەغداو نەجەفو حیللەو کەربەلاو موسڵو بەسرەدا هەڵکەوتن. ئەوەی توێژینەوە لەسەر هۆکارەکانی ئەو راپەڕینە بکات، دەبینێت لەرووی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتییەوە، جیاوازیی نییە لەگەڵ هۆکارەکانی راپەڕین لەسەردەمی کۆندا، کەبە(سەردەمی زێڕین) ناو دەبرا.

دەتوانین بڵێین داود پاشا دەستی هەبوو، لەبرەودان بەشیعر، هەروەها سەید مەهدی بەحرولعلومیش، کەسەرکردایەتیی ئاییینیی لەنەجەفدا دەکرد، دەستی هەبوو. لەچەند شارێکی عیراقدا، چەند خێزانێکی پێگەدارو دەوڵەمەند، دەستیان کرد بەهاندانی شیعرو خەڵاتی چەوریان دەبەخشی، وەکو بنەماڵەی جەلیلی لەموسڵ، و بنەماڵەی کوببە لەبەغدا، و بنەماڵەی قەزوینی لەحیللە، و بنەماڵەی رەشتی لەکەربەلا، و بنەماڵەی باش ئەعیان لەبەسرە، و بنەماڵەی سەعدوون لەمونتەفیق، و سەرکردەکانی خەزاعیل لەفوراتی ناوەڕاست. شاعیران لەبۆنە خۆشو ناخۆشەکاندا روویان تێدەکردن، و شیعریان بۆدەخوێندنەوە. دواتر شێخ خەزعەل لەموحەممەرە پەیدا بوو، کۆشکەکەی لە فەیلییە شتێکی کەمتر نەبوو لەکۆشکی سوڵتانە کۆنەکان، کەشاعیرو وتاربێژو گۆرانی بێژان روویان تێدەکرد. لەراستیدا هەندێ لەو شاعیرانەی کەرێز لەیادەکانیان

دەگرین، لەسەردەمێك لەتەمەنیاندا ستایشکەر بوون لای شێخ خەزعەل،و شیعریان پیادا هەڵدەداو کتێبیان لەسەری دەنووسی.

ئەم راپەڕینە لەبواری شیعردا، وای لەهەر خوێندەوارێك دەکرد، ئارەزووی ئەوە بکات ببێت بەشاعیری ستایشکەر، بۆئەوەی لەلایەن پیاوەگەورەکان و ئەمیرانەوە خەڵات بکرێت. خولیابوون بەشیعرەوە، بەلای خوێندەوارانەوە، گەیشتە رادەیەك کە لەمێژوودا بێ وێنەبوو،و تائێستا کاریگەریی لەسەرمان ماوە.

چمکێك لەبابەتی شاعیرێکی خەڵکی نەجەف دەهێنمەوە، کەرۆژنامەی(الجمهوریة) لە1968/6/4دا بڵاوی کردەوە، باسی خولیابوونی لاوانی هاونەوەی خۆی بەشیعرەوە دەکات. دەڵێت:( بەر لەچل ساڵ چاومان کردەوە، کەکۆڕی ئەدەبی لەبەغداو حیللەو نەجەف و کەربەلا و لەگرنگترین مەڵبەندە ناودارەکانی عیراقدا دەبەسترا، ئاهەنگ بۆشاعیران و هۆنراوەکانیان و ئەدیبان و بابەتەکانیان دەگێڕا، بەتایبەتی لەراستای بابەتە سیاسییەکاندا، کەداوای سەربەخۆییان دەکرد، لەسایەی کردەوە کۆمەڵایەتییە باشەکان،و نوێکردنەوەو ئازادیی بیردا. لەم کۆڕ دەردەچووین، تاوەکو خۆمان بکەین بەکۆڕێکی دیکەدا،و لەسەرواو شەڕە شیعردا پێشبڕکێمان دەکردو گرەومان لەسەری دەکرد، چەندین جار خۆمان لەو خواردنە چەورانە دەدا، کەتاقمی دۆڕاو دەبوا ئامادەی بکەن، یان کاتی خۆشمان لەگەشت بۆناوچەکانی دەوروبەر بەسەر دەبرد...لەسەر گیرفانی یەکێك لەخۆمان، لەکەشوهەوایەکی خۆشدا، بەسامانێکی شیعریی گەورەوە دەگەڕاینەوە، سەبارەت بەوەسفکردنی گەشتەکەو ئەو



دەستپێشخەرییانەی کەهێندەی دیکە کۆڕودانیشتنەکانمانیان خۆشتر دەکرد، دوای گەڕانەوە، بۆماوەیەکی دوورو درێژ، کەدانیشتنێکی دیکە دروست دەبوو، ئەوی پێشترمان لەبیر دەکرد،و بەم شێوەیە. برای خوێنەر، بزانە چەندە ئەم کەشوهەوایە خۆشتر دەبوو، بەپێشبڕکێ و گرەو کردن، بۆخۆئامادە کردن بۆبردنەوە، کەهەر کەسە خۆی ئامادە دەکرد تاهەرچی لەتوانایدا هەیە، بیخاتە گەڕ، بۆئەوەی بەهاوڕێکەی بگات...).

## لەنێوان شێوەو ناوەڕۆکدا :

نکۆڵیی لەوە ناکەین، کەشاعیرانی ئەمڕۆمان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، زۆربەیان وازیان لەستایشی سوڵتانەکان هێناوەو ستایشی گەل دەکەن، بەڵام نابێ ئەوە لەیاد بکەین، گۆڕانەکەیان لەرووی شێوەوە بووە، بەڵام لەرووی ناوەڕۆکەوە، کەمتر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. ئەوان بەهەمان حاڵەتی شانازیی و بایەخ نەدان بەراستییەکان، واتە لەسەر شێوازی کۆن هەنگاو دەنێن. ئەوان لەبری ئەوەی سوڵتان بکەن بەسێبەری خودا لەسەر زەوی بەدادپەروەرترینیان دابنێن، روویان لەگەڵ کردو لەهەموو سیفەتەکانیدا ، بەپاك دایاننا، کەهیچکەموکوڕییەکی نەبێت.

دیارە شاعیرانمان کاتێ دەستیان لەستایشکردنی سوڵتانەکان هەڵگرت،و روویان لەستایشی گەل کرد، هەروەکو بڵێی گەڕانەوە بۆژیانی سارانشینیی سەرەتا، کاتێ شاعیر بەراست و بە چەوت، ستایشی خێڵەکەی خۆی دەکرد،و سەرزەنشتی دوژمنەکانی دەکرد. ئەوان

جیاوازییان لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی جاهیلیدا نییە، تەنیا لەو رووەوە نەبێت سنووری خێڵیان فراوانتر کردوە، و کردوویانە بە(گەل) یان(نیشتمان) یان(نەتەوە). واتە شێوازی دەمارگیریەکەیان گۆڕیوە، بەڵام لەناوەڕۆکدا، گۆڕانیان بەسەردا نەهێناوە، هەر بەو شێوەیەی شاعیرێکی سارانشین دەیڕوانییە خێڵەکەی، ئەمانیش بەهەمان شێوە، دەڕواننە گەل و نیشتمان و نەتەوەکەیان.

ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە–کەئێستا بەبیرکردنەوەی شیعری ناو دەبەین– تەنیا کاریگەریی لەسەر شاعیران نەبوو، بەڵکو زۆربەی هزرمەندان و نووسەران و وتاربێژانیشی گرتەوە، هەموویان لەسەر شێوازی عەمری کوڕی کەلسووم دەڕۆن، کەدەڵێت:(ماء البحر نملأه سفينا!).

، ماوەیەك لەمەوبەر، کتێبێکم خوێندەوە کە لەعیراقدا دەرچووە، لێرەدا دەقی پەراگرافێکی دەهێنمەوە:( گوتمان خۆشەویستی بۆکارکردن و جوامێری و پیاوەتی و برایەتی، سێ تایبەتمەندیین، ئەگەر لەگەل، یان لەکۆمەڵگەیەکدا هەبن، دەتوانن بگەن بەئامانجەکانیان، و ئەوە دەستەبەر بکەن، بۆخۆیان کەگەلان یان کۆمەڵگەکانی دیکە نەتوانن پێی بگەن، چونکە خێرو بێر تەنیا لەبوونی ئەم سێ تایبەتمەندییەدایە...). نموونەی زۆر لەم وتانە، لەرۆژنامەو گۆڤارو کتێبەکانماندا دەبینین، زۆرجار نووسەرانمان بابەتی وەها دەنووسن، هەروەکو بڵێی شیعری ترش و خوێ کراو، یان سروودێکی نیشتمانیمان بۆ بخوێنێننەوە.



## شەڕی نوێ:

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی شیعری ئەوەیە، کەخاوەنەکانیان ئەگەر لەشەڕدا سەربکەون، ئەوا سەرکەوتنەکەو هەموو ئازایەتی و لێهاتوویەك دەدەنە پاڵ خۆیان، بەڵام ئەگەر بشکێن، ئەوا شکستەکەیان دەدەنە پاڵ هۆکاری دەرەکیی وەکو داگیرکاران و خیانەتکاران، کەهاوکاریی داگیرکەریان کردووە. شاراوە نییە کەئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، وا لەخاوەنەکانیان دەکات، دوور بکەونەوە لەواقیعەکە، و سوود لەپەندەکانی وەرنەگرن.

بۆ ئەم بیرکردنەوەیە، بەلای هەندێ لەنووسەران و مێژوونووسانمانەوە، سەبارەت بەشۆڕشی بیست، نموونەیەکی روون هەیە، ئەویش ئەو شۆڕشە بوو، کەخێڵەکانی فوراتی ناوەڕاست توانییان، تیایدا گورزێکی گورچکبڕ لەهێزەکانی بەریتانیای داگیرکار، لەساڵی 1920دا بوەشێنن، و ئەم سەرکەوتنەیان گێڕایەوە بۆنیشتمانپەروەریی خێڵەکان و خۆڕاگرییان لەشەڕدا، بەڵام دواتر کەخێڵەکان تووشی شکست بوون، هۆکەیان دایە پاڵ ئەو کەسانەی خیانەتیان لەشۆڕش کرد، و لەپشتەوە لێیان دا.

لێرەدا نامانەوێت باسی شۆڕشی بیست بکەین، ئەوە بابەتێکە هەوڵ دەدەم لەبەشێکی داهاتووی ئەم کتێبەدا تاوتوێی بکەم، بێگومان پێموایە،

شۆڕشێکی گەورەبوو، و شایستەی ئەوەیە شانازیی پێوە بکەین، و نابێ بەهێندی وەرنەگرین، بەڵام لەهەمان کاتدا، نابێ وەکو شاعیرەکان، لەرادە بەدەر ترش و خوێی بکەین.

خێڵەکان لەم سەردەمەدا کەتیایدا دەژین، ناتوانن لەشەڕکردن لەگەڵ سوپایەکی ڕێکخراودا، سەرکەوتن بەدەست بهێنن، کەخاوەنی تۆپ و زرێپۆش و فڕۆکە بێت، و ئەگەر جارێکیش بەرێکەوت سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوا ناتوانێت جارێکی دی سەربکەوێت. ڕەنگە بەهەڵەدا نەچم، ئەگەر بڵێم ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی خێڵەکان لەشۆڕشی بیستدا بەدەستیان هێنا، بەپێی ڕێساکانی شەڕ، ڕووداوێکی ئاسایی نەبوو. چەندین فاکتەر ڕۆڵیان لەو سەرکەوتنەدا هەبوو. پێناچێت جارێکی دیکە، ئەو هەموو فاکتەرانە کۆببنەوە، تاوەکو سەرکەوتنێکی دیکەی لەو جۆرە دەستەبەر ببێت.

سروشتی شەڕ لەم سەردەمەدا، بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە پشت بەزانست و تەکنۆلۆژی دەبەستێت، زیاتر لەوەی پشت بەشانازیوغیرەت ببەستێت. پیاوێکی ئازای وەکو عەنتەرەی عەبسی، ئەو گرنگییەی نەماوە، کە لەسەردەمی شەڕە کۆنەکاندا هەیبوو، ئێستا سەربازی مەشقکردوو شوێنی گرتۆتەوە، کەباشترین چەکی بەدەستەوەیە، و کارخانەو زانایان لەپشتییەوەن، کەرۆژانە شتی نوێ دەخەنە بەردەستی. ئێستا بەرنامەی کار کە لەلایەن شارەزایانی بواری



سەربازییەوە، و بەپێی نوێترین پێشکەوتنەکان لەهونەری چەك و شەڕدا دادەڕێژرێن، شوێنی هۆسەی عەرەبی گرتۆتەوە.

جارێکیان لەشۆرشی بیستدا، وارووی دا کەپیاوێکی خێڵەکی دەستی گرت بەسەر تۆپێکدا، و تۆپچییەکە دەکوژێت، بەچەکێکی سادە، کەبریتی بوو لەگاڵۆکێك–کە لەعیراقدا پێی دەڵێن میگوار–دوای ئەوە بوو ئەو هۆسەیە ناوی دەرکرد، و بەدروشمی شۆرشەکە بوو:(الطوب أحسن لو مقواري) واتە، تۆپ باشە یان گاڵۆکەکەی من. ئەوسا کێشەکەمان ئەوەبوو، و تائێستایش ئێمە دەمانەوێت گاڵۆك لەتۆپ باشتر بزانین، و بیکەین بەرێسایەکی سەربازی، لەهەر شەڕ یان شۆڕشێکماندا پشتی پێببەستین. هێشتا شاعیران و نووسەرانمان شیعر دەهۆننەوەو بابەت دەنووسن، تاوەکو لەرێگەی وشەی بریقەدارەوە بیسەلمێنن کەگاڵۆك بەسەر تۆپدا زاڵ دەبێت، و لەبەر ئەوەی لەرابردوودا، بەگاڵۆك سەرکەوتنمان بەدەست هێناوەن، ئەوا بۆهەمیشە دەتوانین بەگاڵۆك سەرکەوتن دەستەبەر بکەین.

ڕەنگە راست بێت، کەسەرکەوتنی میسر لەساڵی1956، لەگەلێ رووەوە، لەسەرکەوتنی خێڵە عیراقییەکان دەچێت لەساڵی 1920دا، هەریەکەیان، کۆمەڵێ فاکتەر رۆڵیان هەبوون لەسەرکەوتنیاندا، کەپێناچێت هەموو جارێك ئەو فاکتەرانە دەستەبەر ببن. بەڵام ئێمە خۆمان پێ هەڵناو غیرەت گرتمانی و لەرادەبەدەر بۆغرابووین، و دونیامان لەسروود تەنی!

## کۆمەڵگەی عیراقیو عەرەبی:

کاتیێ لەساڵی 1965دا، دوا کتێبم(دراسة في طبيعة المجتمع العراقي) بڵاوکردەوە،لە پێشەکییەکەیدا، ئاماژەم بەرووداوەکانی میسرو عیراقو هەندێ لەوڵاتانی دیکەی عەرەبی کرد، لەپەیدا بوونی نووسینی زۆر لەسەر(کۆمەڵگەی عەرەبی)و هەوڵی ئەوەی ئەم بابەتە لەساڵانی یەکەم لەکۆلێژو پەیمانگەکاندا بخوێنرێت، لەم نووسینو وانانەدا تێبینیی ئەوەم کرد، کەئامۆژگاریو زیندووکرنەوەی غیرەت،و شێوازی وتاربێژی بەسەر شێوازی بابەتییانە بەسەریاندا زاڵە. بۆیە، لەلاپەڕەی 10ی کتێبەکەدا گوتوومە:

(گومانم لەوە نییە کەئەم شێوازی ئامۆژگارییە لەتاوتوێکردنی کۆمەڵگەی عەرەبیدا، گرنگو سوودبەخشە، بەتایبەتی ئەگەر هاتو ئەوەمان لەبەرچاو گرت، کەئەو نووسینانە، بەو شێوازە نووسراون، بۆئەوەبووە، بکەونە بەردەستی خوێندکارانی قۆناغی یەکەم لەساڵانی زانکۆیاندا، کەواتە دەبێ ئەو شێوازە بگرێتەبەر، کەشێوازی ئامۆژگاریو ئاراستەکارییە، بۆئەوەی خوێندکاران، لەبەردەم نیشتمانی گەورەدا هەست بەئەرکەکانیان بکەن، بەڵام من لەو بڕوایەدام کەناکرێ لەئاستی ئەم توێژینەوە ئاراستەکارییەدا بووەستین،و بەرەو توێژینەوەی دیکە، کەقووڵتر بێتو نزیکتر بێت، لەشێوازی کۆمەڵناسیی نوێوە، هەنگاو نەنێین. لەوە دەترسم ئەگەر زێدەرەویمان کرد بۆئەوەی لەگەڵ ئەو تەوژمەدا



بڕۆین، ئەوا وەکو واعیزی سوڵتانەکانمان بەسەردا بێت، کەمێشکی خەڵکی بەنموونەی تۆباویی پڕ دەکەن، لەکاتێکدا چاو لەو واقیعە کۆمەڵایەتییە دەپۆشن، کەخەڵکی تیایدا دەژین، کەوایان لێدەکات هەست بەو نموونەو بەها بەرزانە نەکەن).

جێگەی داخە، ئەو داواکارییە بۆتاوتوێکردنی بابەتییانەیە، لەکاتی خۆیدا، بەلای زۆر کەسەوە پەسەند نەکرا،و ئەوان هەروەکو جاران، بڕوایان وابوو شێوازی وتاربێژانە، لەتاوتوێکردنی بابەتییانە باشترە، لەم قۆناغە هەستیارەدا، کەتیایدا لەگەڵ داگیرکەرانو زایۆنیزمدا دەجەنگین. رۆژێکیان، یەکێك لەوانە بەراشکاوی پێی گوتم، کەتاوتوێکردنی هەر بەشێك لەنیشتمانی عەرەبی وەکو کۆمەڵگەی عیراق یان سوریا یان میسر– لەبری تاوتوێکردنی هەموو کۆمەڵگەی عەرەبی، لەبابەتێکدا– وەکو ئەوە وایە داوای ناوچەگەریی کوشندە بکەیت، کەئەمەیش لەم قۆناغەدا، زیاتر لەوەی سوودیان پێبگەیەنێت، زیانی هەیە.

بەهەر حاڵ، وادیارە نسکۆی حوزەیرانی ساڵی1967، سەرنجی هەندێ لەهزرمەندانمانی بۆئەم جۆرە بیرکردنەوە هەڵانە راکێشاوە. رەنگە لەشوێنی خۆیدا بێت، تالێرەدا وتەکەی رۆژنامەنووسی بەناوبانگی میسری، محەممەد حەسەنێن هەیکەل بهێنمەوە–لەرۆژنامەی ئەهرامی 1968/1/13– دەربارەی ئەو هەڵانەی هێزە شۆڕشگێڕە عەرەبییەکان تێی کەوتوون. کەدەڵێت:

(...هێزە شۆڕشگێڕەکان نەخشەیەکی کۆمەڵایەتیی جیهانیان، لەبەرامبەر کارەکەیاندا دانەنا، کەخۆیانی تیادا دەژینو لەناو ژینگەکەیدا

جموجوڵ دەکەن. دەبوا لێرەدا ئەوە دیاری بکرێت،و وەڵامی چەندین پرسیار بدرێتەوە: فاکتەری نەتەوایەتی، کەلە سەرچاوەی ئەوەوە هەڵدەقوڵێت کەعەرەب هەموویان یەك نەتەوەن، چەندە کاریگەر دەبێت؟و فاکتەری نیشتمانی کەئەویش لەراستییەکی دژ بەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کەئەویش ئەوەیە ئەم نەتەوەیە بەسەر چەند نیشتمانێکدا دابەش بووە، کە هەر یەکەیان سنووری خۆی هەیە، تاچەند کاریگەریی دەبێت، خاڵی هاوبەش و خاڵی ناهاوبەش لەنێوان گەلانی عەرەبدا چییە، کەهەموویان سەر بەیەك نەتەوەن؟ ئایا کۆمەڵگەی رووبار لەمیسر، کەبەر لەحەوت هەزار ساڵ شارەزای سیستمی دەوڵەت بووە، لەسیستمی بیابان دەچێت، کەهێشتا سیستمی خێڵ باو و زاڵە؟ کێشی راستەقینەی بارودۆخە دەمارگیریی و تایفەگەرییەکان چین، کەکاریگەرییان لەسەر هێزەکان هەیە، لەزۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا، بۆنموونە لوبنان، عیراق، سوریا، جەزائیر؟ لەکاتی نەبوونی وەها نەخشەیەکی زانستییانەی کەشوهەوای مرۆڤایەتی، لەجیهانی عەرەبدا،هێزە شۆڕشگێڕەکان تەنیا پشتیان بەسۆز بەستووە،و دیارە سۆزیش-کەتەنیا بێت- هەناسەی کورت دەبێت،و ناتوانێت رێگایەکی دوورو ناهەموار بڕێت).

دەمەوێ لەکۆتاییدا هەمان وشە دووبارە بکەمەوە، کە لەپێشەکیی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێکرد، ئەویش ئەوەیە کەئێمە-لەم قۆناغە قەیراناوییە لەمێژوومان‌دا-نیازێکی زۆرمان بەبالانسی نێوان غیرەت و بابەتمەندی لەخودی خۆماندا هەیە، باش نییە بەبەردەوامی غیرەت بەسەر بیرماندا زاڵ بێت، هەروەها باش نییە غیرەت لەدڵماندا نەبێت!



## پێڕست


پێشەکیی کتێبەکە........................................3

کۆمەڵزانی و مێژوو........................................5

کێشەی بابەتی........................................6

خەواندنی کۆمەڵایەتی........................................8

جوغزی نوێ........................................10

پێشەکیی بەشی یەکەم........................................12

ئێرانییەکان و مەزهەبی شیعە........................................13

گەورەبوونی ململانێی مەزهەبی........................................17

پرەنسیپی پاڕانەوە........................................20

رەوشتی خەڵکی عیراق........................................24

دوا تەوژمی خێڵەکایەتی........................................26

شارەکان و عەشیرەتەکان........................................30

دیاردەی شەڕئەنگێزی........................................33

خەڵەڤ کوڕی ئەمین........................................36

جیاوازی لەنێوان لاتەکان و........................................38

ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵگە........................................41

داستانی حەسەن کبریت........................................44

### بەشی یەکەم


پێکهاتنی دەوڵەتی عوسمانی........................................ 47
پێکهێنانی سوپای ئینکشاری........................................ 48
بیروباوەڕی بەکتاشییەکان........................................ 51
بۆشایی دەسەڵات........................................ 53
ڕزگارکردنی قوستەنتنییە........................................ 56
لەپەراوێزی ڕزگارکردندا........................................ 59
پەیدابوونی دەوڵەتی سەفەوی........................................ 61
سوڵتان سەلیم یاوز........................................ 64
لەنێوان سوڵتان و شادا........................................ 66
داگیرکردنی میسر........................................ 68
گواستنەوەی جێنشینی........................................ 70
سوڵتان سولەیمانی قانوونی........................................ 72
دڵەڕاوکێی ئەورووپا........................................ 74
داگیرکردنی بەغدا........................................ 75
داستانی گۆڕی ئەبو حەنیفە........................................ 79




### بەشی دووەم


دەوڵەتی سەفەوی و شیعەگەری........................................ 81
دامەزرێنەری دەوڵەت........................................ 82
ئامرازەکانی بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکە........................................ 84
شێخ عەلی کورکی........................................ 87
کێشمەکێشی نێوان کورکی و قوتەیفی........................................ 89
کۆچ لەجەبەل عامیلەوە........................................ 93
شاعەبباسی گەورە........................................ 95
هەوڵەکانی عەبباس بۆئاوەدانکردنەوە........................................ 97
داگیرکردنی بەغدا........................................ 101
شێخ بەهایی........................................ 104
تیۆری بەهایی لەمەعریفەدا........................................ 107
محەممەد باقیری مەجلیسی........................................ 110


### بەشی سێیەم


سەردەمی عوسمانی لەقۆناغی دووەمدا........................................ 113
سوڵتان موورادی چوارەم........................................ 115
گێڕانەوەی بەغدا........................................ 117
قۆرتەکانی داگیرکردن........................................ 119
تۆپی ئەبو خوزامە........................................ 122
گەنج عوسمان........................................ 125

ئاشتیی نێوان دوو دەوڵەتەکە ... 127
تێکشکان لەعیراقدا ... 130
یەکێتیی تیرەکان ... 133
کۆچی شەممەرو عەنزە ... 135
والیی ستەمکار ... 136
پەیمانی مەزن ... 140

## بەشی چوارەم

هەرەسهێنانی دەوڵەتی سەفەوی ... 142
میر وەیس ... 143
میر مەحموود ... 145
دەنگدانەوەی رووداوەکان لەبەغدا ... 147
ئەحمەد پاشا ... 151
کێشەی عوسمانی و ئەفغانی ... 153
شەڕی سەرسووڕهێنەر ... 155
پەیدابوونی نادر قولی ... 157
گەمارۆی بەغدا ... 160
ئاکامی دان بەخۆدا گرتنەکە ... 163
گەڕانەوەی شکست خواردوو ... 165
تەمێکردنی خێڵەکان ... 166
شۆڕشی سەعدوون ... 168



## بەشی پێنجەم

نادر قولی و پرۆسەی مەزهەبی پێنجەم ... 169
سەرەتای هەوڵەکە ... 169
مەزهەبی پێنجەم ... 172
نادر قولی هیند داگیر دەکات ... 174
گەڕانەوە بۆپرۆسەی لێکنزیککردنەوە ... 176
زاخاودانی مەزاری عەلی ... 178
نسکۆی نادر شا ... 180
داگیرکردنی عیراق بۆجاری سێیەم ... 182
گەمارۆی مووسڵ ... 184
رۆیشتنی نادر بۆنەجەف ... 186
کۆنگرەی نەجەف ... 188
بڕیارەکانی کۆنگرە ... 191
تێبینییەکی کۆمەڵایەتی ... 193
ویستی دەسەڵاتدار ... 196
خۆشحاڵیی نادر شا ... 198
بەڵگەکان لەناخەوە ... 200
چارەنووسی حائیری ... 203
دوا هەواڵ ... 205

ئاژاوە لەئێراندا.................................................209
کەریم خانو قاجارییەکان........................................212
شەڕەقەڵەم.......................................................213

## بەشی شەشەم

سەردەمی مەمالیك لەعیراقدا......................................215
قۆناغی یەکەم....................................................215
تێڕوانینێکی گشتی................................................217
شەڕەگەڕەك.......................................................219
مەمالیكو لادانی سێکسی..........................................220
سولەیمان(ئەبو لەیلە)...........................................222
عەلیو عومەر.....................................................225
شۆڕشی خێڵەکان..................................................228
تێکچوونی دۆخەکە................................................231
کێشمەکێش لەئێراندا.............................................232
کوشتنی عومەر پاشا..............................................234
ڕەشبگیری.......................................................237
محەممەدی عەجەمی...............................................238
شەڕەگەڕەك.......................................................241
سەردەمی حەسەن پاشا کەرکووکلی.................................244



## بەشی حەوتەم

سولەیمانی گەورەو سەرهەڵدانی بزاڤی وەهابی.......................246
تۆکمەکردنی بنەماکانی دەسەڵات..................................248
قاتوقڕی لەبەغدا................................................249
سولەیمان شاوی..................................................251
شاویی شۆڕشگێڕ..................................................254
پەیدابوونی بزاڤی وەهابی........................................258
هاوپەیمانی لەگەڵ ئیبن سعوود...................................261
لەنێوان باشو خراپدا............................................263
کاریگەریی بزاڤەکە لەعیراقدا....................................266
سەرەتای دوژمنایەتی لەگەڵ دەوڵەتدا..............................268
شەڕی ئەحسا.....................................................270
دووبارەبوونەوەی کێشەکە.........................................273
تاعوونو ڕووداوی کەربەلا........................................275
باسی ڕووداوەکە بەدرێژی.........................................277
پەلاماردانی نەجەف...............................................278
کاریگەریی ڕووداوەکە لەسەر شیعر................................280
کاریگەریی ڕووداوەکە لەسەر ئێران...............................282

داگیرکردنی حیجاز.......... 283
ڕێژەی کۆمەڵایەتی.......... 285

### بەشی هەشتەم

مەمالیك لەدوای سولەیمانی گەورە.......... 287
مشتومڕ لەسەر جێنشینی.......... 287
لایەنی مەزهەبی.......... 294
هاتنەوەی وەهابییەکان.......... 297
پەلاماردانی نەجەف.......... 300
کوژرانی عەلی پاشا.......... 301
والیی نوێ.......... 304
پەلاماردانی حاڵەت ئەفەندی.......... 308
شەڕەکانی بەغدا.......... 310
کوژرانی سولەیمان پاشا.......... 311
ئاژاوەیەکی دیکە.......... 312
پەلاماردانی وەهابییەکان.......... 314
کوژرانی توتنچی.......... 315
سەعید پاشا.......... 317
هەڵگەڕانەوەی خێڵەکان.......... 319
ڕێورەسمی ڕەتبوونی سەعید پاشا.......... 320
لابردنی داود ئاغا.......... 322



شێوانی بارودۆخەکە.......... 325
داود فرمانی پێدەگات.......... 327
لێکدانەوەکەی ئیبن سەنەد.......... 329
کوژرانی سەعید پاشا.......... 330

### بەشی نۆیەم

داود پاشا.......... 335
پەروەردەبوونی داود پاشا.......... 335
پەیوەندیی بەخێزانەکەیەوە.......... 338
کێشەی خێڵەکان.......... 339
کێشە لەگەڵ ئێراندا.......... 342
شۆڕشێکی خێڵەکیی دیکە.......... 345
کێشەی عەبباس حەداد.......... 347
شادیی سەرکەوتن.......... 349
ناکۆکی لەگەڵ میستەر ریچدا.......... 351
نەخۆشیی کولێرا.......... 355
پەلاماردانی لەلایەن ئێرانەوە.......... 357
مسیۆ دیڤۆ.......... 361
لاساییکردنەوەی محەممەد عەلی.......... 363
بینینەکانی گەڕیدەیەك.......... 365
راکێشانی زانایان و نووسەران.......... 367

لایەنەکەی دیکە ........ 369
پووختەیەکی کۆمەڵایەتی ........ 372
چارەنووس ........ 374


### بەشی دەیەم


کۆتایی ئینکشارییەکان و مەمالیك ........ 376
لەرووداوەکانی ململانێکە ........ 378
سوڵتان مەحموودی دووەم ........ 380
لەناوبردنی ئینکشارییەکان ........ 382
لێدانی ڕێبازی بەکتاشی ........ 384
چارەنووسیان لەعیراقدا ........ 385
سەرەتای کێشمەکێش لەگەڵ داود پاشادا ........ 387
دەنگدانەوەی کوشتنەکە ........ 389
تاعوون لەبەغدا ........ 391
بینینەکانی گرۆفز ........ 394
دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ........ 396
لەبیرەوەرییەکانی سولەیمان فایەق ........ 397
بەغدا ملکەچیی خۆی رادەگەیەنێت ........ 401
گۆڕانکارییەکی سەیر ........ 403
بەرنگاربوونەوەی خەڵکی بەغدا ........ 405
قەتڵوعامی مەمالیك ........ 407





رایەك بۆقسە لەسەرکردن ........ 409


### پاشکۆکان


پاشکۆی یەکەم ........ 414
گۆڕان و ناکۆکیی کۆمەڵایەتی ........ 414
سەرەتای گۆڕانکاری لەعیراقدا ........ 415
نەگونجاویی کۆمەڵایەتی ........ 417
نەگونجاویی ماف و ئەرك ........ 419
نەگونجاویی قوتابخانەو ئەرك ........ 422
نەگونجاویی ژن و پیاو ........ 424
نەگونجاویی ئایین و نەوەی نوێ ........ 427


### پاشکۆی دووەم


سێ گریمانەکە ........ 431
ململانێی سارانشینی و شارستانی ........ 432
ناکۆکیی کۆمەڵایەتی ........ 435
دووفاقیی کەسایەتی ........ 437
دووفاقیی و دیاردەی واسیتە ........ 439
هەڵەیەکی باو ........ 442
مۆراڵ و نیارە سێکسییەکان ........ 444

## پاشكۆی سێیەم

شیعرو شارستانی......446
شاعیرە دەربارەكان......448
پێگەی شاعیران......449
شیعرو بابەتمەندی......450
راپەڕینی سەدەی رابردوو......453
لەنێوان شێوەو ناوەڕۆكدا......455
شەڕی نوێ......457
كۆمەڵگەی عیراقی و عەرەبی......460
پێڕست......



## زنجیرەی بڵاوكراوەكانی خانەی وەرگێڕان لە ساڵی 2004

| ناوی كتێب | زمان | نووسەر | بابەت | ساڵی دەرچوون | وەرگێر |
|---|---|---|---|---|---|
| شانۆ لە چەند وتارێكدا | عەرەبی | عەونی كەڕومی | شانۆیی | 2004 | پەروەر نەجمەدین |
| ستراتیژیی سەربازیی | فارسی | ریچارد كاگلەر | سیاسی | 2004 | دلێر میرزا |
| نامەیەك دەربارەی لێكبوردن | فارسی | جۆن لۆك | فەلسەفی | 2004 | شۆڕش جوانڕۆیی- فەرشید شەریفی |
| مەولاناخلیدو تەریقەتی نەقشبەندی | فارسی | سەید طاهر هاشمی | فیكری | 2004 | دلێر میرزا |
| سێ شانۆ نامە | عەرەبی | جان كۆكتۆ ئۆین ج. ئارنۆ میشێل دی. ئۆنامۆنۆ | شانۆی | 2004 | هەورامان قانع |
| را پۆرتی برۆدی | فارسی/ عەرەبی | خۆرخە لویس بۆرخس | چیرۆك | 2004 | یاسین عومەر |
| بیرەوەرییەكانی هەڵەبجە | كوردی | بەكر حەمە صدیق | مێژووی | 2004 | بەكرحمە صدیق/ كورد[illegible] دلێرمیراز/ فارسی م. حسن عبدالكریم/ عەر[illegible] فوئاد تاهیر/ ئینگلیزی |
| رەهەندەكانی ناسیۆنالیزم | فارسی | كۆمەلێ نووسەر | نەتەوەیی | 2004 | ئارام جمال |
| ریفراندۆم باشترین شێوازی خەباتە | سویدییەوە | تۆم گولبێری | سیاسی | 2004 | ئیدریس ئیبراهیم |
| شانۆی پانتۆمایم | عەرەبی | بورهان قەرەداخی | شانۆی | 2004 | بورهان قەرەداخی |
| گوڵەزەر | عەرەبی | جەنگیز ئیمتاتۆف | رۆمان | 2004 | جەوهەر كرماج |
| پاژنەی ئاسنین | عەرەبی | جاك لەندەن | رۆمان | 2004 | كەمال غەمبار |
| خەناوكەیەك بۆ سەر میناز | فارسی | ئەحمەدخان ئەبوبەكر | رۆمان | 2004 | ئەبوبەكر خۆشناو |
| ئەندامێكی میت | توركی | محەمەد ئەیمور | سیاسی | 2004 | ئارام عەلی عەزیز |
| كورتترین رێگەی سەركەوتن | فارسی | رۆبیرت ئۆریلی | دروننناسی | 2004 | سالار عەبدلرەحمان |
| كۆماری مهاباد | كوردی | عەبدوڵلا ئەحمەد رەسول | مێژوویی | 2004 | سەلمان عەلی |
| چوار وتاری شیشرۆن | فارسی | رحمەت اللە مقدم مراغەی | فەلسەفی | 2004 | شۆڕش جوانڕۆی- كامل ئەحمەد بەگ |
| جوغزە گەچینە | عەرەبی | برێخت | شانۆ | 2004 | عومەر عەلی ئەمین |
| نیوەكەی تری جیهان | عەرەبی | چەند نووسەرێكی بیانی | چیرۆك | 2004 | نوری سەعید قادر |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| مافەکانی ژن لەدەتپێکەوە | فارسی | نای بن سەعدون | رۆشنبیری | 2004 | کارزان محەمەد |
| بەناو ئیسلامەکان | عەرەبی | د.رەفعت ئەلسەعید | فیکرییە | 2004 | حەسەن عبدالکریم |
| سەرچاوەکانی زانیو نەزانی | فارسی | کارل پۆپەر | فیکرییە | 2004 | ناسر سەلاحی |
| دەوڵەتو کۆمەڵگەی مەدەنی | فارسی | ئەنتۆنیۆ گرامشی | فیکرییە | 2004 | مامەند |
| کاریگەریی هەڵچوون | عەرەبی | هیمداد مەجید عەلی | یاساییە | 2004 | دلێر میرزا |
| خاکەکە ماچ کە | ئینگلیزی | ئەلیزابیث لایارد | رۆمان | 2004 | عەزیز گەردی |
| ئازارەکانی هونەرمەندێك | عەرەبی | یوسف رانسیس | هونەرییە | 2004 | ئاری بابان |
| جینۆساید لە عێراقدا | ئینگلیزییەوە | میدڵ ئیست ووچ | سیاسی‌یە | 2004 | محەمەد حەمەساڵح تۆفیق |
| لۆکاچ | فارسییەوە | ئیمری جورج | فیکرییە | 2004 | مەنسوری تەیفووری |
| ئەلفو بێ کوانتەم | ئینگلیزی | ف. ریدنیك | فیزیایی | 2004 | د. بایەزید حسن عبدالله |
| قبور غیر هادئە | ئینگلیزی | هیومان رایتس | دمافی مرۆڤ | 2004 | محمد حمە صالح توفیق |
| هونەری جەنگ | عەرەبی | سۆن- تزو | عەسکەریی | 2004 | رئووف حەسەن |
| لەنێو دڵی شانۆدا | | | شانۆیی | 2004 | مەحمود زامدار |
| یەکبوونی قەومی کوردو ماد | فارسی | حەبیبوڵلای تابانی | فارسی | 2004 | جەلیل گادانی |
| گۆڕینی رژێم | ئینگلیزی | کریستۆفەر هیچنس | مافی مرۆڤ | 2004 | محمد حمە ساڵح |
| ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی | ئینگلیزی | نادر ئینتیسار | نەتەوایەتی | 2004 | عەتا قەرەداخی |
| ئەخلاقی رۆژنامەگەریی | عەرەبی | د. حسن عماد مکاوی | لێکۆڵینەوە | 2004 | مەم بورهان قانع |
| کۆمۆنیزمی ئەوروپایی | ئەڵمانی | ڤۆلگانگ لیۆنهارد | سیاسی | 2004 | د. کوردۆ عەلی |
| رێنیسانس | عەرەبی | د.کمال مەزهەر | لێکۆڵینەوە | 2004 | فوئاد مجید میسری |
| ژنانە یاری بکەو پیاوانە بیبەرەوە | فارسی | گیل ئیڤانس | دەورنناسی | 2004 | شەیدا سەلاح |
| عیراقو بەردەوامی قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەراست | ئینگلیزی | د. ئەوانو. ئەندرسن د. خەلیل. ه. رەشیدیان | سیاسی | 2004 | فوئادی تاهیر سادق |
| ئاسیا لەبەرامبەر خۆرئاوادا | فارسی | داریوشی شایگان | فکری | 2004 | شۆڕش جوانڕۆیی- مامەند رۆژە |
| بەفر | فارسی | ماکێنس فێرمین | رۆمان | 2004 | ئازاد بەرزنجی |
| شانۆگەری تارماییەکان | ئینگلیزی | هێنریك ئبسن | شانۆگەری | 2004 | عەتا قەرەداخی |